# سێ بڕا

**کۆکردنەوە: ئەحمەد قادر خدر**

**گێڕانەوە : ڕەسـول شـایەر**

هەبوو نەبوو، کەس لەخوا گەورەتر نەبوو، سێ برا هەبوون لەگەڵ پیرە دایکەکیان لە گوندێك دەژیان ، کوڕەکان گەورە ببوون و کاتی ژن هێنان نزیك بوو ، ڕۆژێکیان دایکیان پێی گۆتن: کوڕم ئیدی گەورە بووینە و دەبێ ژن بێنن بۆ ئەو مەبەستە کوڕەکان شەو و ڕۆژ کاریان دەکرد، تووشی هەموو جۆرە گیرو گرفتێکی ژیان بوونە، بۆیە فێری زۆر تاقیکردنەوەی ژیان بوون، تاکو بڕێك پارەیان کۆ کردەوە بۆ ئەوەی ژنی بۆ خۆیان پێ بێنن ، ڕۆژێك ژنێکیان دیتەوە برایەکیان گەڕایەوە ماڵەوە و بە دایکی گۆت: دایە ژنێکمان دیتەوە ئەگەر مارەمان کرد ئەوا یەکێکمان دەگەڕێینەوە و ئامانەتیەکەمان بدێ، دزێکیش لە پەنا دیواری هەستی خۆی ڕاگرت بوو و گوێی لە قسەکان دەبێ، دوای ئەوەی کوڕەکە دەڕوا و دزەکەش دوایی بەرگی خۆی دەگۆڕی و وەکی بەرگی کوڕەکان لە دەرگای ماڵی سێ برایەکە دەدا و گۆتییە پیرەژنەکە دایە گیان ئامانەتیەکەم نادەیێ ، ئەویش دەڵێ: بە چاوان ئامانەتیەکەی لۆ دێنی و دەڵێ: ها کوڕم ئەوە ئامانەتیەکەیە .

پاشان یەك کوڕەکانی دێتەوە ماڵەوە، دەڵێ: دایە کا ئامانەتیەکەمان نادەیێ، دایکە دەڵێ: کوڕم چەند جار ئێوە بۆ ئامانەتیەکە دێنەوە ئەدی نەتان برد. کوڕەکە عاقڵ دەبێ بۆیە یەکسەر دەزانێ کە یەکێك پارەکەی بردووە، کوڕەکە براکانی دەینی و دێنەوە ماڵەوە، دەڵێ: دایە کێ ئامانەتیەکەی لێ وەرگرتی.

دایکیان دەڵێ: بە ئاقرم فێسەکی لەسەری بوو و لە ملیشی هەمبانە بوو یەك لە کوڕەکانی دەڵێ: لەسەری فێس بی و لە ملیشی هەمبانە بی، مادام ماڵیشیان لە هەمەدانە .

ئەوی کەیان دەڵێ: لەسەری فێس بی و لە ملیشی هەمبانە بی و ماڵێشیان لە هەمەدان بێ ، مادەم ژنەکەی ناوی گور خەندانە .

ئەوی کەیان لەسەری فێس بی و لە ملیشی هەمبانە بی و ماڵیشیان لە هەمەدان بی و ژنەکەی ناوی گورخەندان بی، مادەم دایکیشی ناوی پور ڕەندانە .

**ئەوی کەیان دەڵێ: مادەم لەسەری فێس بی و لە ملی هەمبان بی و ماڵیشیان لە هەمەدان بی و ژنەکەی ناوی گورخەندان بی و دایکیشی ناوی پور ڕەندان بی، مادەم خانیەکەشیان لەسەر نۆ کاریتانە. ئەوی کەشیان دەڵێ: مادەم لەسەری فێس بی و لە ملی هەمبانە بی و ماڵیان لە هەمەدان بی و ژنەکەی ناوی گورخەندان بی و دایکیشی ناوی پور ڕەندان بی، مادەم خانیەکەشیان لەسەر نۆ کاریتان بێ، کەوا بوو پارەکەش لە ئاخوڕێ گایانە .**

**پاشان هەڵدەستن و بەرەو هەمەدان دەکەونە ڕێ ئەوجە دەچنە سەرو گێلاکی کابرای دزو پارەکەی لە ئاخوڕێ گایان دەردەهێنن کابرای دزیش لەکن پاشای شکاتیان لێ دەکات ، کابرا دەڵێ: ئەوانە دزن هاتینە پارەیان لێ دزیمە.**

**سێ برایەکانیش دەڵێ: ئەمە (حارفە) ینە ، پاشا دەڵێ: بیانگرن ئەوانە شێتن ، دیسان براکان دوو بارەی دەکەنەوە دەڵێن ئەمە (حارفە)ینە، ئەوجا پاشا دەڵێ: بڕۆن پاسەوانەکان سێوەك و لیمۆیەکم لۆ بینن دەڵێ: یەکێ لە براکان بانگ کەن بە تەنیا بێتە ژووری، پاشا سێوەکە و لیمۆکەی لەبن فەرشی ژوورەکە دادەنێ پێیان دەڵێ:: ئەگەر زانیتان ئەوانە چینە لەبن ئەو فەرشە ئەوا ئازادتان دەکەم ، برای یەکەم دێتە ژووری دەڵێ: هۆ (و)**

**ئەوی تریشیان دێتە ژوورەوە دەڵێ: ترشە وەکو دۆ.**

**ئەوی تریشیان دێتە ژووری و دەڵێ: یەك نارنجە و یەك لیمۆ . ئەوجە پاشا دەڵێ: ئەو کابرایە بگرن و ئەوانەش پارەکەیان بدەنەوە و تا ماڵەوە ڕەوانەیان بکەنەوە ، ئەمنیش گەڕامەوە و کەوشم دڕاو هیچم پێ نەبڕا .**

***ئەم حەکایەتە حەکایەتی وردبینی و حیکمەتەو زانینی شتی نەزانراو، و نە ناسراوی تێدایە، کە دەکرێ لە واقیعدا روبداو لە ئەفسانەشدا هەیە، ئەگەر ئەم غەیب زانینە ڕەگەزێکی ئەفسانەبێ، ئەوا ڕەگەزێکی لاوازە.**

---

[1] حارفە واتە زانای پێشان .

# نەرمۆڵ

**کۆکردنەوە: ئەحمەد قادر خدر**

**گێڕانەوە: ڕەسول شایەر**

**هەبوو نەبوو، شوانێك هەبوو، لە دەشتێکی کاکی بە کاکی کە گوندێکی خنجیلانەی لێ بوو دەژیا، شوانەکە هەموو ڕۆژێ مەڕو بزنەکانی دەبردنە دەشت بۆ لەوەڕاندنیان، ڕۆژێکیان مەڕەکانی دەبردنە ئەو دیوی ڕووبارێکی گچکە، هەموو مەڕەکان و بزنەکان لە ئاوەکەی ڕووبارەکە دەپەڕنەوە تەنیا بەرخۆڵەیەك نەبێ ، شوانەکەش ئەم بەرخۆڵەی لە هەموو ئەوانی تر زیاتر خۆشی دەویست هەر لەبەر ئەمە بوو ناوی لێنابوو (نەرمۆڵ) . شوانەکە دەڵێتە بەرخەکە نەرمۆڵ بپەڕەوە نەرمۆڵ دەڵێ: ناپەڕمەوە. دیسان دەڵێ: بپەڕەوە دەڵێ: ناپەڕمەوە، شوانەکە دەڵێ: دوایی گاسی قەسابی دەکەم بێ سەرت بڕی دەڵێ: بڕۆ دەچێتە لای قەسابی دەڵێ: قەساب وەرە نەرمۆڵی سەر بڕە دەڵێ: نایێم. دەڵێ: دوایێ گاسی ئاسنگەری بکەم دێ چەقۆت لێ بشکێنێ دەڵێ: بڕۆ دەڵێ: ئاسنگەر وەرە چەقۆی لە قەساب بشکێنە. دەڵێ: نایێم، دەڵێ: دوایی گاسی ئاوی بکەم دێ ئاگرت لێ دەکوژێنێتەوە ، دەڵێ: بڕۆ ، دەچێتە لای ئاو دەڵێ: ئاو وەرە ئاگری لە ئاسنگەری بکوژێنەوە دەڵێ: نایەم دەڵێ: دوایێ گاسی حوشتری بکەم دێ دەتخواتەوە. دەڵێ: بڕۆ، دەڵێ: حوشتر وەرە ئاوی بخۆوە. دەڵێ: نایەم، دەڵێ: دوایێ گاسی گوریس بکەم دێ دەتخنکێنێ. دەڵێ: بڕۆ نایەم، دەچێتە لای گوریس دەڵێ: گوریس وەرە حوشتری بخنکێنە. دەڵێ: نایەم دەڵێ: دوایێ گاسی مشکی بکەم دێ بتپسێنێ. دەڵێ: بڕۆ نایەم دەڵێ: مشك وەرە گوریسی بپسێنە. دەڵێ: نایەم. دەڵێ: دوایی گاسی پشیلەی کەم دێ دەتخوا. دەڵێ: بڕۆ ، دەچێتە کن پشیلەو دەڵێ: پشیلە وەرە مشکی بخۆ، دەڵێ: ها ... چی مشك لە کێیە دەڵێ: لە فلاَن شوێنە. ئەوجە پشیلە دەچی مشکی بخوا مشك دەچی گوریسی بپسێنی گوریس دەچی**

**حوشتری بخنکێنی، حوشتر دەچی ئاو بخواتەوە و ئاودەچی ئاگری لە ئاسنگەری بکوژێنیتەوە، ئاسنگەر دەچی چەقۆی لە قەساب بشکێنیٚ، قەساب دەچی نەرمۆڵە سەر بڕی (نەرمۆڵە)یش لە ئاوەکە دەپەڕێتەوە ، شوانەکەش دەگەڕێتەوە لای مێگەلی حەیوانەکانی ، کەیف خۆش دەبی .**

***حەکایەتی گیاندارانە و ئەو پەیوەندییە بنەڕەتیە پیشان دەدا کە لە نێوان کەس و شتەکاندا هەیە.**

# ئازادبوونی توتیەکە

**کۆکردنەوە: بەفرین سمایل سادق**
**گێڕانەوەی : مەلا عومەر یونـس**

وا دەگێڕنەوە کابرایەك توتیەکی گرتبوو شەو و ڕۆژ لەناو قەفەس بەندی کردبوو وا ڕێك کەوت کابرا سەفەری کرد بۆ هندستان، بۆ توجارەت، بە توتی وت: ئەرێ توتی ئەگەر لەم سەفەرە گەڕامەوە چیت بۆ بێنم توتی لەوەلاّم دا وتی: ولاّتی هندستان توتی زۆرە لە هەر جێگایەك گەیشتیە کۆمەڵە توتی سەلامی منی پێ ڕا بگەیەنە و پێیان بڵێ توتیەکم هەیە لەناو قەفەس بەندە سەلامی لە ئێوە دەکرد و دەیگوت: پێیان بڵێ ئێوە ئازادن و منیش ئەسیرم بۆ ڕزگارم ناکەن لە ئەنجام دا کابرا سەفەری کرد گەیشتە هندستان لەکاتێکدا چاوی بە ڕەوە توتیەك کەوت وا لەسەر دارێك نیشتونە سەلامەکەی بەبیر هاتەوە لێیان چوە پێشەوە و وتی: ئەی توتینە من توتیەکم هەیە سەلامی لە ئێوە دەکرد و وتی: پێیان بڵێ: من ئەسیری قەفەزم و ئەوانیش ئازادن بۆ ڕزگارم ناکەن هەر هەندەی وت دیتی توتیەکان یەکە بە یەکە لە دارەکە بەر دەبونەوە و دەمردن کابرا چو سەیری کەلەشەکانی کردو دەستی دایە یەکە یەکە هەر هەموی مردون بەو شتە زۆر ناڕەحەت بوو.

پاشان لەسەفەر گەڕاوە هاتەوە ماڵەوە توتیەکەی خۆی پێی وت: بەخێر بێیتەوە گەورەم سەلامی منت بەجێ گەیاند کابرا وتی: والله توتی کەسەلامەکەتم بە توتیان ڕاگەیاند ڕوداوەکم دیت زۆر ناڕەحەت بووم خۆزیا سەلامەکەم پێ ڕانەگەیاندبانە توتی لە وەلاّمدا وتی: چیت دیت؟ کابرا وتی: هەرکە هەواڵەکەی تۆم پێ ڕاگەیاندن یەکسەر یەك لەدوایی یەك ئەو توتیانەی لەسەر دارەکە بوون هەر هەمویان بەربونەوە سەر زەوی و مردن کە توتی گوێی لەوتەکە بو یەکسەر لەناو قەفەزەکە دا مرد. کابرا سەیری کرد لەگەڵ هەواڵەکە

**توتیەکەی خۆشی مرد هەندەی دی ناڕەحەت بوو دەرگای قەفەزەکەی کردەوە و توتیەکەی دانا سەر زەوی. توتیەکە لەشەقەی باڵی داو فری. کابرا وتی: ئەی توتی سەرم سوڕما لە مردنی ئێوە، چیبو؟ توتیەکە وتی: ئەو توتیانە ڕێگای ئازادیان نیشان دام کە خۆم بکەم بە مردو تا تۆ لەقەفەز دەرم بێنی و لە شەقەی باڵ دەم بفڕم .**

***ئەمە چیرۆکی گیاندارانە .**

# خوا بۆی ناردووم

وا دەگێڕنەوە: لەسەر دەمی داود پێغەمبەر کوڕە گەنجێك هەبووە لەگەڵ دایکێکی بە تەمەن کوڕە گەنجەکە زۆر بەدین بوو، بەزۆری هەریادی خوای دەکرد ڕۆژێك دایکی پێی وت: ڕۆڵە بۆ کارێك ناکەی هەر لەماڵەوەی؟ وتی: دایە گیان لەمەو پاش کاردەکەم، بەلاَم هیچ کارێکی نەکرد بۆ ماڵەوە دوبارە دایکی پرسیاری لێ کرد: ڕۆڵە گیان هیچ کارێکت نەدۆزیتەوە وتی: دایە داوا لەخوا دەکەم و هەردەم لێی دەپاڕێمەوە کە ماڵ و سامانێکی زۆرم بداتێ بەبێ ماندووبون ئەو کوڕە هەردەم ئەو داوایەی دوبارە دەکردەوە دەیگوت: خوایە سامانێکی زۆر و بەبێ ماندووبوونم بدەیتێ. وارێکەوت ڕۆژێکیان پاش نیوەڕۆ بوو (گۆلکەك)هاتە ناو ماڵەکەی وتی:دایە گیان ئەم چەقۆیەم بۆ بێنە خودارزقی ئەم ڕۆژەی بۆ هەناردوم دایکی وتی: ڕۆڵە چۆن وا دەبێ؟ وتی : بڵێ دەبێ چونکە ئەوە چەند ڕۆژە من لەبەر خوا دەپاڕێمەوە کە سامانێکم بداتێ بەبێ ماندوبون لە ئەنجامدا (گۆلکەکەی)کوشتەوەو خواردی خاوەنی گۆلکەکە بەدوایی گەڕا تا هاتە ماڵی ئەم کوڕە وتی: ئەمە گۆلکی منە و ئەتۆ دزیت بۆ چ کوشتیتەوەو دەنگت نەکردیە؟ کوڕە گەنجەکە وتی: باوکە من دزنیم بەڵکو ئەمە رزقی منە خوا بۆی ڕەوانە کردووم چونکە دەمێکە داوای لێدەکەم ڕزقێکی بەبێ ماندووبوونم بداتێ، خاوەن گۆلکەکە کردیە هەڵلاو گارەگار وتی: سەیرە گۆلکی منی بردیە دەڵێ: خوا بۆی ناردوم خاوەن (گۆلك)هەستا ڕۆی بۆ دادگا شکایەتی لە گەنجەکە کرد لەو سەردەمە پێغەمبەر(داود)حاکم بوو بەدوای گەنجەکەیان نارد وەرە بۆ دادگا گەنجەکە هات و ڕاوەستا پرسیاریان لێکرد ئایە ڕاستە ئەتو گۆلکی ئەو پیاوەت هاتیتە ماڵەوە کوشتیتەوە و خواردیتت لە وەلاَمدا فەرمووی: بەڵێ من گۆلکەکەم کوشتەوە و خواردم بەلاَم گەورەم ئەم گۆلکەیە هی خۆم بوو چونکە داوام لە خوا کرد زۆر جاران خوا دوعاکەی قەبوڵ کردم دەم وت: خوایە سامانێکم

بدەیتیٚ بەبیٚ ماندووبوون ئەوەبو لە ئەنجام دا خوا بۆی ناردوم حاکم سیٚ جاران پرسیارەکەی لیٚ دوبارە دەکردەوە دەی وت: پیٚم بلٚیٚ بزانم ڕاستە ئەو گۆلکەت کوشتەوەو خواردت. لە وەلاٚمدا گەنجەکە دەی وت: حاکم خۆشبی خوا بۆی ڕەوانە کردووم هی خۆم بوو (داود)پیٚغەمبەر فەرموو: بەخاوەن گۆلك (مەحکەمەکە)بەیانی تەواو دەکەین پیٚویست بە لیٚکۆلیٚنەوە هەیە کە شەو داهات (داود)پیٚغەمبەر لەخوا زۆر پاڕاوە یاڕەبی ئەتۆ بیٚ ئاگاداری ئەم گەنجە هەر دەلیٚ: خوابۆی ناردووم ئەگەر وایە پیٚم نیشان بدەیت خوا پیٚی نیشاندا کە ئەو گۆلکە هی گەنجەکەیە بە تەواوی خوا بە (داود)پیٚغەمبەری وت: کە چۆن ئەو گۆلکە هی گەنجەکەیە بۆ بەیانی مەحکەمە دانیشت خاوەن گۆلك و گەنجەکە هاتنەوە مەحکەمە (داود)پیٚغەمبەر وتی: بەخاوەن گۆلك من وای بەباش دەزانم واز لەو گۆلکە بیٚنە بابۆ ئەو گەنجە بیٚ بۆ تۆ وا باشترە خاوەن گۆلك کردیە هات و هاوار وتی : خەلٚکینە سەیر کەن (داود)پیٚغەمبەر بە ناڕەوای مالٚی دەداتە ئەو گەنجە ئەوە چ حوکمیٚکە دەیکات خەلٚکەکە هەموو وتیان: هەقی خاوەن گۆلکە ئەوانەی لەو جیٚگایە ئامادەبوون وتیان: (داود)پیٚغەمبەر مالٚی ئەو کابرایە چۆن دەبیٚتە مالٚی ئەو گەنجە پیٚغەمبەر (داود)دووبارە فەرمووی: ئەی کابرای خاوەن گۆلك بۆ تۆ وا باشترە گۆلکەکە با بۆ ئەو کوڕە گەنجە بیٚ کابرای خاوەن گۆلك وتی: من بەوە ڕازی نابم بلٚیٚی وا بۆ تۆ باشترە و دەنگ مەکە بامەحکەمە قرار بدات چی فەرمو من پیٚ ڕازی دەبم (داود)پیٚغەمبەر فەرموی : کوڕە کابرا باش بزانە هەر قراریٚك دوای مەحکەمە بدریٚ ڕەت بونەوەی نیە کابرای خاوەن گۆلك وتی : زۆر باشە من ڕازیم (داود)پیٚغەمبەر فەرموی :کەواتە ئەو حوکمە لیٚرە ناکەم بەیانی حازر بن دەچینە دەرەوەی ئاوایی بەیانی پیٚغەمبەر (داود)و خەلٚك لە ئاوایی دەرچون بۆ دەرەوە بزانن چ ڕوو دەدات ئەوەبوو لە نیوەی ڕیٚگا کابرای خاوەن گۆلك وتی :یا(داود)بۆ حوکمەکە لیٚرە نەکەین بۆ کویٚ دەچین پیٚغەمبەر (داود)فەرموی: لیٚرە نابیٚ با بڕۆین تا دەگەینە سەر ڕووبار لەویٚ مەحکەمە دەکەین کابری خاوەن گۆلك وتی: من لە حەقی خۆم خۆش بووم با بگەڕیٚینەوە (داود) پیٚغەمبەر فەرموی: تازە قرار درا گەڕانەوە نیە تا مەحکەمە نەکەین ڕۆیشتن تا

**گەیشتینە سەر ڕووبار بنەدارەکی گەورە لە وێندەر بوو چوونە ژێر دارەکە دانیشتن کابرای خاوەن گۆلك ڕەنگی زەرد بوو تێکچو (داود)پێغەمبەر فەرمووی:خاوەن گۆلك با پشتی خۆی بەو دارە بدا لە پێوە ڕا بوەستێ پاشان لێی پرسی و وتی: کابرای خاوەن گۆلك بەخۆت بڵێ ئەو گۆلکەت لەکوێ بەدەست کەوت؟ وتی: ماڵی خۆمە(داود)پێغەمبەر وتی: ژێر پێی خاوەن گۆلك هەلکەنن، ئەوە بوو هەڵیان کەند، هەندێك هێسکی مردو بە دەرکەوت (داود)پێغەمبەر فەرموی: کابرا ئەو هێسکانە چییە لێرە؟ کابرا لەرزی و دەمی قەپات بوو(داود)پێغەمبەر فەرموی: لەکاتی خۆی ئەو خاوەن گۆلکە بابی ئەو گەنجەی کوشتووە و لێرە لەژێر خاکی ناو، ماڵی بابی ئەو گەنجەی هەموو بۆ خۆ برد. مەحکەمە قەراری دا کابرای خاوەن گۆلك بکوژنەوە ئەو ماڵەی کە هەیتی بیدەنەوە کوڕە گەنجەکە کابرا کوژرا و ماڵ و سامانی خاوەن گۆلك بووە ماڵی کوڕە گەنجەکە ئیتر ئەوە بوو خوا دوعای کوڕە گەنجەکەی قەبوڵ کرد بوو بەخاوەن ماڵ و سامانێکی زۆر و بێ ماندوو بوون .**

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: خودایە لەناو چیرۆکەکە، هەروەها بوونی داود پێغەمبەرەرو لێرە مەبەستێکی پەروەردەیی ئایینی هەیەو، بوونی خودا و پێغەمبەریش بۆ زیاتر پیرۆز کردنی ئایینە، بەدەقێکی ئەفسانەیی.**

# به چاوی خۆت نەیبینی بڕوا مەکە

جارێکیان کابرایەك توتیەك دەگرێ لەناو قەفەس بەندی دەکا، تا ماوەیەکی زۆر توتیەکە ڕۆژێك پێی وت: ئەگەر بەرم بدەی ئامۆژگاریەکت دەکەم، کە سودی بۆت هەبێ، کابرا وتی: باشە پێم بڵێ بەرت دەدەم توتی وتی: چۆن وا دەبێ ئێستا من ئەسیری دەستی تۆم ئازادم کە قسەت بۆ دەکەم کابرا دەرکەی قەفەزی کردەوە، توتی هاتە دەرەوە و چووە بەرامبەر کابری نیشت وتی: کابرا هەر شتێکت بە چاوی خۆت نەدیت بە قسەی خەڵك بڕوا مەکە، پێی هەڵمەخەڵەتێ کابرا وتی: باشە پاش دو دەقیقە توتی وتی: کابرا ئەوە بۆ نەتزانی من دوڕەکم لەناو سینگە بۆ نەتکوشتمەوە (دوڕ)ەکە دەربێنی، دەبویە خاوەن سامانێکی باش کابرا ئەو کاتە هەردوو دەستی خۆی لێك دا و وتی: ئەی هاوار بە ماڵم چم لەگەڵ خۆم کرد من کو ئەو توتیەم بەڕەلا کرد توتی لەو کاتە دا وتی: کابرا ئەدی من تازە ئامۆژگاریم نەکردووی تا شتێك بە چاوی خۆت نەبینی باوەڕ نەکەی، تۆ چۆن باوەڕت کرد؟ بەبێ ئەوەی هیچ شتێك ببینی جا پاشان کابرا ئارام بۆوە .

*چیرۆکە چیرۆکی گیاندارانە، هەر چەندە قسەکردنی توتی دەچێتە خانەی ئەفسانە وەك باڵندەیەك .

# پەند

**کۆکردنەوە: بەیان سلێمان ئەحمەد**

**گێڕانەوەی : هەمین عارف مەحەمەد**

کابرایەك هەبوو، وەسیەتی بۆ منداڵەکانی خۆی کرد پێی وتن: ئەگەر من مردم لەکاتی بردنم بۆ سەر قەبران دەستم لەناو تابوتەکە دەربهێنن. دوای ماوەیەکی زۆری بەسەر چوو پیاوەکە مردو مناڵەکانی وەسیەتی باوکیان بەجێ هێناو دەستی باوکیان لە تابووتەکە دەرهێنا. خەڵکەکە کە چاویان بەم کارە کەوت زۆریان پێ سەیر بوو بەڵام لەو کاتە پیاوێکی ڕیش سپی چاوی لێ بوو بە خەڵکەکەی وت ئەم پیاوە زۆر عاقڵ بووە چونکە لەو کاتەی هاتۆتە دونیاوە دەست بەتاڵ بووە کە مرد هیچ نابات لەگەڵ خۆی هەر بە دەست بەتاڵی دەڕوات تەنها کردەوە چاکەکانی خۆی لەگەڵ خۆی دەبات خەڵکەکە گوێیان لەم قسەیە بوو هەموویان ڕەحمەتیان بۆ پیاوە مردووەکە دەنارد .

***حەکایەتێکی پەند ئامێزەو ـ ئەفسانە نییە .**

# شەوە

**کۆکردنەوە: پەیمان فوئاد مەولود**
**گێڕانەوە: هەمین ئیسماعیل مەحمود**

ئەم حکایەتەم لە هەمین وەرگرتووە، کە ئەویش لە پیرێژنێکی وەرگرتووە ناوی (زرێخە)کە دەڵێت :. گۆتی ڕۆژەك ژنەك منداری دەبوو، ئەنجا مندارەکە قۆنداخە بوو، دیتی ژنەك هاتە ژۆرێ ژنەکە وەکی کرمانجەتی خۆمان بوو ژنەکە خەناوکەیەکی قەنەفری لە ملدابوو، کە هاتە ژۆرێ خەناوکەکەی بە ژۆرێ وەکرد، مندارەکانی هاتە ژۆرێ خەناوکەکەیان دیت و لێیان کردەوە یەکێك لە مندارەکان کچ بووە لە ملی خۆی کرد و گۆتی ژنەکە دەلحاز ڕاوەستەو نەڕۆی، ژنەکەی کە مندارەکەی بوو زانی ئەو ژنە شەوەیە دەرزییەکیان لە سنگی ژنە شەوەکە دا بۆ زانیاری ئەو ژنە ڕەوەند بووە ئەوجا حەوت ساران خزمەتی خۆیان پێ دەکرد، ڕۆژەك ژنەکە لەگەر مندارەکان چوە داران ، ژنەکە گۆتیە مندارەکان دەوەرن ئەو دەرزییەم لە یەقەی بکەنەوە ئەوجا ژنەکە بزر بوو هەتا هەتایە ئەم بەسەر هاتە لەلای دەشتی چیای ئاساری ڕەوەندەیە.

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: شەوەو دەرزی لە یەخەدان.**

# چیرۆکی ددان ئاسنه

**گێڕانەوە: هەمین ئیسماعیل مەحمود**

ڕۆژەك ژنەك: كوڕەك و كچەكی دەبیٚ كوڕەكە ناوی (ئەحمەد)دەبیٚ كچەكەش ناوی (ددان ئاسنەیە)واتە لەسكی داكی ددان ئاسنەیە، ئەو كچە كە گەورە دەبیٚ پیٚ دادیٚ خەڵكی گوندی هەمووی دەخوا بەس ئەحمەدی برای دەمێنیٚ، ئەحمەد هەر دەستی دەڕوا خوشكەكەی لە گوندەكە دەمێنێتەوە بەتەنیٚ ، ئەحمەد دەڕوا دەڕوا هەتا دوو تریسكە ئاگری لە دورەوە دی وەكی دەچی نزیك دەبێتەوە دەبینی سیٚ مەنجەر لەسەر ئاگریە، دەچی تێری لیٚ دەخوات وەڵاڵ دەچیتە ژۆریٚ وەكی وەها دەكا دەبینیٚ دوو دێو دانیشتینە دەچێتە ژۆریٚ سەلامی دەكا، سەلامی لیٚ وەردەگرنەوە دەڵیٚ: كوڕم بەخێر بێی دەبی ببیە كوڕی مە بۆ زانیاری هەردووكیان چاویان كۆرە دەبیٚ وەڵاڵ هەردەستی ، دێوەكان بە كوڕەكەی دەرێن، ئەمە سیٚ دوژمنمان هەیە (سۆر، ڕەش ، سپی) دەرێن خینی وامان لۆ بینی چاومان چا دەبیتەوە! وەڵاڵ كوڕە هەردەستی سبەینیٚ دەچی بلولەكی لەگەر خۆی دەبا دەچێتە ناو پاوانی دێوی سپی ، دێو بەبۆڕە بۆڕ دیٚ دەریٚ ئەوە كێیە لەناو پاوانی من؟ دەریٚ ئەوە پاوانی باب و باپیری منە وەڵاڵ دەرێن با زۆرانەیەكی بكەین وەڵاڵ هەردەستی زۆرانەی دەكەن هەتا نیوڕانیٚ ، نیوڕانی ئەحمەد نوێژی دەكا هەردەستی دیسان لێك دەدەن و دێوی سپی دەكوژی بلولەكەی پڕ خین دەكات ، دەینیتەوە لە چاوی دوو دێوەكەی دەكا ، دیسان چووە كن دوو دێوەكەی دیكە وە دێوی یەكەم خینی ئەوانیشی برد لە چاوی دوو دێوەكەی كرد ئەوجا چاویان چا بۆوە ، ئەوجە هەردەستی دەریٚ وەڵاڵ ئەمن خوشكەكم هەیە دەچم سەری لیٚ دەدەم وەڵاڵ ئەحمەد سواری ماینەكەی بو ڕۆیی وەڵاڵ وەكی چوو خوشكەكەی زۆر سلاڵوی لیٚ دەكا ئەو شەوە لەكن خوشكی دەبی ، ئەوجا ئەحمەد شەویٚ هەردەستی دەست نوێژی بشوا خوشكەكەی دەریٚ وای چەند

خۆشە قەمپارەکم لەو باسکە سپیەم بدەیێ وەڵڵاً ئەویش دەرێ باشە خوشکم دەدەمێ ، ئەوجە سبەینێ هەستا حەوت دەرکەی لەسەر خوشکی پێ وەدا ئەوجە حەوت کۆپەی پڕ مشکی کرد (ئەو خۆڵەمێشەی کە لە پاشماوەی دار دەمێنیتەوە)وەڵڵاً ئەحمەد چووە سەر بانی گۆتی خوشکم ها گۆشتم لۆ فڕەدای ئەوجا خوشکەکەی گۆرشتەکانی خوارد هەموو دەم و چاوی بووە ڕەشی و چاوی تاریك بوو ئەوجە ئەحمەد ڕۆیی، ئەوجا ددان ئاسن دەرکەکانی هەموی شکاند و چووە ئەو بەری زێی ئەویش چووە ئەو بەری زێی گۆتی: برام قوتارم کە گۆتی  خوشکم ئەو زێیە بەردەکی گەورەی تێدایە پێت لەسەر ئەو بەردە دابنێ و بپەڕەوە دێیە کنە من وەڵڵاً گۆتی: ددان ئاسنە پێی هاوێشتە ناو ئاوی مرد ئەحمەدیش گەڕاوەکن دو دێوەکەی .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە:کچی ددان ئاسن و دێو چاك بوونەوەی کوێر بە خوێنی دێوی سور و ڕەش و سپی .**

# ئەحمەد و محمد

**گێرانەوەی: ڕێزان قادر عەبدوڵڵا**

ڕۆژێك پاشایەك دەبێت، لەشەو خەون ئەبینێت لە خەویا هێلكەیەك لەسەر بزمارێك دانراوە، بەیانی لەخەو هەڵدەستیٚ، ژنەكەی و كوڕەكانی بانگ دەكات دەڵێ:. من ئەمرم ماوەیەكی پیٚ ئەچیٚ پاشایەكە ئەمری، هەردو كوڕەكە منالْن. ڕۆژێك لەناو باخ وباغان ئەگەڕێن جێگەی كۆترێك لەسەردارێك ئەبینن هەمو رۆژیٚ ئەو كۆترە هێلكەیەك دەكات و منالْەكان ئەبینن . جا منالْەكان هەمو ڕۆژێك ئەو هێلكەیە دەبەنە بازاڕ دەیفرۆشن تاجرێك هەیە. تاجیرەكە هێلكەكانی لیٚ دەكڕیٚ، و سیٚ ڕۆژێك هێلكەی بۆ دەبەن داوایان لیٚ دەكا كە جێگەی كۆترەكەیان پیٚ بلْیٚ ئەو كۆترەش پێی دەلْێن (كۆتری ئەفسوناوی) .هەرچی ئەو كۆترە ئەفسوناویە ئەوە:. هەر كەسێك كە سەری كۆترەكە بخوات بۆ بەیانی كوپەك لیرە لەبن سەریان ئەبێت. ئەوەی جگەرەكەی بخوات ئەوا پلە و پایەی بەرز ئەبێتەوە ، كۆترەكە دێننەوە مالْەوە ، ئەوجا تاجیرەكەش دێتە مالْیان حەز لە ژنی پاشا دەكات واتە دایكی دوو كوڕەكە ، جا داوا لە ژنەكە دەكات، دەلْیٚ: من ئەم شەو دێم بۆ لات بەلاْم بە مەرجێك سەری كۆترەكەم بۆ بێنی بخۆم ژنەكەش وا دەكات، مندالْەكان لە كۆلاْن دێنەوە دلْێنە كارەكەرەكەیان چیمان هەیە ، ئەویش دەلْیٚ: دایكتان كۆترەكەی سەر بڕیە وا لەسەر ئاگرە جا كوڕەكان دەچن یەكیان سەرەكەی دەخوات و ئەوی تریان جگەرەكەی دەخوات .

جا تاجیرەكە دێت بۆ لای ژنەكە، كە تاجیرەكە دێت دەلْیٚ: كوانیٚ كۆترەكە جا كۆترەكەی بۆ دێنیٚ ، پێی دەلْیٚ: كوا سەرەكەی و جگەرەكەی ئەویش دەلْیٚ: وەلْلاْ منالْەكان خواردویانە كابرا دەلْیٚ: ئەو منالْەی كەسەری خواردوە دەبیٚ سەری ببڕی و ئەوی تریشیان جگەرەكەم بۆ بێنی ، كارەكەرەكەش گوێی لیٚ دەبیٚ، جا ڕادەكا بۆ لای منالْەكان ، جا هەندێك نان و خورماین بۆ دەبات و

مەسەلەکەی بۆ منداڵەکان دەگێڕێتەوە و پێیان دەڵێ: بۆ خۆتان بڕۆن، جا دایکیان دەڵێ: کوا مناڵەکانم دەڵێ: ئەوەتا لێرەوە ڕۆیشتن بەڵام نایان بینێ چونکە کارەکەرەکەیان ڕێگای بە خەلەتی بە ژنەکە دەڵێ: مناڵەکان ئەڕۆن ئەگەنە باغێك ، ئەوەی کە جگەرەکەی خواردوە دەڵێ: برام برسیمە دەڵێ: نەختێك ڕاوەستە بزانم لەو گوندە هیچ ناهێنم بخۆیین، هەتا ئەو سەردەڕوا و ئەگەڕێتەوە دەبینی برای لەسەر دارەکە خەوی لێ کەوتوە و مارێك دێت پێ وەی دەدا لەسەر دارەکە، کە دێت براکەی لەسەر حەرز کەوتوەو لەو وایە مردوە و مارەکەش (تۆپیوە) لەسەر حەرز لە تەنیشت کوڕەکە، ئەویش هەر لەخۆی ئەدا و ئەچێتە ئەوێ دەبینێ هەرچی پیاوی گوندەکە هەیە کۆبونەتەوە ئەویش دەپرسی دەڵێ: ئەوە چییە؟ ئەوانیش دەڵێن پاشای ئەو گوندە مردوە و دەمانەوێ یەکێك هەڵبژێرین ئەوانیش بازێك هەڵدەدەنە ئاسمان بکەوێتە سەر شانی هەرچ کەسێك بنیشێ ئەوە دەبێتە پاشای ئەو گوندە، جا بازەکە لەسەر شانی کوڕەکە دەنیشێ خەڵکەکەش دەڵێن نابێ دیسان هەڵی دەدەنەوە دوبارە دەچێتە سەرشانی کوڕەکە دەنیشێ، دیسان دەڵێن: نابێ، ئەوجارە خەڵکەکە مناڵەکەی دەبەنە ناو مزگەوت دەرگای لەسەر قەپات ئەکەن هەم هەڵی دەدەن ئەوجارە بازەکە دەچێتە سەر گومەتی مزگەوت ئەوجا دەڵێن تەواو دەبێ دەڵێنە کوڕەکەی تۆ دەبی ببیە پاشا .

ئەوجا ئەحمەدی برای کە کەوتوە لەسەر حەرز دو کەس بەوێ دا دێن کە ژنەك و پیاوەکن کە شەش کچ یان هەیە کوڕیان نیە ، ئینجا کوڕەکە دەبەن و بۆ ماڵی خۆیان ، جا حەکیمێك دێنن بۆ سەری جا دەرمانی بۆ دەهێنن ، بەس دەڵێ: بە مەرجی ئەو دەرمانە لەسەر دەمی دانێن هەر کاتێك دەرمانەکە توایەوە ئەوا مایە، بەڵام. ئەگەر نەتوایەوە ئەوا نەماوە جا ئەو شەوە کچەکان بە نۆرە لەسەری دەبن لەبەرە بەری بەیانی دەبینن دەرمانەکە تواوەتەوە، جا بەیانی منداڵەکانی خەبەر دەدەنە دایك و باوکیان دەڵێن: ماوە نەمردوە کە (ئەحمەد)هەڵدەستێت دەبینیت یەك کیسە ئاڵتون لەبن سەرییەتی، دەڵێ: چەندەها ڕۆژی پێ دەچێ کوڕەکە ئاگای لەخۆی نیە کە ئەو شتە چیە لەبن سەری یان نەو. جا لێرەوە دێنە سەر براکەی تری کە (محەمد)ی ناوە کە

خەڵکی گوندەکە محمد یان کردە پاشای گوندەکە ڕۆژێك لەگەڵ دار و دەستەکەی ئەچێتە شوێنی براکەی بۆ ئەوەی بیدۆزێتەوە بەڵام هیچی لێ نەماوە جا ئەمر دەکا لەو شوێنە خانوێك دروست بکا بۆ ئەوەی خەڵك سودی لێ ببینێ. جا دێینە سەر باسی (ئەحمەد) نزیکەی یەکمانگی پێ دەچێ ئەو کوپە زێڕە لەبن سەری دوبارە دەبێتەوە بەڵام کوڕەکە نازانی، جا ماڵەکە زۆریان خۆش دەوێت .

ڕۆژێکیان کوڕەکە دەڵێ: من دەڕۆم ، وەڵڵا دەڕوات بەڵام پێش ئەوەی بڕوات ماڵەکە بە ئەحمەدی دەڵێن: کە چەند شەوە کوپە زێڕ لەبن سەری دایە جا زێڕەکەی هەموی دەدەنە پێشی دەڵێن: ئاگاداری خۆت بە .

ئینجا دەڕواتە هەمان جێگا کە لێی کەوتبوو . دەگاتە شوێنەکە دەبینی خانوێکی لێ دروست کراوە دەبینی پیاوێك و ژنێکی لێیە جا پێی دەڵێن: وەرە ژورێ بخەوە و ئەسپەکەی لێ وەر دەگرن ئینجا کاتێك دەبینن هەردولای ئەسپەکە هەمووی ئاڵتونە. ژنەکە دەڵێتە پیاوەکە با بیکوژین ئینجا لەشەودا بە چەقۆ لە ئەحمەدی دەدەن دەیبەنە جێگایەکی دوور، جا گاوانێك دێت گاوانەکە چەند گای پێ دەبێت ئەچێتە سەری دەبینی کوڕێکە کەوتووە جا ئەویش لەسەر پشتی ئەسپەکەی دایدەنێ و دەباتە ماڵەوە ئینجا چاکی دەکەنەوە بەڵام کوڕەکە خۆی ئاشکرا ناکات، کەچی ئەمان وەکو کوڕی خۆیان سەیری ئەکەن، جا کوڕەکە خۆی زۆر سپی ڕادەگرێ، لە تەنیشت ماڵی گاوانەکە پارچە زەوییەك دەبێ . ئەحمەدیش دەڵێ: دەبێ ئەم پارچە زەوییەم پێ بفرۆشن جا ئەوانیش دەیدەنێ، ئەحمەد هەڵدەستێ باخێکی زۆر خۆشی لێ دروست دەکات بەڵام ئەحمەد نازانێ ئەو گوندەی کە تیایدا دەژی براکەی تێدا پاشایە ڕۆژێك (محمد)دەڵێتە دار و دەستەکەی خۆی باخی من لە هەموو باخێك خۆشترە هیچ باخێك ناگاتە باخی من بەڵام یەکێك لە پیاوانی پاشا دەڵێ:. گەورەم باخێك هەیە لە گوندەکەمان زۆر زۆر خۆشە جا پاشا دەپرسی ئەو باخە ئی کێیە ئەوانیش دەڵێن گاوان کوڕێکی هەیە ئەو باخە هی ئەوە جا ئەوە پیاوە دەچێ تاکو ئەو کوڕە بۆ پاشا بێنێ بەڵام نایهێنێ دەڵێ: پاشا ئەو کوڕە زۆر سپی بو بێزم نەهات بۆتی بێنم جا پاشا دەڵێ: بڕۆن هەزار لیرەی

بیدەنیٚ باخەکەی لیٚ بکڕن ، کابراش پارەکە لە پاشا وەردەگریٚ و ئەچیٚ بە گاوان دەڵیٚ: دەبیٚ ئەو کوڕە بکوژریٚ چەند گاوان دەڵیٚ: نابیٚ بەڵاٚم دەڵیٚ: ئەمر ئەمری پاشایە ، ئەحمەدی دەبەنە سەر بوحەیرەیەك دەیخەنە ناو ئاوەکەوە لەو کاتەدا تاجیریٚك هەیە لەناو ئاوەکە جا تاجیرەکە هەڵی دەگریٚتەوە، جا کوڕەکە مەبەستمان (ئەحمەد)ە زۆر جوانە لەگەڵ تاجیرەکە دەچنە شاری بەسرە لەویٚ دوکانی کوتاڵ فرۆشتن دا ئەنیٚن ، ئەڵیٚ ڕۆژیٚکیان ماڵی پاشای بەسر ، کچی پاشای ئەویٚ دەڵیٚتە کارەکەرەکەیان دەڵیٚ: دەبیٚ سابونم بۆ بکڕی، جا کارەکەرەکە دەچیٚ بەڵاٚم زۆری پیٚ دەچیٚ، دەبینیٚ لە شویٚنیٚك زۆر خەڵك ڕاوەستاینە، سەیری ئەو کوڕە دەکەن جا کە دەگەڕیٚتەوە کچەکە بە دار بۆی دەڕوا ، ئەڵیٚ: ئەی گەورەم ئەوەی من دیومە تۆش ببینی وات بەسەر دیٚ جا حاڵ و مەسەلەکەی بۆ دەگیٚڕیٚتەوە جا بەیانی کچە پاشا دەچیٚت ، کە دەچیٚت بۆ بازاڕ کچەکە عەشقی ئەو کوڕە دەبیٚت جا کچەکە دەڵیٚتە خزمەت کارەکەی کە نەفەقی بۆ لیٚدەن بە مەرجیٚك لە ماڵی کچەکە بۆ دوکانی کوڕەکە ، هەمو ڕۆژیٚك کوڕەکە دەڕوا بۆ لای ئەو کچە هەروەها کچەکەش دەچیٚ بۆ لای کوڕەکە . ڕۆژیٚك کچەکە میوانی کوڕەکە دەبیٚت ، جا کچەکە لەلای کوڕەکە دەمیٚنیٚتەوە بەشەو جا کوڕەکە لەبیری دەچیٚ دوکانەکە قەپات بکات . ئەڵیٚ لەلای بەیانی ئەبیٚت پۆلیسی ناو شار دیٚن دەبینن کچی پاشا و کوڕە تاجیرەکە لەگەڵ یەکن.

پۆلیسەکەش هەردوکیان ئەبەستیٚتەوە جا پۆلیسەکە ئەچیٚ بۆ ماڵی پاشا کچەکە هاوار دەکا پۆلیسەکە دیٚت ، کچەکە ملوانکەیەکی دەداتە پۆلیسەکە پیٚی دەڵیٚ: بڕۆ بۆ ماڵی پاشا لەپیٚش دەرگا بڵیٚ (داوی سپی و ڕەش تیٚك ئاڵاٚ) جا ئەویش وە دەکا ئینجا کارەکەرەکە یەك قاپی گەورە دەخاتە سەر سەری دەباتە پیٚش قاپی سجن، جا کارەکەرەکە دەڵیٚتە پۆلیسەکە ئەمەم کردۆتە خیٚر کاتیٚك کە دەچیٚتە ژوریٚ دەبینی پیٚکەوە بەستراون ئینجا جلیان لەگەڵ کچە پاشا دەگۆڕنەوە کچە پاشاکە دەڕواتە دەریٚ ئینجا خەبەر دەدەنە پاشا، جا پاشا دەڵیٚ: ئەگەر کچی من بیٚ لەسەری دەدەم بەڵاٚم ئەگەر وا نەبیٚ ئەوا گۆتیە پۆلیسەکەی سەرت لیٚ دەکەمەوە لەو کاتەوە کە دەچن پاشا دەبینیٚ ئەوە کارەکەرەکەیە ئینجا لەسەری پۆلیسەکەی دەدەن و کوڕە تاجیرەکە بەردەدەن و

کارەکەرەکەش دەهێننە ماڵەوە لەم بەینە دەبێ تاجیرەکان دەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان ، کوڕەکە بە کچەکە ئەڵێ:. سەفەر ئەکەم .

بەلأم کچەکە دەڵێ: دەبێ لەگەڵ خۆتم ببەی ، کوڕەکەش دەڵێ: نابێ لەگەڵ خۆم بت بەم، کچەکە دەڵێ:. باشە خوا حافیزیت لێ دەکەم بەلأم بەیانی وەرە هەدیەکت دەدەمێ . بەلأم هەتا نەگەیە ئەو شوێنە نابێ هەدیەکە بکەیتەوە، جا کچەکە سندوقێك دروست دەکات . لەو کاتەوە محمددێت و دەیەوێ بڕوات پێش ئەوەی بڕوات دێتە لای کچەکە بۆ ئەوەی هەدیەکەی بداتێ جا کارەکەرەکە دێ دەڵێ: ئەوە هەدیەکەیە کوڕەکە (محمد) سندوقەکەی لەگەڵ خۆی دەبات و دەڕوات ماوەیەکی زۆر زۆر ئەڕۆن محمد دەڵێ: بۆ کچی پاشام نەهێنا ئینجا کچی پاشا دێتە دەرێ دەڵێ: ئەوە من لێرەم جا بەیەکتر شاد دەبن ، جا (محمد) بەسەرهاتی خۆی بۆ کچەکە دەگێڕێتەوە ، جا کچەکە زۆر زۆرزان دەبێ کابرایەکی تریان لەگەڵە دەڵێتە کچە پاشای حەز لەتۆ دەکەم ، جا ئەو کابرایە دەڵێ: دەبێ (محمد) بکوژن. ئینجا کچەکە دەزانێ کوڕەکە (محمد)دەخاتە ناو سندوق و جلی (محمد)لەبەر دارێك دەکات، جا کچەکە لەگەڵی قسە دەکات ئینجا دێن دارەکە فڕە دەدەنە ناو ئاوەکە بەلأم کچەکە بە ئەنقەست لەخۆی ئەدا و دەگریێ جا کابراکە پێی دەڵێ:. دەبێ شوم پێ بکەی کچەکە دەڵێ: باشە بەلأم بە مەرجێك شوت پێ دەکەم کە بگەینە یەکێك لەو جێگایانە لەسەر دەستی یەکێکی لە گەورەی ئەو جێگایە من شوت پێ دەکەم کابرا دەڵێ: باشە ، جا دەڕۆن دەگەنە ئەو شارەی ئەحمەدی برای محمدی لێیە. جا دادەبەزن لەوێ قسە دەکەوێتە بەردەمی پاشا بەلأم (محمد)وەسفی برای بۆ کچەکەی کردوە. کچەکە یەکسەر دەیناسێتەوە جا سندوقەکەش لەگەڵ خۆی دەبات ، جا پاشا دادەنیشێ دەڵێ:. کێ حیکایەت دەزانێ بۆم بڵێ . جا کچەکە چیرۆکی (محمد)ی بۆ دەگێڕێتەوە، جا لەپاشان دەڵێ: گەورەم ئەوەتە لێرەیە . بە مەرجێ ئەو حیکایەتەی بۆ دەکات دەڵێ: هەر چ کەسێك بەژدارە لەو چیرۆکە هەمویان بێنن بە مەرجێ کەس نەچێتە دەرێ .

هەموو ئەو پیاوانەی لێیە کە دەستیان هەیە لە تێك دانی ژیانی (محمد). جا کچەکە هەموی بۆ پاشا باس کرد لەسەری هەتا بنی جا لەکۆتایی دا پاشا

**دەڵێت:. ئەدی کوا براکەم دەڵێ: ئەوەتە ئەو کەسانەی کە ئازاری ئەوانیان داوە لە سێدارەیان ئەدەن ئینجا کچەکە لە(محمد)مارە ئەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ شاری خۆیان کە دێنەوە دایکیشی ماوە ، وە کارەکەرەکەش بانگ دەکەن. (ئەحمەد و محمد) دەڵێنە کارەکەرەکەی وەرە پێمان بڵێ بۆ ئێمەت وا لێ کرد . جا کارەکەرەکە حیکایەتەکەی بۆ گێڕانەوە .**
**جا لەو کاتەدا دایکی و پاشایەکە دێن بۆ ئەو ژورەی کە (ئەحمەد و محمد) لێ دانیشتییە. جا (ئەحمەد و محمد)هەردوکیان دەکوژن و ئیتر بۆ خۆیان بە خۆشی دەژین .**

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: کوتری ئەفسوناوی، هەر کەسێك سەری ئەم کۆترە بخوات، کوپە زێرێك دەدۆزیتەوە، هەر کەسێ جەرگی بخوات پلەو پایەی بەرزدەبێتەوە.**

# کوڕە کەچەڵ

**کۆکردنەوە: بنار عەبدولعەزیز ئیسماعیل**

**گێڕانەوە : نەسرین کاکە ئەحمەد**

هەبوو نەبوو، پیرێژنێك هەبوو، کوڕێکی هەبوو، ناوی (کوڕە کەچەڵ) بوو. کوڕە کەچەڵ هەموو ڕۆژێك بارەك کای دەکرد و دەیهێنایە بازاڕ و دەیفرۆشت بە پارەکەی خواردنی پێ دەکڕی و دەیبردەوە ماڵێ لەگەڵ دایکی دەیانخوارد . واتە ژیانیان بەو پارەی بارە کایەکە بە ڕێ دەکرد .

ڕۆژێك کوڕە کەچەڵ کە دەچێت کا بکات تەیرێکی قەڵە و وجوان دەگرێ و دەیهێنێتەوە بۆ ماڵەوە . بەدایکی دەڵێ: ئەمڕۆ ئەم تەیرە دەفرۆشم . سبەینێ بارەکە کایەکە دەفرۆشم .

کوڕە کەچەڵ تەیرەکە دەباتە بازاڕ دەگاتە بەردەم دوکانی سێ برا کە پێیان دەڵێن: سێ برا کۆسە . خەڵك لە کوڕە کەچەڵ کۆ دەبنەوە هەر یەکەو سعرەکی پێ دەدات لەو کاتە برای گچکە بە کوڕە کەچەڵ دەڵێ: کوا ئەو تەیرەم بدەیێ بزانم بە چەندە . ئەویش دەیداتە برای ناوەنجی و برای ناوەنجیش دەیداتە برای گەورە لەو مابەینە تەیرەکە بزر دەکەن. هەر چەند کوڕە کەچەڵ هاوار دەکا و دەپاڕێتەوە کە تەیرەکەی بۆ بهێننەوە، بەلاًم. هەر جوابیشی نادەنەوە. کوڕە کەچەڵ پێیان دەڵێ: مادام پارەکەیم دەنێ ئەگەر پێتان نادۆزرێتەوە. بەلاًم سێ براکە پارەکەشی نادەنێ، ئەویش لە خەفەتان دەچێتە پشت دوکانەکەیان و دەست دەکا بە گریان ، چونکە هیچ پارەی پێ نییە کە بە خواردنی بدا و بیباتەوە بۆ دایکی.

لەو کاتە گوێی لە براکان دەبێ کە بانگی شاگردەکەیان دەکەن پێی دەڵێن: بڕۆ ئەو تەیرە ببەوە بۆ ماڵێ بە خانم بڵێ با بۆ نیوە ڕۆ لێی بنێ. کە کوڕە کەچەڵ گوێی لەوە دەبێ هەڵدەستێ دەڕوا بەدوای شاگردەکە تا دەگاتە ماڵی سێ کۆسەکە. چاوەڕێ دەکا هەتا نیوە ڕۆ دادێ پێش ئەوەی سێ براکە بگەڕێنەوە دەچێ لە دەرگای ماڵی سێ کۆسەکە دەدا. بە خانم دەڵێ: خانم ئەوە مێردەکانتان بۆ نیوەڕۆ نایەنەوە کۆسەی گەورە گوتی با ئەو خواردنەی

ئامادەی کردووە بۆمان بنێرێتە دوکانی، ژنەکەش خواردنەکەی بۆ لەسەر سینیەکی گەورە دادەنێ و دەیڕازێنێتەوە و دەیداتە کوڕە کەچەڵ. پێشی دەڵێ: داوای (500) عانەیان کردووە کە بۆیان ببەم ژنی کۆسە پارەکەشی دەداتێ و کوڕە کەچەڵ دەڕوا لەسەر دەرگا دەنوسێ:

**ئەو کوڕە کەچەڵە ماخۆی تەیرۆکەیە**

**ئەوەتان چاکترە هی خراپترتان لە پاشترە .**

کوڕە کەچەڵ خواردنەکە دەباتەوە ماڵێ و دایکی لێی دەپرسێ ئەوە چییە؟ ئەویش دەڵێ: ئەوەم لە بازاڕ کڕیوە و نەمویست ئەتو عەزیەت بدەم بە حازری خواردنەکەم هێناوەتەوە .

بۆ بەیانی کوڕە کەچەڵ دەچێتە بازاڕ دەبیستێ ، کە سێ کۆسەکە دوێنێ هەر سێکیان ژنەکانیان کوشتووە . ماوەیەکی بەسەردا تێ دەپەڕێ ڕۆژێك کوڕە کەچەڵ دێتەوە ماڵێ بە دایکی دەڵێ: : دایکە ئەو پارەیەت دەدەمێ بڕۆ بازاڕ هەندێ جل و کەرەسەی ژنانەم بۆ بکڕە .

دایکیشی دەچێت و شتەکان بۆ کوڕە کەچەڵ دەکڕێ . هەر چەند داوای لێ دەکات کە پێی بڵێ بزانێ ئەو شتانەی بۆ چییە بەلاَم کوڕە کەچەڵ پێی ناڵێ و دەڵێ: بۆ ژنی برادەرێکمە .

شەوێك کوڕە کەچەڵ جلەکان لەبەر دەکا و خۆی دەکاتە ژن و دەچێ لە دەرگای ماڵی کۆسەکان دەدات .

کۆسەی گچکە دەچێ دەرگا دەکاتەوە هەرچەند تەماشای ئەولا و ئەولا دەکا کەس نابینێ و دێتەوە دەڵێ: کەس نەبوو بۆ جاری دووەم لە دەرگا دەدات برای ناوەنجی دەچێت دەرگا دەکاتەوە ئەویش دەگەڕێتەوە کەس نابینێ ، بۆ جاری سێیەم لە دەرگا دەدات . ئەو جارە برای گەورە دەڵێ: ئەمن دەچم . کە کۆسەی گەورە دەرگا دەکاتەوە دەبینێ ئەوە ژنێك لەبەر دەرگایە ، ژنەکە پێی دەڵێ: بۆیە خۆم لە براکانت ئاشکرا نەکرد چونکە ئەمن بۆ لای تو هاتوم کە زانیم ئەتو نی خۆم لێ دەشاردنەوە . کۆسەی گەورە دێتەو ژورێ بە براکانی دەڵێ: بڕۆن بخەون ئەمن ئەو شەو زۆر ماندوم دەمەوێ زوو بنوم. کۆسەی گەورە کوڕە کەچەڵ دەهێنێتە ژوورەوە ، کەخۆی کردۆتە ژن .

بەڵام کوڕە کەچەڵ بە کۆسە دەڵێ: لە پێش ئەوەی ئەمن ئەو شەو لێرە بم دەبێ ئەتو پێم بڵێی بزانم چتان هەیە لەو ماڵە .

کۆسەش هەرچی زێڕ و پارە و سەروەتی هەیە پێشانی ژنەکەی دەدات تەنها ژورێك دەمێنێ کە بۆی ناکاتەوە . کوڕە کەچەڵ دەڵێ: ئەو ژورە چییە کەوا نهێنی تێدایە ، کۆسەش دەڵێ: ئەو ژورە ئامێرێکی تێدایە هەرچی ڕقمان لێی بێ و دوژمنمان بێت بەو ئامێرە لەناوی دەبەین ، کوڕە کەچەڵ زۆر داوا لە کۆسە دەکات کە ئەو ئامێرەی پێشان بدات. کۆسەی گەورە دەرگاکەی بۆ دەکاتەوە و دەڵێ: لەسەرەتا کەسەکە دەخەینە ناو ئەو ئامێرە و پلاکێکی پێوەیە بۆ لای ڕاستی با دەدەین کەسەکە هەڵدەپەڕێنێ زۆری پێ خۆش دەبێ دوایی دەسکەکە بەلای چەپ با دەدەین هەلا بە هەلای دەکا و دەیکوژێ .

کوڕە کەچەڵیش دەڵێ: وەڵلاّ زۆر خۆشە ئەمن دەچمە ناوی هەندەکم هەڵپەڕێنە . کۆسەیش هەندەکی هەڵدەپەڕێنی و دێتە دەرێ کوڕە کەچەڵ دەڵێ: وەڵلاّ زۆر خۆش بوو دەی ئەتۆش بچۆ ناوی با هەندەك یاریش بەتۆ بکەم . کۆسەش دەڵێ: بەڵام ئاگات لە دەسکەکە بێ بەلای چەپی با نەدەی. کۆسە دەچێتە ناو ئامێرەکە و سەرەتا کوڕە کەچەڵ تۆزێکی هەڵدەپەڕێنێ دوایی دەسکەکە بۆ لای چەپ تۆزێك با دەدا تاوەکو هەموو لەشی کۆسە دەشکێنێ و بەجێی دێڵێ هەرچی زێڕ و زیو هەیە دەیبات و لەسەر دەرگاش دەنوسێتەوە :

ئەو کوڕە کەچەڵە ماخۆی تەیرۆکەیە

**ئەوەتان چاکترە هی خراپترتان لە پاشترە!**

براکان کە بەیانی هەڵدەستن دەبینن ئەوە کاکیان هەموو لەشی شکاوە و نوتقی بڕاوە. دەچن بە دوای حەکیم تا وەکو بێت براکەیان چاك بکات، لە ڕێگا تووشی کوڕە کەچەڵ دەبن کە جلکی حەکیمانی لەبەر کردووە و جانتایەکی بە دەستەوەیە نایناسنەوە و پێیان دەڵێ: ئەرێ کاکە ئەوە خێرە وا مشەوەش دیارن، ئەوانیش دەڵێن: وەڵلاّ برایەکمان هەموو لەشی شکاوە و زمانی نەماوە دەچین بە دوای حەکیمێك تاکو بێت چارەی بکات.

کوڕە کەچەڵ دەڵێ: ئەمن حەکیمم کوا کاکتان لە کوێیە تا چارەی کەم ئەوانیش دەڵێن: بە قوربانت بین ئەوە کاکم لە ماڵەوە کەوتووە .
لەگەڵ دوو برایەکە دەچێتە ماڵیان و تەماشای کۆسەی گەورە دەکات و دەڵێ: ئەوە بە دەرمان چاك نابێت بڕۆن بە حەمام چی بڵێن: با ئەوڕۆ نەیەڵێ کەس بچێتە حەمام، حەمامەکەش چاك دا بخات بۆ ئەوەی زۆر گەرم بێت کارتۆنەك سابونیش ببەن لەوێی دانێن. برای گەورەتان ببەنە حەمام و بۆ خۆشتان لە دەرەوە چاوەڕێی بکەن تا بانگتان دەکەم .

کوڕە کەچەڵ دەستەك جلکی چاك لەگەڵ خۆی دەباتە حەمام و قەنەکیش لەگەڵ خۆی دەبات، کۆسەی گەورە دوو سێ جار لە ئاوە گەرمەکە هەڵدەنێ تا هەموو لەشی دەسووتێ و دەبێتە ئێسقان، جلەکەی لەبەر دەکا و قەنەکەی لە زاری دەکا و کلاوێکی لەسەر دەکات و لەسەر کورسیەکی دادەنێت لەسەرێ پێش دەرگای حەمامەکەش هەموو بەسابون دەکات و بە ئەرزەکە پانی دەکاتەوە. دەچێتە دەرێ و بە براکانی کۆسە دەڵێ: بڕۆن ئەوە کاکتان چاك بۆتەوە لەسەر کورسی دانشتوە قەنە دەکێشێ.

دیسان لەسەر دەرگای حەمامەکەش ئەو شعارەی پێشوو دەنوسێتەوە. براکانی کۆسە لە خۆشیان غار دەدەن لە ئەرزەکە بەردەبنەوە کە بە سابونە و لوسە پشتی سەریان بە ئەرزی دەکەوێ برای ناوەنجی دەڵێ: تەماشا تەماشا ئەمە ئەوە سەرمان شکا کاکیشم خۆی لە قەنە خواردن ناکات، هەر چۆنێك بێت دەگەنە کاکیان کە تاماشا دەکەن کاکیان بەس ئێسك ماوە و مردووە.
دوو برا کۆسەکە کە دیسان ئەو نووسینەی لەسەر دەرگای حەمامەکە دەبینن دەزانن ئەوە کوڕە کەچەڵ ئەو ئیشەشی کردوە بە پەلە دەچن بۆ لای حاکم بۆ ئەوەی شکایەت لە کوڕە کەچەڵ بکەن .

کوڕە کەچەڵیش دەچێ چوار پێنج تۆپ قوماش دەکڕێ و لەسەر دەست و شان و ملی خۆی دادەنێ و جلی کوتاڵ فرۆشان لەبەر دەکا و لەبەر دەرگای مەحکەمەی ڕادەوەستێ و هاوار دەکات یەڵلا قوماشی جوان، قوماشی باش ... دەبینێ ئەوە دوو برا کۆسەکە بە پەلە دێن بۆ لای مەحکەمە و لێیان

دەچێتە پێش و سلاّویان لێ دەکا و پێیان دەڵێ: ئەرێ براینە چۆنن ئەوە بۆ وا مشەوەش دیارن؟ دەڵێ: خوا نەخواستە شتێکی گەورەتان بەسەر هاتوە؟ .
دوو براکەش ئەوەی کە کوڕە کەچەڵ بەسەری هێناون بۆ کابرای کوتاڵ فرۆشی دەگێڕنەوە . کوڕە کەچەڵیش پێیان: دەڵێ کە خۆی کردۆتە کوتاڵ فرۆش : ئینجا برا ئێوە بەو جلە جوان و شت و مەکەوە چۆن دەبێ بچنە لای حاکم . وەرن جلێکی کۆن لەبەر بکەن و سەری خۆتان لە قوڕ بنێن ، بە لەخۆدان بچنە لای بۆ ئەوەی شکاتتان بپرسێ و چارەکتان بۆ بدۆزێتەوە .
ئەوانیش دەڵێن: وەڵلاّ ئەو مامە کوتاڵ فرۆشە ڕاست دەکات .

دەچن کوڕە کەچەڵ چیان پێ دەڵێ: ئاوا دەکەن هەرچی جلك و کەل و پەلە لای کوتاڵ فرۆشی دای دەنێن بە لەخۆ دان و قوڕ پێوان دەچن بۆ لای حاکم .
کوڕە کەچەڵیش هەرچی جلك و کەرەسەکانی دوو برا کۆسەکەیە دەیانبات و لەسەر دەرگای مەحکەمە دەنووسێتەوە :
ئەوە کوڕە کەچەڵە ماخۆی تەیرۆکەیە

ئەوەتان چاکترە هی خراپترتان لە پاشترە!

کە حاکم و دوو براکە دەبینن ئەوە کوتاڵ فرۆش لەوێ نەماوە جلەکانیانی بردوە و لەسەر دەرگاش دوو بارە ئەو شتەی نووسیوەتەوە. ئەوجا دەزانم کە ئەوجارەش کوڕە کەچەڵ بووە هەڵی خەڵەتاندونەتەوە.

حاکم زۆر توڕە دەبێ بڕیاردەدا بە دەست و پێوەندەکانی هەرچۆنێك بێت دەبێ کوڕە کەچەڵ بگرن. ئەوانیش زۆر هەوڵ دەدەن بۆیان ناگیرێ. حاکم بانگەوازێك دەکا هەموو خەڵکی ئەو شارە کۆ دەکاتەوە لە ساحەیەکی گەورە .
کۆمەڵێك لیرە ڕۆ دەکاتە سەر ئەرزی و دەڵێ: ئەو کەسەی کە بەخۆی دەڵێ: ئازا با بێت دا بێتەوە و ئەو لیرانە هەڵ بگرێتەوە، ئەوانیش دەڵێن: هەرکەسێك لیرەکانی هەڵ گرتەوە ئەوە ئەو کەسە کوڕە کەچەڵە کە زۆر بە تەماح و دزە و لەبەر لیرەکان ئەو ئیشە دەکات.

کوڕە کەچەڵیش دەچێ بنەوەی پێڵاوەکەی بە قیر دەکا هەرجارێك ئەو سەر و سەری ساحەکە دەکا و حەوت هەشت لیرە بە بنی پێڵاوەکەی دەنوسێ و

**دەیباتەوە ماڵێ لێیان دەکاتەوە و چەند جارێکی کەش ئاوا دەکا، تا هەموو لیرەکان کۆ دەکاتەوە.**

**هەرچەندی حاکم و پاسەوانەکان سەیر دەکەن نابینن کەس دابێتەوە لیرەیەك هەڵگرێتەوە، کەچی تەماشا دەکەن هیچ لیرەی لێ نەماوە .**

**حاکم دەڵێ: نەو لەو فێڵەش سەر نەکەوتم با فێڵێکی تر بکەم بۆ گرتنی کوڕە کەچەڵ .**

**کوڕە کەچەڵ دەچێ بەلای ماڵی جولەکەیەك دا دەڕوا دەبینێ کابرایەکی جولەکەی لاواز لەناو قوڵتێکە بیر لێ دەدا سلاوی لێ دەکا و دەڵێ: مامە جو ئەوە کاتی خۆی بابم هەندێ پارەی بابی تو قەرزدار بوو ئەوە پارەکەم بۆ هێناویەتیەوە ، کابرای جوش دەستی لەناو قوڵتەکە درێژ دەکا تا پارەکە لە کوڕە کەچەڵ وەربگرێ، کوڕە کەچەڵیش دوسێ جار دەستی کابرای جو ڕادەتەکێنێ و لە بنەوە دەری دەهێنێ و دەستەکە لەگەڵ خۆی دەبا.**

**حاکم کچێکی زۆر جوانی دەبێ دەیبا لەسەر گردێك دور لە شاری دایدەنێ و چەند پاسەوانێکی لە خوارەوە بۆ دادەنێ و بانگەواز دەکا کێ خۆی پێ ئازایە با بچێ ئەوە کچی من لەو شوێنەیە بچێتە لای، کوڕە کەچەڵیش ئەوە دەبیستێ دەستی کابرای جو دەگرێ و لەگەڵ خۆی دەبا و دەچێتە لای کچی حاکم کچەکەش توند کوڕە کەچەڵ دەگرێ و دەیەوێ بانگی پاسەوانەکان بکات، پێی دەڵێ: ئەمن لەبەر خاتری تۆ هاتووم بۆ خۆم دەچمە لایان .. شەو دەبێ کە کوڕە کەچەڵ چۆتە لای کچەکە، شەوێ بە کچەکە دەڵێ: تا سبەینێ چاوەرێ بکە تازە ناتوانم بە هیچ جۆرێك هەڵبێم، کە بەیانی داهات بمبە لای باوکت.**

**تا بەیانی لەگەڵ کچە دەبێ و سبەینێ کە هەڵدەستن بە کچەکە دەڵێ: دەچمە پشت ئەو گردە میزێك دەکەم و دێمەوە کچەکەش دەڵێ: نەخێر نابێ بەهیچ جۆرێك لێرە بڕۆی. ئەویش دەڵێ: ئەو کەلەپچە لەدەستم بکە بە گوریسێك بیبەستەوە با سەرەکەی لەلای خۆت بێت، دوای پێنج دەقەی کە دەگەڕێمەوە کە کوڕە کەچەڵ دەڕوا ماوەیەکی پێ دەچێ ناگەڕێتەوە.**

کچەکەش گوریسەکە ڕادەکێشێ دەبینێ دەستەکی پێوەیە و کوڕە کەچەڵ ڕۆیشتوە . کچەکە دەگەڕێتەوە لای باوکی و دەڵێ: شەو هاتە لام. بەڵام بەیانی بەو فێڵە خۆی ڕزگار کرد بەڵام ئەوە دەستەکیم لێ کردۆتەوە کە ئەوجا بە ئاسانی دەیدۆزینەوە حاکمیش کۆمەڵە کەسێك دەنێرێتە ناو شار بۆ ئەوەی بزانن کێ دەستەکی نییە بیگرن ئەوا کوڕە کەچەڵە. کە دەچن دەپرسن لە خەڵکی بزانن کێ دەستەکی نییە خەڵکەکەش ماڵی کابرای جولەکەیان پیشان دەدەن ، دەچن کابرا دەگرن لە ماڵێ کەوتوە لەرز و تای لێیە و نەخۆشە و دەیبەنە لای حاکم دەڵێت : قوربان تەنها ئەو کابرا جوە دەستی نییە بە فێڵ خۆی نەخۆش کردوە ، ئەوەیە کە ئەو هەموو شتەی بەسەر ئێوە و کۆسەکان هێناوە . زۆر لە کابرای جولەکە دەدەن کابرای جوش زۆر هاوار دەکا و دەپاڕێتەوە و بە حاکم دەڵێ: بەخوای قوربان ئەو کوڕە کەچەڵە ئاواشی بەسەر من هێناوە ئەو دەستی منی بەو فێڵە لێ کردۆتەوە . ئەوجا حاکم باوەڕ بە کابرای جولەکە دەکا و بەری دەدەن .

ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێ دەپەڕێ کچی حاکم زگی دەبێ و دوو منداڵی بە زگەکی دەبێ . حاکم زۆر عاجز و غەمبار دەبێ کە ناتوانن ئەم کوڕە کەچەڵە بگرن ، بۆیە نامەیەك بۆ حاکمی شارێکی کە دەنێرێ ئەویش جوابی دەداتەوە و زۆری قسە پێ دەڵێ: جنێوی پێ دەدات. کە پێی دەڵێ: ئەو شارە حاکمێکی وەکو تۆی هەیە بۆیە حاڵی خەڵکەکەی ئاوا خراپە. کە حاکمی شاری کوڕە کەچەڵ ئەو وەڵامە دەبیستێ لە حاکمی شارەکەی تر ئەوەندەی تر توڕە دەبێ . وەزیرێکی زۆر عاقڵی دەبێ دەڵێ: گەورەم ئەوە منداڵەکانی کچەکەت بونەتە دوو ساڵ با پیاوانی هەموو شار دەعوەت کەین، ئەو دوو منداڵەش لەناو پیاوەکان بەرەڵا دەکەین. چونکە منداڵ بەبۆن باوکیان دەناسن منداڵەکان چونە لای کێ ئەوە ئەو کەسە باوکیانە حاکمیش دەڵێ: باشە ئەو ئیشەت بە قسە دەکەم بەڵام لەوەشیان سەرناکەوین و نایگرین.

حاکمیش هەموو پیاوانی شار دەعوەت دەکات و لە ژورێکی گەورە دادەنیشن. کوڕە کەچەڵیش کە دەچێتە ماڵی حاکم فەرخە پشیلەیەکی گچکە لەگەڵ خۆی دەباتە ژورێ لەناو باخەڵی دەنێ. کاتێك دوو منداڵەکە بەرەڵا

دەکەن منداڵەکان یەکسەر دەچنە لای کوڕە کەچەڵ. کە دەزانێ منداڵەکان بۆ لای وی دێن . فەرخە پشیلەکەیان پیشان دەدا هەردووکیان دەگەڕێنەوە چەند جارێك ئاوا دەیانەوێ بچنە لای کوڕە کەچەڵ دەچنە پێشێ لێی دەگەڕێنەوە. کە وەزیرەکە دەبینێ ئەوە منداڵەکان تەنها بۆ لای ئەو پیاوە دەچن و دەیانەوێ بچنە کنی و دەگەڕێنەوە. سەیری دەکا دەبینێ فەرخە پشیلەیەکیان پیشان دەدا و ناهێڵێ بچنە لای یەکسەر دەزانێ ئەوە کوڕە کەچەڵە و بابی ئەو منداڵانەیە. بڕیاردەدا و دەگرن کە حاکم ئەوە دەزانێ زۆری پێ خۆش دەبێ و خەلاٌتێکی چاکی وەزیرەکەی دەکات ، بانگی کوڕە کەچەڵ دەکات، لێی دەپرسێ بزانێ بۆچی ئەو هەموو ئیشە خراپەی کردوە و بۆچی ئەوەندی زۆر زانە و بە هیچ بۆیان نەدەگیرا.

کوڕە کەچەڵیش ئەوەی بۆ دەگێڕێتەوە کە سەرەتا سێ برا کۆسەکە چیان بەسەر هێناوە . کە بەحاکم دەڵێ: قوربان دەبێ پیاو وابێ لە هەرخەسارە و عەقڵێك وەربگرێ .

حاکمیش پێی دەڵێ: مادام ئەتوو ئەوەندە عاقڵی ئەگەر دەتوانی بچی ئەو حاکمەی ئەو شارەم بۆ بێنیە ئێرە (ئەو حاکمەی کە نامەکەی بۆ ناردبوو) ئەوا لێت خۆش دەبم و لە جێگای خۆم دەتکەمە حاکم و کچەکەشمت دەدەمێ.

کوڕە کەچەڵیش دەڵێ: وەڵڵا قوربان ئەوە زۆر ئاسانە بۆشت دەهێنمە ئێرە و لە پێش چاوی هەموو خەڵکی سوکیشی دەکەم بەس ماوەیەك مەجالم بدە .

کوڕە کەچەڵ دەڕوا تا دەگاتە ئەو شارە و دەچێ لە ماڵی حاکمی شار دەپرسێ و دەیدۆزێتەوە . لە دەرگا دەدا دەڵێ: ئەمن غەریبەم هاتوومە ئەو شارە تا ئیشێك بۆ خۆم بدۆزمەوە بیستوومە کە ماڵی حاکم کارە کەریان دەوێ ئەمنیش هاتووم لێرە ببمە کارەکەر . حاکمیش ڕازی دەبێت ماوەیەك لەلایان دەبێ حاکم زۆری بەدڵ دەبێ هەرچی پێی بڵێن بۆیان دەکات . ڕۆژێك حاکم نۆرە حەمامی دەبێ بە کوڕە کەچەڵ دەڵێ: بڕۆ بە حەمام چی بڵێ ئەوڕۆ حاکم دێت خۆی بشوا نەیەڵێ کەس بچێتە حەمام، تەنها ئەوڕۆ حەمام بۆ حاکم دەبێ کوڕە کەچەڵیش پێش ئەوەی جلەکانی حاکم بەرێت بۆ حەمام دەچێتە قەسابخانە بزنەکی قۆچداری گەورە دەکڕێ پیستەکە و سەرەکەی دەهێنێ و

گۆشتەکەش دەداتە خەڵکی و هەندێ زەنگوڵە و مورووی گەورە دەکڕێ و لەگەڵ جلی حاکم دەیبات بۆ حەمام لەوێ نایەتە دەرەوە خۆی دەشارێتەوە. کە حاکم دێت بۆ حەمام دەبێتە مشەوەشی حەمام چی کوڕە کەچەڵی لەبیردەچێتەوە کە لە ژوورییە .

حاکم بە تەنیا دەچێتە ژوری حەمام و دەست دەکا بە خۆ ششتن لەو کاتەی کە سەر و چاو و لەشی بە کەف دەبێ گوێی لە خڕە خڕی زەنگوڵە و خشە خش دەبێ کە سەری بڵند دەکا بە دەم و چاوی بە کەفەوە دەبینێ ئەوا جنۆکەیەك بە قۆچەکی گەورە و لەشی توکاوی لە پشت سەریەتی زراوی دەچێ و هەموو لەشی دەلەرزێ پێی دەڵێ: ئەی هاوار ئەتوو چی و چ دەکەی لێرە چت لێم دەوێ؟ کوڕە کەچەڵ جوابی دەداتەوە دەڵێ: ئەمن ئیزرائیلم خوا فەرمانی پێ داوم کە ڕوحی تۆ بکێشم .

حاکمیش زۆری لەبەر دەپاڕێتەوە . ئیزرائیل دەڵێ: پاڕانەوە لای من ناخوا هەر دەبێ ئێستا ڕۆحی تۆ بکێشم یەلاَ خۆت حازر بکە .

حاکم ئەوەندەی تر زراوی دەچێ دەگریا و هاوار دەکا دەڵێ: باشە مادام هەر ڕوحم دەکێشی بەس ئەو شەو مەجالم بدە با بچمەوە ناو ماڵ و منداڵم ئەو سەروەت و سامانەی کە هەمە بەسەر منداڵەکانمی دابەش بکەم . خوا حافیزیان لێ بکەم .

ئەویش دەڵێ: باشە ئەو شەو مەجالت دەدەم بەس بەیانی بابت شۆن و لەناو سندوقەکت بخەن و بت بەنە ئەو دەشتەی ئەمنیش دێم بە کۆڵمت دادەدەم دەتبەمە ئاسمانێ .

حاکم بەپەلە لە حەمام دێتە دەرەوە دەچێتە ماڵەوە بانگی هەموو منداڵەکانی دەکات و هەموو وەزیرەکان و پیاوەکانی کۆدەکاتەوە. ئەو سەروەت و سامانەی کە هەیەتی بەسەر منداڵەکانی دابەشی دەکا و پێیان دەڵێ: بڕۆن سندوقەکم بۆ بێنن بەیانی زوو بمخەنە ناوی بمبەنە ئەو دەشتە لەوێ سەیدەك دێ بەکۆڵیم دادەدەن و حەقتان نەبێت چەندی منداڵەکانی پێی دەڵێن: کوڕە بابە خۆ ئەتوو شێت نەبووی چۆن ئیشی وا دەکەی، حاکمیش دەڵێ: نەخێر بەیانی دەمرم چاوتان بە من ناکەوێتەوە.

بەیانی دادێ حاکم چۆن دەڵێ: ئاوا دەیخەنە ناو سندوقەکە و دەیبەنە دەشتێ کوڕە کەچەڵ خۆی دەکاتە سەید و سندوقەکەی بە کۆڵی دادەدات ، بەڵام پێش ئەوەی بڕوات بە حاکم دەڵێ: چم پێ گوتی: ئاوا بکە کە دام نای دارەکت لێ دەدەم وەك کەرێ بزەڕە . داری دوەمت لێ دەدەم وەك سەی ببۆڕە داری سێیەمت لێ دەدەم وەك پشیلەی بمیاوێنە ، بەوە خوا لە گوناحەکانت خۆش دەبێ و کە سەرت هەڵدەدەمەوە یەکسەر لە بەهەشتێ خۆت دەبینیەوە.

کوڕە کەچەڵ دەگاتەوە شارەکەی خۆیان ، پێشتر جوابی بۆ حاکم ناردبوو حاکمیش هەموو خەڵکی کۆ کردبۆوە لە ساحەیەکی گەورە ڕاوەستابوون کوڕە کەچەڵ سندوقەکە دادەنێ لە ناوەڕاستێ. داری یەکەمی لێ دەدا حاکم وەك کەرێ دەزەڕێ ، داری دووەمی لێ دەدا وەك سەگی دەوەڕێ ، داری سێیەمی لێ دەدا وەك پشیلەی دەمیاوێنێ.

ئینجا سەری سندوقەکەی دەکاتەوە دەڵێ: حاکم هەستە ئەوە بەهەشتە کە حاکم چاوی هەڵدێنێ دەبینێ ئەو شارەیە کە جنیو و قسەی بە حاکمەکەیان گوتبوو . حاکمەکەش لەسەر سەریەتی پێی دەڵێ: ها ئەوا ئەو کوڕەیە کە لەلای تۆ هیچ نەبوو. کە ئەو هەموو قسە ناشیرنەت پێ گوتبوم گوتبوت چۆن پیاوەکیان پێ ناگیرێت ئەوە ئەو پیاوەیە کە تۆی هێنایە ئێرە و سوکیشی کردی لە پێش چاوی ئەو هەموو خەڵکە.

ئەوجا حاکم بە حاکمی شاری کوڕە کەچەڵ دەڵێ: ئەوەی من کردم ئەتوو نەی کەی .

ئەوجا حاکم کوڕە کەچەڵ لەجێگای خۆی دادەنێ و کچەکەی دەداتێ و ژیانێکی خۆش دەژین .

***ئەم حەکایەتە یەکێکە لە حەکایەتە گرنگ و خۆش و سەیرەکانی کوڕە کەچەل، کە لەناو حەکایەتی کوردی کوره کەچەل کەسایەتییەکی ناسراو فێڵبازەو تۆڵەی خۆی لە پاشاو حاکم و کۆسەش دەکاتەوە.**

# سێ خوشك و كوڕە پاشاكە

**كۆكردنەوە: تریفە جەمیل حەمید**

**هەبوو نەبوو، پیاوێك هەبوو، سێ كچی دەبێ ڕۆژێكیان هەر سێكیان كۆ دەبنەوە و كچە گەورە دەڵێ: ئەگەر هاتوو ببم بە خێزانی كوڕە پاشا ئەوا (بەیەك گلۆڵە سووف بەڕەیەك دروست دەكەم). كچە ناوەنجیش دەڵێ: ئەگەر مێرد بكەم بە كوڕە پاشا ئەوا (بە یەك هێلكە حەوت كەس بەڕێ دەكەم). كچە گچكەش دەڵێت: ئەگەر مێرد بكەم بە كوڕە پاشا ئەوا (یەك كوڕ و یەك كچی چاوشین و پرچ زەردی جوانم دەبێ) كوڕە پاشاش لە پەنجەرەی ماڵی خۆیان گوێی لە قسەكانیان دەبێت بۆیە كچە گەورە دەهێنێ و یەك گلۆڵە سوفەكەی بۆ دەهێنێ كە بەڕەیەكی بۆ دروست بكات. بەڵام. كچە گەورەكە ناتوانێ بۆیە تەڵاقی دەدات دوای ئەو كچە ناوەنجی دەهێنێ و حەوت مێوان دەهێنێتەوە یەك هێلكە دەدات بە ژنەكەی ئەویش دەڵێ: یەك هێلكە بەشیان ناكات كوڕە پاشاش دەڵێت ئەی تۆ نەتگوت ... ؟؟**

**بۆیە كچە ناوەنجیش تەڵاق دەدات، پاشا كچە گچكە دەخوازێ ئەویش یەك كوڕ و یەك كچی جوانی دەبێ، بەڵام دوو خوشكەكەی پێیان ناخۆش دەبێت بۆیە لە جیاتی دوو منداڵەكە دوو پشیلە دادەنێن و ڕقیان لە كچە گچكەكە دەبێتەوە و كوڕە پاشا ئەویش تەڵاق دەدات دوایی كچە گچكە، دەكەوێتە لای پیرەژنێك بەخێوی دەكات و كچە گەورەو ناوەنجیش دەكەونە لایەكی تر پاش ماوەیەكی بەسەر ئەچێ هەردوو خوشكی گەورە و ناوەنجی دەبینێتەوە كە دوو منداڵی زۆر جونیان پێیە ئەویش دەزانێ هی خۆیەتی بۆیە هەردوو خوشكەكەی دەكوژێت و منداڵەكانیان لێ دەستێنیتەوە و دەچێتەوە لای كوڕە پاشا و دوو منداڵەكە بەخێو دەكەن و ژیانێكی خۆش بەسەر ئەبەن .**

***ئەم حەكایەتە لێرە زۆر بە كورتی و خراپی گێڕدراوەتەوە، ئەمەش هۆی ئەوەیە كە هەموو كەس هی ئەوە نییە حەكایەت بگێڕێتەوە، هەموو كەسیش هی ئەوە نییە حەكایەت كۆكاتەوە .**

# کوڕە کەچەڵ

**کۆکردنەوە: حەمـید ئەحمەد حـەسـەن**

**گێڕانەوەی: حەمە عەلی ئەحمەد باوەخان**

ڕۆژێك لە ڕۆژان پاشایەك ئەبێت، ئەم پاشایە چوار کوڕی ئەبێت یەکێکیان کوڕێکی کەچەڵ و ناشرینە دایکی جیاوازە لەوسێیانەکەی تر پاشا پیر ئەبێت و نەخۆش ئەکەوێت و ئەکەوێتە حاڵی سەرە مەرگەوە لەم کاتەدا وەسیەت دەکات بۆ کوڕەکانی ئەڵێ: وەسیەت بێت، ئەگەر من مردم، دوای ناشتن و تەواو بونی تەعزیەکەم سێ شەو لەسەر یەك حەرەسی قەبرەکەم بگرن، تا بەیانی ڕۆژ ئەبێتەوە ئەنجا پاشا دەمرێت و پاش ناشتن و تازیەکەی، کوڕە کەچەڵ ئەچێتە لای براکانی و دەڵێ کوڕینە باوکم وەسیەتی بۆ کردین کەسێ شەو دوای مردنی ئێشکی قەبرەکەی بگرین، ئەوانیش دەڵێن بڕۆ دواوە کەچەڵەی پیسی ناشرین باوك هەر وەسیەتی ئەمێنێ. تێر و پڕی تێهەڵدەدەن بەڵام کوڕە دەڵێ من وەسیەتی باوکم هەر بەجێ دێنم کە شەو دادێت کوڕە کەچەڵە خۆی ئامادە دەکات تو بلأیەك لەگەڵ خۆی دەبات و لە نزیك قەبرەکەی باوکیەوە خۆی ماتە دەدات و سەیر دەکات، ئەوا ڕەش سوارێك لە دورەوە غار دەدات و بەرەو ئەو دێت کە نزیك قەبرەکەی باوکی دەبێتەوە کابرا دەڵێ ئەی پاشا قەبرت هەڵتەکێنم گۆڕ بەگۆڕت کەم چیت پێ نەکردم لە دنیا کابرا لە ماینەکە دادەبەزێ و دەست دەکات هەڵدانەوەی قەبری پاشا، کوڕە کەچەڵەکەش لەدوای فرسەتی لێ دەهێنێ و دەیکوژێت .

ماینەکەی و کەل و پەلەکەی دەباتەوە بۆ ماڵەوە ، دایکە پیرەیەکی دەبێت دەڵێ: دایە ئەم کەل و پەلانە باش قایم کەو هەڵیان گرە و ئەو ماینەش کاو دانی بدەرێ، مەهێڵە کەس بیبینێ تا ئەو کاتەی کە خۆم پێویستیم پێی دەبێت دیسان دووەم شەو ئەچێتەوە ئێسك قەبرەکەی باوکی دەگرێت تەماشا ئەکات ئەوا کەوە سوارێکی لە دوورەوە دێت کە نزیك بووەوە، ئەڵێ: ئای پاشا

گۆڕ بە گۆڕت کەم شەرت بێ ئێستا لە تۆڵەی براکەمدا گۆڕەکەت هەڵتەکێنم و ئێسقانەکەت دەرخواردی سەگ بدەم. کابرا دەست دەکات بە هەڵکەندن و دێرانەوەی قەبری پاشا کوڕە کەچەڵە فرسەت لە میش دێنی لە دواوە توێلاّیەك لەسەری کابرا دەدات و هەناسەی لێ ئەبڕێ و دەمرێ .

ماینەکەی و کەل و پەلەکەی دەباتەوە دەڵێ بە دایکی کە بیانپارێزێت و باش ئاگای لێیان بێ، بە هەمان شێوە سێیەم شەویش کوڕە کەچەڵە ئێشکی قەبرەکەی باوکی دەگرێ و تەماشا دەکات وا بۆرە سوارێك لە دورەوە دێت کە نزیك دەبێتەوە ئاگر و شەڕی لێ دەبارێ دەڵێ: ئەی پاشا شەرتە نەیەڵم بە مردویش ئیسراحەت کەی، دەست دەکات بە هەڵکەندن و دێرانەوەی قەبرەکەی پاشا، کوڕە کەچەڵە فرسەت لە ئەمیش دێنێ و دەیکوژێ .

ئەسپەکەی و کەل و پەلەکەی دەباتەوە دەیداتە دەست دایکی کوڕە کەچەڵە هەرسێ شەوەکە ئێشکی قەبرەکەی باوکی گرت و وەسیەتەکەی بەجێ هێنا بەلاّم براکانی تری زۆر گاڵتەیان پێ کرد کەچەڵی پیسە شێت بووە هەقە لە ئاوایی دەری بکەین .

پاش ماوەیەك دەنگ و باس لەناو شارا بلاّو ئەبێتەوە دەڵێن: پاشای فلاّنە شار سێ کچی جوانی هەیە و هەرسێکیانی خستوەتە ڕەهنەوە واتە بە مەرج و گرەو بردنەوە دەیان دات بە شوو مەرجەکەشی ئەوەیە چاڵێکی قوڵی هەڵکەندوە کە (40) گەز قوڵی و درێژیەکەیەتی (40) گەزیش پانە، هەرکەسێ بتوانێ بە سواری ماینەکەی بازبدات بەسەر ئەو چاڵەدا ئەوا کچەکەی خۆی لێ مارە دەکات . هەروەها پاشا لەو لای ئەو چاڵەوە شورایەکی کردووە بۆ ئەوەی هەر کەس توانی باز بدات دوای بازەکە نەڕوات تا پاشا چاوی پێدەکەوێ قسەی لەگەڵ دەکات ، بۆ ئەوەی بزانێ ئەو کەسە لە چ بنەماڵەیەکی خانەدانە یا کوڕی چ پاشایەکە ، هەروەها سێ ڕۆژی دیاری کردووە کە هەر ڕۆژەی چەند کەسێ باز بدات تا یەکێ دەتوانێ گرەوەکە دەباتەوە .

خەڵکیش هەمووی لەم لاو ئەو لا دێن بۆ تەماشا کردنی ئەم شتە عەجایبە کە هێشتا شتی وایان نەدیوە، براکانی کوڕە کەچەڵەش ئەمە ئەبیستن خۆیان بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە دەکەن، بە چاکترین ماین و کەل و پەلی تەواوەوە .

کوڕە کەچەڵیش ئەچێتە لای براکانی و دەڵێ: توخوا ئەسپێ، ماینێ، کەرێ، شتێکیش بدەن بە من، با منیش لەگەڵتانا بێم بەشداری ئەو گرەوە بکەم ئەوانیش دەڵێن بڕۆ ئەو لاوە هەی پیسی کەچەڵ بزانە حەیاو شەرەفمان نابەی بڵێن ئەمە برای ئەوانە. کوڕە کەچەڵەش زۆر ئەپاڕێتەوە لێیان تا برا گەورەکەی دڵی نەرم دەبێت و دەڵێ قەیناکا کەرێکی بدەنێ با بەتەکە تەك دوامان کەوێ ئەنجا ئەوان بەڕێ دەکەون کوڕە کەچەڵەش سواری کەرەکە ئەبێت و ئەڕوا لە دوایان کەمێك لە ئاوایی دوور کەوتەوە کەرەکە ئەباتە سەر کەندێکی بەرز و پاڵی پێوە دەنێ تا ئەکەوێتە خوارەوە ملی دەشکێ .

بە عەجەلە ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵ ئەڵێ: بە دایکی تامن ماینە ڕەش زین ئەکەم تۆش ئەو کەل و پەلانەم بۆ حازرکە، پاشان خۆی دەگۆڕێ، دەم و چاویشی هەڵئەبەستێ بۆ ئەوەی کەس نەیناسێتەوە، بەڕێ دەکەوێت بەرەو ئەو شوێنە کە دەگاتە ئەوێ تەماشا دەکات ئەڵێ ڕۆژی حەشرە! ئەوەندە قەرەباڵغە ئەمیش نزیك دەبێتەوە لە چاڵەکەو ماین تاو دەدات کە گەیشتە لێواری چاڵەکە ئەدا لە هاوزنگی ماین، ماین باز دەقە دەبەستێ و لە چاڵەکە، ئەپەڕێتەوە لەوسێ کچەی پاشا کە دانیشتوون گەورەکەیان دەخاتە پشت کۆی خۆی و کلاو جامانەی یەکێك لە براکانی دەفڕێنێ و لە شوراکەش ڕاناوەستێ و تێ دەپەڕێ و ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە ئەڵێ بە دایکی، ئەم کچەم بۆ خزمەت بکە با کەس نەیبینێ و لای کەسیش باسی مەکە. ئێوارە کە براکانی ئەگەڕێنەوە کوڕە کەچەڵە ئەچێتە لایان و پێیان دەڵێ ها چیتان کرد؟

ئەوانیش ئەڵێن هەی کەچەڵی پیس، سوارێك هات و کچەکەی برد و کلاو جامانەیەکی ئێمەشی فڕاند و بردی. بەڵێ هاوڕێی تۆ بوو مەگەر تۆ ئەوەندە ئازا بیت . خۆزگە ئەو سوارە کەسێکی نزیکی ئێمە دەبوو. دیسان ڕۆژی دووەم دێت و ئەوان خۆیان ئامادە دەکەن و کوڕە کەچەڵەش ئەچێتە لایان ئەڵێ بەشکوم شتێکم بدەنێ منیش پێی بێم بۆ ئەوێ؟ پێی دەڵێن کەچەڵی گول تۆ چیتە لەم بەزم و ڕەزمە، ئەگەر تۆ بێیت حەیا و شەرەفی ئێمەش دەبەی ، ئەڵێن بە خزمەتکارێك قەیناکە (یابوە) کوێرەکەی بدەنێ با بێت براکانی دەڕۆن ئەمیش بە تەکە تەك ئەڕوا لە شوێنیان تا پشت ئاوایی ئەگاتە

شاره زەردەواڵەیەك و دەیئاڵسکێنیٚ لە (یابوە) کوێرەکە ئەوەندە زەردەواڵە پێوەی ئەدەن ئەئاوسێت و ئەبێتە یەکانە.

کوڕە کەچەڵە ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و ئەڵێ دایە کەل و پەلم بۆ حازر بکە تا دایکی حازریان دەکات ئەمیش ماینەکە زین ئەکات و سواری ئەبێت و ئەڕوات بەرەو ئەو شوێنە ئەم جارەشیان کە نزیك دەبێتەوە ئەسپەکەی تاو دەدات لە لێواری چاڵەکە ئەدا لە هۆزەنگی ماین بازدەقە ئەبەستیٚ و بەسەر چاڵەکەدا ئەپەڕێتەوە غار دەدات تا دەگاتە بەردەم کچەکانی پاشا ، کچی ناوەڕاستیان هەڵدەگرێت و دەیخاتە پشت کۆی خۆی، دیسان کلاّ و جامانەیەکی تری برایەکیان دەفڕێنیٚ و دەڕوات، کە ئەگاتە ماڵ ئەڵێ بە دایکی کەل و پەلەکانی بۆ هەڵبگرێت و ئەو کچەش بە جوانی خزمەت بکات، دیسان ئێوارە براکانی دەگەڕێنەوە دەڕوا بۆ لایان دەڵیٚ ها چی بوو؟ .

ئەوانیش دەڵێن: کەچەڵی عەبوس سوارێکی ئازا هات و کچێکی پاشای برد و یەکیٚ لە کلاّ و جامانەکانی ئێمەشی برد ، بەڵێ مەگەر تۆ ئەوەندە زیرەك بی خۆزگە سوارەکە کەسێکی نزیکی ئێمە دەبو ئیتر باوکمان بوایە یا برا یا ئامۆزا بۆ ئێمە هیچ فەرقی نەبوو.

کوڕە کەچەڵەش دەنگ ناکات، دیسان ڕۆژی سێیەم دێت و ئەچێتە لای براکانی و ئەڵێ شتێکم بەنیٚ با منیش بێم بەشداری گرەوەکە بکەم، ئەوانیش بە خزمەتکار دەڵێن کە هێسترە شەلەکەی بەنیٚ ئەوان بەڕیٚ ئەکەون و دەڕۆن ئەمیش هێسترەکە دەباتە دوری ئاوایی بەرەلاّی دەکات بۆ ئەوەی گورگ و چەقەڵ بیخۆن، دەگەڕێتەوە دایکی کەل و پەلی بۆ ئامادە دەکات و ماینە بۆ زین دەکات و سواری دەبێت و دەڕوا تا دەگاتە ئەویٚ ماین تاو دەدات و نزیك لێواری چاڵەکە پیٚ دەدا لە هۆزەنگی ماین باز دەقە دەبەستیٚ و دەپەڕێتەوە ئەمجارەیان کچە بچوکی پاشا ئەخاتە پشت کۆی خۆی و کلاّ و جامانەی ئەم برایەیان کەماوە ئەمیش دەفڕێنیٚ و دەڕوات تا دەگاتە ماڵەوە. ئەمجا کچەکە دەداتە دەست دایکی و کەل و پەلەکانیش قایم دەکاتەوە ، ئێوارە براکانی ئەگەڕێنەوە پێش ئەوەی بچێتە لایان، مەڕێك سەر دەبڕێت لە ژورێك دا خوێنەکەی بلاّو ئەکاتەوە لەو ژورەدا و مەوجێك دەدات بە مەڕەکەدا و دایکی

له مەسەلە تێدەگەیەنێ و پاشان دەچێتە لای براکانی و دەڵێ ئێوارە لەماڵی من دەعوەتن. ئەوانیش ئەڵێن: تۆ ماڵت لەکوێ بوو کەچەڵی پیس. ماڵەکەت وا بەسەر پشتە و ئەویش ئەڵێ ئەبێ هەر بێن چونکە پیاوێکم کوشتوە دەبێ بیشارینەوە ، خوێنەکەی نێیەتە سەرمان ئەڵێن بەخوا جوانە بۆ ئەمەشمان پێ ناکەی، هەر ئەمە مابوو بیکەین، برۆ دەرەوە کەچەڵی گەڕی پیاو کوژ تۆ هەر برای ئێمە نەبووی کوڕەش ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە .

ماوەیەکی پێ دەچێ دایکی دەڵێ : ئەمجارە من دەچمە لای براکانت تۆش لەماڵ بچۆرە دەرەوە ئێوارەیەکی درەنگ بگەڕێرەوە. دایکی دەچێتە لای براکانی کوڕە کەچەڵ و پێیان دەڵێ ئێوارە دەعوەتن لە ماڵی ئێمە ئەوانیش دەڵێن قەیناکە مادام تۆ هاتووی قسەی تۆ ناشکێنین. بەڵام حەز دەکەین چاومان بەو کەچەڵەی پیسە نەکەوێت. دەکەونە ڕێ و دەچنە ماڵی کوڕە کەچەڵ و نانی ئێوارە حازر دەکرێ و پێکەوە نان دەخۆن. کوڕە کەچەڵ دوای نان خواردن سڵاوێك دەدا لە حازری و ئەوانیش سڵاوەکە دەسێنەوە. دوای کەمێ دانیشتن کوڕە کەچەڵ ئەڵێ : باشە ئێستا ئێوە نازانن ئەو سوارانە کێ بوون ؟ ئەوانیش ئەڵێن نەوەڵا کەچەڵ ئێمە چوزانین کێ بون .

ئەڵێ ئەو سێ سوارە هەر سێکیان من بووم ئەهاتم کچەکانم ئەبرد و هەر جارەو کڵاو جامانەی یەکێکتانیشم ئەبرد ئەوە ناونیشانی بێ، ئەوانیش پێی دەڵێن کوڕە هەی کەچەڵی ناشیرن بەس درۆ بکە تۆ ماینی وا باشت لە کوێ بو لە کوێت هێنا ؟ کوڕە کەچەڵەش دەڵێ: لە بیرتانە باوکم کاتی خۆی وەسیەتی کرد کە سێ شەو ئێشکی قەبرەکەی بگرین ، منیش وەسیەتەکەیم بەجێ هێنا هەر شەوێك سوارێك دەهات قەبرەکەی باوکم هەڵتەکێنێ منیش دەمکوشت و ماین و کەل و پەلەکەیم ئەهێنایەوە، هەرسێ، شەوەکە بەو نەوعە سوارێك دەهات و منیش دەمکوشت. ئێستا ئەگەر باوەڕ ناکەن هەستن با شتەکانتان پیشان بدەم ئەیان بات هەرسێ ماینەکەیان پشان دەدات و پاشان هەرسێ کچە پاشاشیان پیشان دەدات و هەر سێ کڵاو و جامانەکەی خۆشیان دەداتێ و دەڵی ها ئەوە کڵاو و جامانەکانتانە بیکەنە سەرتان.

ئەمجا هەر باوەڕ مەکەن ئەوانیش واقیان وڕ دەمێنیٚ و نازانن چی بڵێن! ئارەقەی زەرد و سور دەردەدەن لە شەرمانا ئەڵێن : کەچەڵە گیان ئێمە کردمان تۆ نەیکەیت، پیاوی چاك بە، ئێمە دەرحەقی تۆ زۆر خراپ بووین، لێمان خۆش بە.

کوڕە کەچەڵ وەك براکانی نا پیاو نابێت ، ئەڵیٚ هەرسێکتان خۆتان ئامادە بکەن بۆ بەیانی ئەچینە خزمەت پاشا و هەر سیٚ کچەکەشی ئەبەینەوە لەگەڵ خۆماندا ، بەیانی بەڕیٚ دەکەون و ئەگەنە ئەو شارەی کە پاشای لێیە ئەچنە لای پاشا و کوڕە کەچەڵە حاڵ و مەسەلەکەی بە جوانی بۆ دەگێڕێتەوە پاشا تیٚ دەگات ، پاشا دەڵیٚ مادام تۆ ئەوەندە ئازا و پاڵەوان بویت و توانیت ئەو گرەوە ببەیتەوە پاشانیش ئەوەندە داوێن پاك بویت ئەو کچانەت تەسلیمی من کردەوە ئەمر بکە با پاشاش ئەمری تۆ جیٚ بەجیٚ بکات، کوڕە کەچەڵەش دەڵیٚ قوربان ئەمەویٚ ئەم سیٚ کچەت مارە بکەی لەو سیٚ برایەم ، پاشاش کارەکە جیٚ بەجیٚ دەکات و حەوت شەو و حەوت ڕۆژ شاییان بۆ دەکرێت و پاشا کوڕە کەچەڵە ئەکاتە وەزیری دەستە ڕاستی خۆی . کوڕە کەچەڵە و هەرسیٚ براکەی دەکەونە خێر و خۆشی . کەوشم دڕا هیچم پیٚ نەبڕا و هەروا بە دەست بەتاڵی هاتمەوە .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: ئەوەی ڕاستی بیٚ ڕەگەزێکی ڕاستوخۆی نییە، بەڵام، چیرۆکەکە پڕە لەو کارومەرجانەی کە بەردەوام لە ئەفسانە دووبارە دەبنەوە. سیٚ براو، شەوی سەر قەبرانی باوك و ئەسپی خۆش بەزو خۆش تەڕاد...**

# دەنكە هەنارە

کۆکردنەوە: دیمەن ناسیح محەمەد
گێڕانەوەی: نیهایەت یوسف حەسەن

هەبوو نەبوو، کابرایەك هەبوو، دوو کچی هەبوو، لە دایکیان جیا بوون واتە یەکێکیان دایکی نەبوو، ڕۆژێکیان ئەو کچەی کە دایکی نەبوو چووە سەر کانی ویستی خۆی بشوات لەو کاتەدا بایەك هەڵی کردوو پارچەیەك خوری کەوتە پێشی ، هەڵی گرت و بردی بۆ ناو ئەشکەوتێ، سەیری کرد پیرەژنێ لەوێیە خوری ئەڕێسێ کچەکە وتی: ئەوە خوریەکەتە، پیرەژنەکەش زۆر دڵی پێ خۆش بوو، وتی: وەرە پرسیارێکت لێ بکەم من جوانترم یان دایکت؟ کچەکەش وتی: تۆ لە دایکم جوانتری، پیرەژنەکە زۆری پێ خۆش بوو، پیرەژنەکەش سحرباز بوو بە کچەکەی وت: ئەگەر ئاوێ ڕەش هات خۆت مەشۆ و مەچۆ ناوی بەلاَم ئەگەر ئاوێ سپی هات بچۆ ناوی! کچەکە پیرەژنەکەی بەجێ هێشت و ئاوێ ڕەش هات خۆی نەشوشت بەلاَم کاتێ ئاوە سپیەکە هات خۆی شوشت ئینجا زۆر جوان بوو، چووەوە ماڵ زڕ دایکەکەی و خوشکەکەی زۆریان پێ ناخۆش بوو، کە کچەکە (بێ دایکەکە)زۆر جوان بووە، لێیان پرسی بۆ وا جوان بویتە؟ ئەویش مەسەلەکەی بۆیان گێڕایەوە، کچەکەی تر ویستی وەك ئەو جوان بێ ئەویش چوو بۆ سەر کانی بۆ خۆ شوشتن بە هەمان شێوە پیرێژنەکەی بینی پیرێژنەکە پرسیاری لێ کرد وتی: من جوانترم یان دایکت؟ کچەکەش وتی: دایکم جوانترە لەتۆ، پیرێژنەکەش پێی ناخۆش بوو وتی: ئەگەر ئاوێ سپی هات خۆت مەشۆ بەلاَم ئەگەر ئاوێ ڕەش هات خۆت بشۆ کچەکە بە قسەی کرد و چووە ناو ئاوە ڕەشەکەوە خۆی شوشت کاتێ دەرهات چووەوە ماڵ هەموو دەموو چاوی دومەڵ بوو، لەبەر ئەوەی (ناوی) کچەکەی کە یەکەم جار خۆی بە ئاوە سپیەکە شوشت و زۆر جوان بوو ناویان نا (دەنکە هەنارە)چونکە وەکو دەنکە هەنارە سور و جوان بوو، بەلاَم کچەکەی تر کە

دووەم جار خۆی بە ئاوە ڕەشەکە شوشت ناویان نا (دوگنە چارە) چونکە دوومەڵەکە زۆر ناشیرینی کردبوو .

ڕۆژێکیان کوڕە پاشایەك هەبوو زۆر حەزی لە تۆپێن بوو لە پێشماڵی دەنکە هەنارە یاری ئەکرد، تۆپەکەی کەوتە ماڵی دەنکە هەنارەوە دەنکە هەنارە تۆپەکەی بۆ فڕێ دایەوە، کوڕە پاشا دەنکە هەنارەی بینی دڵی چووە سەری و کوڕە پاشا چووەوە ماڵ بە پاشای وت دەبێ ئەو کچە جوانەم بۆ بخوازی، پاشا چوو بۆ داخوازی دەنکە هەنارە باوکی دەنکە هەنارە ڕازی بوو بەڵام لێرە ماڵی کچەکە فێڵیان لە کوڕە پاشا کرد وتیان: دەنکە هەنارە زۆر جوانە زۆر کەس بۆ داخوازی دێ هەر ئەدرێتە شوو بەڵام (دوگنە چارەی) کچیان ناشیرینە کەس نایەتە داوای بۆیە بڕیاریان دا کە دوگنە چارە بدەن بە کوڕە پاشا . ڕۆژی ئاهەنکەگە دوو مەڵەکانی دوگنەچارەیان بڕی و تارایەکیان دایە بان سەریا و ناردیان بۆ کوڕەکە لەو کاتەیە دەنکە هەنارەیان لە پشت کەندو شاردبۆوە دەنکە هەنارە دوعایەکی کرد ووتی: خوایە بمکەیتە کەڵە شێرێ لەسەر سەربانی ماڵی کوڕە پاشا بقوقێنم .

لەو کاتەی بەڵام (دوگنە چارەی) هاتە ژووری ماڵی کوڕە پاشا، کوڕەکە نەیزانی ئەوە دوگنە چارەیە کوڕەکە چووە لای دوگنە چارە لەو کاتەیە کەڵە شێرەکە (دەنکە هەنارە) قوقاندی: (قو قو قوقو قو دوگنە چارەیان دا بە شوو دەنکە هەنارەیان خستە پشت کەندوو) سێ جار وای وت بەڵام گوێیان نەدا پێی وتیان: ئەم کەڵە شێرە چییە بێنن سەری بڕین، سەریان بڕی و ئێسکەکەیان فڕێ دایە سەر زبڵدان ئەو ئێسکە زۆر جوان بوو هەر بریقەی ئەهات ڕۆژێکیان پیرێژنێکی تر شتی خڕ ئەکردەوە لەسەر زبڵدان ئەو پارچە ئێسکەی هەڵگرت و بردیەوە ماڵ و نایە پشت دەرگای ماڵی خۆیان، کە چووە دەرەوە بۆ شت خڕ کردنەوە کە ئەهاتەوە پێش ئەوەی بێتە ماڵەوە ئێسکەکە (بۆ تەوە دەنکە هەنارە)خۆی ئەشاردەوە کە ئەهاتە ماڵەوە سەیری ئەکرد ماڵەکەی زۆر پاك و خاوێن و ڕێکە. پیرەژن سەری سوڕ ئەما ئەیووت: باشە ئەم ماڵە بۆ وا پاك و خاوێنە من ئەوها بەجێم نەهێشتووە، ڕۆژێکیان ویستی بزانێ ماڵەکەی چۆن وا پاك ئەبێتەوە لەکاتێکا ئەو بە پیسی بەجێی دێڵێ

پیرێژنەکە خۆی ئەشارێتەوە لەو کاتەیا کچێك ناو ماڵەکەی بۆ پاك ئەکاتەوە پێرێژنەکە خۆی کرد بە ژوورا و وتی: ئەوە تۆ کێ و لە کوێوە هاتووی؟ کچەکەش وتی: من کەسم نییە وە مەسەلەکەی لە یەکەمەوە بۆ باس کرد هەرچی بەسەر هاتووە ئینجا پیرێژنەکە کردی بە کچی خۆی .

دوایی پیرێژنەکە دەنکە هەنارە ئەباتەوە ماڵی پاشا و هەموو شتێکیان پێ ئەڵێت بۆیە کوڕە پاشا بەڵام (دوگنە چارەی) دەرئەکات و دەنکە هەنارە شوو بە کوڕە پاشا ئەکاتەوە، ماڵی پاشا ماڵی باوکی دەنکە هەنارە دەرئەکەن لەوێ ئینجا ژیانێکی خۆش ئەبەنە سەر و مناڵیان ئەبێ. ئیتر ڕۆژێك باوکی دەنکە هەنارە، بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆیان و دوگنە چارە بکاتەوە شێوەی خۆی ئەگۆڕێ و خۆی ئەکا بە فەقیر و ماڵ بە ماڵ ئەگەڕێ و ماڵی دەنکە هەنارە ئەدۆزێتەوە دەنکە هەنارە نازانێ ئەمە باوکێتی بەڵام باوکی ئەیناسێتەوە و باوکی دەنکە هەنارە ئەڵێ: ئەم شەو ئەتوانم بمێنمەوە لێرە ئەوانیش ئەڵێن گوناحە با بمێنیتەوە، شەو ئەمێنێتەوە هەموویان ئەخەون باوکی دەنکە هەنارە منداڵەکەی دەنکە هەنارە لەناو لانك سەر ئەبڕێ و ئەڕوا. ئیتر دەنکە هەنارە بەیانی ئەڵێ ئەبێ بۆ مناڵەکەم لەخەو هەڵنەسێ کاتێ سەیر دەکات منداڵەکەی سەر بڕاوە زۆر بۆی ئەگرییێت بەڵام دوایی یەکێك دێنن کە لەو شتانە شارەزایە سەری مناڵەکە بە جیقنە چاك ئەکەنەوە و ماڵی کوڕە پاشا ماڵی باوکی دەنکە هەنارە ئەدۆزنەوە تۆڵەیان لێ ئەکەنەوە و بۆ هەتا هەتایە بە خۆشی ژیان ئەبەنە سەر .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: خۆشتن لە ئاوی سپی و جوان بوون خۆشوشتن لە ئاوی رەش و دو مەل دەردان و دوعا کردن و بوونە کەڵشێر و ئێسکە کەلەشێر دەبێتەوە دەنکە هەنار و چاکردنەوەی سەری بڕاو بە جیقنە.**

# ئەحمەد

**کۆکردنەوە: دیمەن ناسیح محەمەد**

**گێڕانەوە : تەنکە حوسێن حەسەن**

**هەبوو نەبوو، سێ برا هەبوو، ناویان: ئەحمەد و مەحەمەد و مەحمود بوو بە نۆرە یەکیان شۆڕ ئەکردەوە بۆ ناو بیرێك. نۆرە گەیشتە سەر ئەحمەد ئەحمەد خۆی وتی: ڕام مەکێشن دوایی زۆر هاواری کرد ڕایان نەکێشا ئەمجا گوریسەکەی ئەحمەد کەوتە بن حەوت تەبەقەی ئەرزەوە ئەمجا ئەحمەد چاوی بە کچێك کەوت، دێوێ سەری نابوە ناو باوەشی کچەکەش باوەشێنی ئەکرد ئەحمەد زلەیەکی لە دێوەکە دا دێوەکەش بە کچەکەی وت: بۆ ئەهێڵی مەگەز بمخوا، ئەحمەد بە کچەکەی وت: بۆ باوەشێنی ئەکەی؟ کچەکەش بە ئەحمەدی وت: ئەم دێوە منی بردووە ڕاکە هەتا چل براکەی نەهاتوونە ئەحمەد دێوەکە ئەکوژێ و ڕا ئەکا چونکە چل براکەی دێن بەلاّم پێش ئەوەی بڕوا کچەکە پێی ئەڵێ: ئەحمەد بڕۆ دوو بەران وا شەڕ ئەکەن یەکێ سپی و یەکێ ڕەش خۆت هەڵدە سەر سپییەکە ئەتباتەوە سەر زەمین، کاتێ ئەحمەد خۆی فڕەدا بۆ سەر سپییەکە کەوتە سەر ڕەشەکە حەوت تەبەقەی دیکە بردییەوە ژێر زەمین، لەوێ ئەچێتە دێیەك چووە ماڵی پیرێژنێ وتی: پورێ تۆزێ ئاوم دەیە تینومە پیرێژن پێی عەیبە بڵێ ئاو نییە بەڵکو شتی تری پێ ئەدا و کوڕە خواردی وتی: ئەم ئاوە بۆ سوێرە؟ ئەویش وتی: کوڕم چیت لێ بشارمەوە ئەوە ئاو نەبوو شتێ تر بوو لەبەر ئەوە ئەژدیهایێ بەری ئاوەکەی گرتووە هەتا هەفتەی جارێ کچێکی گەنج نەخوا ئاومان ناداتێ ئەمڕۆ نۆرەی کچی پاشایە، کوڕەش وتی: من ئەڕۆم ئەی فەوتێنم، ئەحمەد دەسی دایە شیرەکەی چوو بۆ لای ئەژدیهاکە کچی پاشا هات بە ئەحمەدی وت: ڕێم دە نۆرەم هاتووە با بمخوا، دوایی باوکم لێم ئەدا، کچەکەش سینیەك خواردنی پێیە بۆ ئەژدیهاکە، ئەحمەد سینیەکە لە کچەکە ئەسێنێ شمشێرەکەی حازر ئەکا کە ئەژدیهاکە دەم ئەگرێتەوە بۆ خواردن ئەویش لە دەمیەوە تا کلکی ئەیکا بە دوو لەتەوە ئینجا قوڕ و ئاو و خوێن تێکەڵ ئەبێ، کچی پاشا پەنجەیەك لە خوێن و قوڕاوەکە ئەدات لە پشتی**

ئەحمەد و نیشانەی ئەکا ئەمجا پاشا ئەڵێ : کێ ئەم ئازاییەی کردوە پاداشتی ئەدەمەوە؟ هەموو یەکێك لە خەڵکی ئاوایی ئەڵێ من کوشتوومە، کچی پاشا ئەڵێ: باوکە خۆم ئەزانم کێ کوشتوویەتی، نیشانەم کردووە کە کچەکە ئەحمەد بە باوکی نیشان ئەدا باوکی ئەڵێ: چیت ئەوێ لە ماڵ و لە زێڕ مەڕۆ لە ئەرز و کچ هەر چیت ئەوێ ئەتدەمێ؟ ئەحمەد ئەڵێ: هیچم ناوێ بەس بمبەوە سەر زەمین، پاشا ئەڵێ: بریا حەوت ساڵی تر کچمان بخورایە و بێ ئاو بووینایە بەس ئەم قسەیەت نەکردایە، پاشا بە ئەحمەد ئەڵێ: بڕۆ سیمرخێ هەیە لەسەر دارێکە هەموو جارێ بەچکە ئەکا بەچکەکانی بەراوەزە ئەبن حەزیایە دێ بەچکەکانی ئەخوا بڕۆ بزانە ئەو سیمرخە بتوانێ بتباتەوە سەر زەوی، ئینجا ئەحمەد ئەچێ ئەو حەزیایەش ئەکوژێ سیمرخەکەش دێت ئەڵێ: کێ ئەم حەزیایەی کوشتوە پاداشتی ئەدەمەوە، ئەحمەد ئەڵێ: هیچم ناوێ بەس بمگەیەنە سەر زەوی سیمرخەکە ئەڵێ: بەخۆزیایا حەوت ساڵی دیکە بەچکەم بخواریە بەس ئەم قسەیەت نەکردایە، بەڵام هەر ئەتبەم ئەڵێ: بڕۆ حەوت کوندە ئاو و حەوت کەلەش حەیوان بێنە، ئەحمەد ئەیانهێنێ و سواری باڵی سیمرخ ئەبێ ئەڕوا بەرە و سەر زەمین لە کاتێکا سیمرخ هەر ئەڕوا و ئەڵێ تینومە ئەحمەد کوندەیە ئاوی ئەداتێ ئەمجا ئەڵێ برسیمە کەلەشێ حەیوانی ئەداتێ لەڕێ خواردنەکەیان تەواو ئەبێ، سیمرخ ئەڵێ برسیمە ئەحمەد هەندێ لە ڕانی خۆی ئەکاتەوە و ئەیداتە سیمرخەکە، سیمرخ گۆشتی بنیادەمە سوێرە نایخوا لەبن زمانی دای ئەنێ کە ئەگاتە سەر زەمین ئەحمەد دا ئەبەزێ خوا حافیزی لەیەك ئەکەن ئەڵێ ئەحمەد بۆ ئەشەلی ئەڵێ قاچم سڕ بووە سیمرخەکەش ئەڵێ: بەخوا گۆشتی تۆیە لەبن زمانم ئەڵێ هابیدەوە لە ڕانت ئەحمەد ئەیداتەوە لە ڕانی و سیمرخەکە زمانێکی پیا دێنێ و چاکی ئەکاتەوە.

*ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: حەوت تەبەقەی زەوی، دێو، ئەژدیها، سیمرخ .

# سىٚ کچەکە

**کۆکردنەوە: دیمەن ناسیح محەمەد**

**گێڕانەوە : تەنکە حوسێن حەسەن**

**سیٚ کچ ئەبن، دایکیان ئەمریٚ، بە باوکیان ئەڵێن: باوکە ژن بێنە، باوکیان ئەڵیٚ: هەتا جل و بەرگەکەی دایکتان نەڕزیٚ ژن ناهێنم ئەمجا بێوەژنیٚ ئەڵیٚ: جل و بەرگەکان بێنن بۆ لای من بۆتان ئەڕزێنم چونکە ئەیویست شو بە باوکیان بکات جلەکانی دایکیان پڕ چەو و لم ئەکات ئەیخاتە عەرز هەتا ئەڕزیٚ ئەمجا کچەکان ئەڵێن: باوکە جلەکانی دایکمان ڕزا ژن بێنە باوکە ئەڵیٚ: کچەکانم کیٚ بێنم؟ ئەڵێن فلاْن بێوەژن بێنە هەر ئەوەندەی خۆشە هەتا ئەیگوازنەوە ئەمجا ژنە ئەڵیٚ: یان من نامێنم یان کچەکان لەمماڵە نامێنن ئەمجا باوکەش بە ناچاری هەر سیٚ کچەکەی ئەبا بۆ ئەو دەشتە، ئەڵیٚ: کچەکانم با بڕۆین بۆ دار هەتا دەنگی تەورەکەی من هات ئێوە دار بکەن ئەوسا خۆم بانگتان ئەکەمەوە ئینجا باوکی (قامیشەکی)هێنا میرویەکی پێوە کرد هەر دەنگی ئەهات وایان ئەزانی دەنگی تەورەکەی باوکیانە دار ئەبڕیٚ بەلاْم شەویان بەسەرا هات باوکیان هەر دیار نەبوو ئەمجا گورگ هات ئەوانیش چوونە سەر دارێك بۆ بەیانی گورگەکە ڕۆیشت ئەوانیش کونێکیان لە ئەرز هەڵدڕی و بە پەیژە چوونە خوارەوە ماڵێکی زۆر خۆش بوو پڕ بوو لە کەندووی گوێز و مێوژوو هیزەڕۆن دانرابوو هەموو جۆرە خواردنێکی تیابوو بۆ خۆیان تێریان خواردوو دوایش دێوەکە هاتەوە وتی: بۆن دیٚ بۆنی بێگانان دیٚ لەم دەورو بانان دیٚ ، کچەکان خۆیان لە پشت کەندو شاردەوە بەیانی دێوە هەستا نان بکا ئینجا کچەکان هێرشیان کردە سەری و فڕێیان دایە ناو تەندورەکە دێوەش وتی: مادام وای لێهات ها ئەوە کلیلی حەوت غورفە ئینجا دێوەش سوتا و کچەکان غورفەکانیان کردەوە هەر غورفە و شتێکی تیابوو وەك ماین و کوڕی چواردە ساڵ و .... دوایش شویان کرد بە کوڕی پاشا و میر.**

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: دێو، دنیای ژێر زەوی .**

# مۆڕی

**کۆکردنەوە : روقیە عەبدولفەتاح**

**گێڕانەوەی : مـەلا عـەلی کاکیل**

ئەو حیکایەتەی کە بۆتان باس دەکەم. باسی کچێکی لێ قەوماو دەکات کە ژنێکی جیرانیان ئەشقی باوکی ئەم ماڵە دەبی . ئەو ژنە دەزانێت کە دایکی ئەم کچە نەماوە و ئەوجا خۆی لەگەر تاقە کچەکەی ئەو پیاوە دەکاتە برادەر و پێی دەرێ کە بابی تۆم زۆر خۆش دەوێت، هەروەها تۆشم زۆر خۆش دەوێت، ئەگەر تۆ ڕازی ببی بێمە ماڵی ئێوە و خزمەتی تۆ و بابت بکەم . کچەکەش کە زۆر ژنەکەی خۆش دەویست و زۆریش لەگەڵی باش بوو پێی خۆش دەبێت و ڕۆژێك بەبابی دەرێت ئۆ باوە لۆ ژنی نایەنی کە خزمەتی خۆت و من بکات بابەکەش دەرێ : کچەم ئاخر من سوندم خواردیە کە هەتاکو جلکەکانی داکت کە لەناو سندوقم دانایە نەبنە خۆر قەد ژن نەینم! کچەکەش بە ژنەکە ڕادەگەیەنیت و پێی دەرێ کە بابم وای گۆتیە ژنەکەش لە بیری خۆیدا دەرێ شتی وا ممکین نییە، مەگەر بەیەك جۆر نەبیت . لەگەر کچەکە دەچیتە ماریان و ڕۆژێك کە بابی لە مار نابیت دەچیتە زگ سندوقەکە و بە چەکوش ئەوەندە لە جلکەکان دەدات تاکو ورد ئەبن و وەکی خۆری لێ دێت ئەوجا دەیان کاتە ناو سندوقەکە و دەڕواتەوە ماریٚ خۆی ئەوجا کچەکەش پاش چەند مانگ و سارا بەبابی دەرێ ئۆ باوە ئەوە چەند سارە کە دایکم مردیە دەبا بچینە زگ سندوقی جلکی داکم بزانین جلکەکانی داکم نەبووینە خۆر وەکی تەماشا ئەکەن ئەبینن وەی لێ هاتییە و هەموو بوینە خۆر . ئینجا کچەکە بەبابی دەرێ ئۆ باو وەرە جیرانی خۆمان بینە ئەو ژنە زۆر لە مێژە ئەتووی خۆش دەوێت و خاتری منیشی زۆر دەوێت. کابراش وەختی زانی گۆتی دەباشە باشترە هەر ئەو ژنە بینم چونکە خزمەتی کچیشم دەکات. ئەوجا تاکو شەش حەفت ساڵ تێ دەپەڕی وە ئەو ژنە و پیاوە دەبنە ساحێبی چەند کوڕ و کچ و فەرق و

---

[2] خەڵکی ڕەواندز بە باوکیان دەڵێن ئۆباو لەکاتی بانگ کردن و گاز کردندا .

جوایەزی ژنەکە لە بەینی مندارەکانی خۆی و کچەکە دەکات و هەموو ڕۆژێ ئاژاوە و عاجزی بۆ کچە غەریبەکە دروست دەکا و لێی دەدا و زۆر نەفرەت و ڕکی لە کچەکە هەر دەستی ، پاش ڕۆژەك کە مێردی بەسەفەر دەچی بە فێڵەك کچەکە دەباتە دەرێ هەتاکو لە دەستی خەلاس بیت . مندارەکانی خۆی و کچەکە دەباتە دەرێ و لە دەو ڕووبارەکی پیس دەوەستن مندارەکانی ژنەکە داوای ئاو دەکەن هەموویان زۆر ماندینە، بەلاّم ژنەکە گۆسکەکی کە لەدەست دایە پڕ لە ئاو دەکا و مارەکی گچکە، دەکاتە ناو گۆسکەکە و پێشتر دەداتە کچەکە بیخواتەوە مندارەکانی ژنەکە کە زۆر هیلاك و تێنیانە دەگریەن و داوای ئاو لە داکیان دەکەن بەلاّم ژنەکە لەسەریان دەقیڕێنیت و پێیان دەرێت وس بن خوشکی گەورەتانە دەبی ئەو زووتر لەنگۆ ئاوی بخواتەوە کچەکەش بەسەر سوڕمان و لە تێنان ئاوەکە هەمووی دەخواتەوە و مارەکەش دەچێتە ناو زگی بەبیٚ ئەوەی ئاگادار ببیت.

ئەو مارە ڕۆژ بەڕۆژ لە زگی کچەکە گەورە و گەورەتر دەبی هەتا ڕۆژەکی کە بابی تیٚ ئەگا کچەکەی ڕۆژ بەڕۆژ دەگۆڕیٚ و بەژنی خۆی دەریٚ باشە ئەتوو لۆ ئاگات لە کچیٚ من نەبووە کە ئیو هەی لیٚ بیٚ کە من و بنەمارەی من و وەها سوك بکات؟ ژنەکەش بوختانی پیٚ ئەکات و دەریٚ هەرچی مەنعی کچی تۆم دەکرد بە قسەی نەدەکردم تاکو وای بەسەر هات. پیاوەکەش کچەکەی دەباتە دەشتیٚ کە بی کوژی بەرام دری پیٚ دەسووتیٚ و بەرەلاّی دەکا. کچە بەستە زمانەکەش هەر دەگریەت و فرمێسکان دەڕێژێت و چەند شەو و ڕۆژ پیٚ ئەچێت و هیچ نەبووە بخوات دەستی بۆ گیای دەور و بەری خۆی دەبات و لەبرسان دەیخوات لەپاش خواردنی ئەو گیایە سەر و دری تێك دەچی و دەڕشێتەوە و مارەکەش لە زگی دێتە دەریٚ و لەدەست ئەو کارەساتە ڕزگاری دەبیت و تازەش کچەکە تیٚ دەگا کەلۆچ ئەو ڕۆژەکەی ڕز داکی پێشتر ئاوی دایە وی بخواتەوە و زانی کە بە حیلە و حەوارەی ئەو بووە کە ئەو مارە چویتە زگی و تاکو لە دوور کاروانێك دەبینیت کە دێنە پێش دەبینی کە کوڕی پاشای لەسەر ئەسپی دانیشتییە، کە چاوی بەو کچە گەنج و جوانە دەکەوی لە ئەسپەکەی دێتە خواریٚ و قسەی لەگەر دەکات و کچەکەش هەموو کارەسات

و بەسەر هاتی خۆی بۆی دەگێڕیتەوە. کوڕی پاشاش ئەشقی ئەو کچە بەستە زمانە دەبێ و پێی دەڵێ هەر لێرە دانیشە تاکو بچم بابم و کەس و کارم خەبەر بکەم و بگەڕێمەوە ئەوجا دەڕوات، بەڵام کچە قەرەجەك لەپاش بەردەك خۆی دانووساندبوو و هەموو قسەکانی کوڕی پاشا و کچەکەی گوێی لێ بوو دێتە پێش کچەکە و پێلەقەك لە پشتەوە لە کچەکەی دەدات و دەسبەجێ کچەکە لەدەو ڕووبار دەبێتە دەسکە (ڕێحانێکی) جوان. ئەوجا خۆی لەجێی کچەکە دادەنیشێ تا کوڕی پاشا دەگەڕێتەوە کوڕی شاش بە دۆڕ و زوڕنا و کەس و کاری خۆی هاتیتە دوو کچەکە، کە دەبینێ کە کچێکی زۆر ناشیرین لەجێی ئەو کچە جوانە دانیشتییە پێی دەڵێ ئەتوو کێی وە دەڵێت من هەر ئەو کچەمە بەڵام نازانم لۆ چ وەهام لێ هات و ناشیرن بووم کوڕی شاش کە هەموو شتی حازر کردییە و لە شەرمی ئەوەی کە هەمووی ئاگادار کردینە لە ڕووی مەجبووری ئەو کچە لەگەڵ خۆی دەباتەوە ماڵێ.

بەرام پێش ئەوەی بچنەوە لە هێکڕا دەستی خۆی لۆ دەسکە ڕێحانە درێژ دەکا و دەسکە ڕێحانەکە لێ دەکاتەوە و دەیەوێ لەگەڵ خۆی ببات. بەلام کچە قەرەجەکە کە پێشتر دەزانی ئەو ڕێحانە هەر ئەو کچە جوانەیە دەڵێت بەخوا لەگەڵت نایەم هەتاکو ئەو دەستە ڕوحانە فڕەنەدەی ئەویش فڕەی دەدا و دەسکە ڕێحانە دەبیتە مەڕ! کوڕەکە مەڕەکە لەگەڵ خۆی دەبا، بەرام دیسان کچە قەرەجەکە وە جواب دێت و دەڵێ لەگەڵت نایەم تاکو سەری ئەو مەڕە نەبڕی. مەڕەکەش دەکوژیت، بەرام پشکە خوێنی ئەو مەڕە دەکەویتە سەر کراسی کوڕی پاشا، کچەکە دەڵێ لەگەڵت نایەم هەتاکو ئەو پشکە خوینە بە تەواوی نەشۆی و پاکی نەکەیەوە، خوینەکەش دەشوا و دەبێتە مۆریەکی سپی و جوان . مۆریەکە هەردەگریتەوە و بەرام دیسان کچە قەرەجەکە داوا لە کوڕی شا دەکا کە مۆریەکەش فڕە بدات ئەویش فڕەی دەدا و دەکەویتە پێش پێی خورامی کوڕی پاشا. خورامی کوڕی پاشا کە ئەوانەی هەموو لە نێزیك دیت زانی کە ئەو مۆریە حیکمەتەکی تێدا هەر هەیە. هەری دەگریتەوە و بۆخۆی دەباتەوە ماڵێ و دەنووی. سبەینێ زوو لەخەو هەردەستیت دەبینی مافورەکی دەستکری نەخشینی زۆر جوان و بە قیمەت لە ماری وی پان

کرایەتەوە دوو بەیانی و سێ بەیانی هەر دووبارە دەبێتەوە تاکو ماری پڕ لە مافوور دەبێت ئەوجا لە دری خۆی دا دەرێ باشە سەبەب چییە؟ کە هەموو شەوێ هەردەستم و مافوورەك لەماری من زیاد دەبێت شەوەك لەگەر داکی خۆی تا بەیانی دادەنیشی لە هێکڕا دەبینیت کە کچێکی زۆر جوان لەناو مۆریەی کە دای نایتە سەر دەلاقەی ژووری خۆی و دیار دەکەوی وەدەست بە چنینی مافوور دەکا کوڕەکە دەچیتە پێش و سەلامی لێ دەکا و پێی دەرێ باشە پێم بڵێ ئەتوو چیێ و لەماری من چ دەکەی؟ ئەی کچە جوان و بە خێر و بەرەکەت. کچەکەش کە دەبینی ئاشکرا بووە هەموو داستانی ژیانی خۆی و بەسەرهاتی بۆی دەگێڕیتەوە. بەرام کوڕە خورامەکە ئەوە ئاشکرا ناکات ڕۆژەك دەچیتە کن کوڕی شا و داوای لێ دەکا کە ئیتر حەز ناکات خورامەتی بکات. کوڕی شاش کە دەبینیت ئەو کوڕە هەژارە کە زۆر فەقیر بوو، بەرام ئێستا زۆر لێی بێ منەت بووە لەنانی ئەو، پێی دەرێت باشە من بە سێ شەرت دەست لەتوو بەر دەدەم بەو شەرتەی کە ئەو سێ شەرتانەم بۆ جێ بەجێ بکەی؟ شەرتی یەکەم ئەوەیە کە (دەبی مافوورەکم لۆ بکەی مەتر و نیوەك بیت و هەموو ئەو خەڵکەی ئەو شارە لەسەری دابنیشن و جێشیان ببیتەوە) دەچی و بە کچەکە ڕادەگەیەنیت و کچەکەش دەست بەجێ ئیشەکەی لۆ دەکات ئەوجا هەموو خەڵکی شارەکەش خڕ دەکاتەوە و لەسەر مافورەکە دادەنیشن کوڕی شا زۆر پێی عەجایب دەبیت. ئەوجا دەرێت شەرتی دووەمم ئەوەیە کە (وشیە ترێیەك کە ئەوەندە گەورە بیت کە هەموو خەرك لەو شارە لێی بخۆن و بەرام تەواویش نەبیت) ئەوەش بە کچەکە دەرێت و ئامادەشی دەکات. شەرتی سێیەمیشی ئەوە بوو کە (منداریکم لۆ بینە تازە لە دایك بوبیت قسەش بکات) کوڕە خورامەکە لەو شەرتە دەترسێت وا دەزانیت کە ئەو شەرتە بەو ئاسانیانە جێ بەجێ ناکرێت . بەرام هەتا شەرتی سێیەم بۆ کچەکە دەگێڕیتەوە دەرجێ کچەکە عەردی ژێر پێی خۆی هەردەکۆری و منداڵێکی کە تازە بووە دێنیتە دەرێ و دەباتە خزمەتی کوڕی شا و قسەشی بۆ دەکا ئەوجا کوڕی شا کەوای دەبینی چەقۆی خۆی دەرئەهێنێ و بە کوڕە خورامەکەی دەرێ ئەگەر ڕاستم لۆ نەرێی ئێستا بەو چەقوە دەتکوژمەوە . کوڕەکەش لە ترسا دەیباتە ماریێ خۆی

و مۆریەکەی پێشان دەدا ئەوجا کوڕەکە کە چاوی بە مۆریەکە دەکەوێت دەیناسیتەوە کوڕە خورامەکە داوا لە کچەکە دەکات کە بێتە دەرێ ئەوجا کوڕی پاشا کە چاوی بە کچە جوانەکە دەکەوێت دەیناسیتەوە و بە یەکتری شاد دەبنەوە دەیباتە مارەکەی و هەتا حەفت شەو و حەفت ڕۆژا شایی و دۆر و زوڕنا دەگەڕێت کچە قەرەجەکەش پێش کەشی خورامی خۆی دەکات .

**تێبینی:**

**لێرەدا دەبینین لە چیرۆکەکەماندا کە لەجیاتی خوێندنەوە (ل) بە شێوەزاری جیاوازی ناوچەی سۆران و دەورو بەری هەولێر (ر) بەکار هاتووە. بێجگە لە وشەی مار کە واتای گیانەوەر دەدات کەممکینە بە هەڵە بەواتای ماڵ تێی بگەین .**

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: کچەکەیە کە دەبێتە رەیحان و مەڕ و مۆری و دەبێتەوە کچە جوان و مافووری یەك مەتر و نیویی و شیە ترێ و مندالێکی ساوای قسەکەر دروست دەکات .**

# حەوت برا

**کۆکردنەوە: زانا سابیر ئیسماعیل**

هەبوو نەبوو، حەوت برا هەبوون، ڕاوچی بوون زۆر حەزیان دەکرد کە خوشکێکیان هەبێت ، کاتێك دەچن بۆ ڕاو دایکیان سکی هەیە، ئەوانیش بەدایکیان دەڵێن: ئەگەر کوڕت بوو ئەوا نایەینەوە تیرۆك و نان برێشك لەسەر ڕێگای سەرەکی بە دارەوە بکە ، و ئەگەر کچت بوو ئەوا نان برێشك و خوانە بە دارەوە بکە. بۆیە جیرانەکەیان بەمە دەزانیٚ کاتێك دایکیان کچێکی دەبێت نان برێشك و خوانە لەسەر ڕێگای سەرەکی بە دارەوە دەکات ، بەڵام جیرانەکەیان نان برێشك و خوانەکە ڵیٚ دەکاتەوە لەجێگای ئەو تیرۆك و نان برێشك بە دارەوە دەکات ، کاتێك حەوت براکە لە ڕاو دێنەوە دەبینن تیرۆك و نان برێشك بە دارەوە هەڵواسراوە ، بۆیە سەریان هەڵدەگرن و دەڕۆن.

دایکیان بە هیوای گەڕانەوەی کوڕەکانی دەمرێت و سەر دەنێتەوە ، بۆیە کچەکە لای خزمێکیان بەخێو دەکریٚ و گەورە دەبیٚ، جارێکیان کچەکە ناوی (فاتمە)خانە دەچێتە سەر ڕووبار بۆ ئەوەی گۆشت بشواتەوە قەڵە ڕەشێك دێتە بەردەمی و هەر (قیغە قیغ)دەکات. فاتمە خانیش هەر گۆشتی بۆ هەڵدەدات فاتمە بە قەڵە ڕەشەکە دەڵێت : قەڵیٚ حەوت برام هەیە ئەگەر تۆ بمبەیتە لای براکانم نیوەی گۆشتەکەت پیٚ دەدەم ، قەلە ڕەش ڕازی دەبیٚ ، بۆیە فاتمە خان هەر زوو بەشە گۆشتەکەی بۆ ماڵ دێنێتەوە و لێرەدا لەسەر پشتی قەلەکە دادەنیشیٚ و دەڕوا ، دەگاتە شارێك و لەسەر بانێك دای دەنیٚ، فاتمە خان بەقادرمەکە بۆ خوارەوە دێت و دێتە ناو ماڵەکە کە سەیر دەکا ماڵێکی زۆر بیٚ سەر و بەر و پیسە، بۆیە هەر زوو دەست دەکات بە پاك کردنەوەی ماڵەکە کاتێك کە حەوت براکە دەگەڕێنەوە دەبینن کچێکی زۆر جوانی شۆخ و شەنگ لە ماڵەکەیان دەبیٚ، زۆر سەرسام دەبن و دەپرسن تۆ کێی؟ ئەویش دەڵیٚ من خوشکی ئێوەم! ئەمانیش دەڵێن: ئێمە خوشکمان نییە ئینجا فاتمە خان

چیرۆکی خۆی بۆ هەر حەوت برا دەگێڕێتەوە کە چۆن جیرانەکەیان نان برێشک و خوانەکە لێ دەکاتەوە و تیرۆك و نان برێشك بە دارەکە هەڵدەواسێ، هەر حەوت برا زۆر خۆشحاڵ دەبن کە دەبینن خوشکێکیان هەیە براکان بە خوشکی بچوکیان دەڵێن: (فاتمە خان) ئێرە گوندی دێوانە نابێ بەهیچ شێوەیەك لەماڵ بێیە دەرەوە ئەگەرنا تووشی گرفت دەبین ، هەر حەوت برا و خوشکەکە ژیانێکی ئاسودە بەسەر دەبەن، براکان ڕۆژانە کەل و پەلی پێویست بۆ خوشکیان دەهێننەوە و ئەویش تەنها چێشتیان بۆ لێ دەنێ ، ڕۆژێکیان فاتمە خان داوای بێچوە پشیلەیەك دەکات لە براکانی بۆ بهێنن بۆ ئەوەی لە ماڵەوە هەست بەبێ تاقەتی نەکات ، براکانیشی بێچوە پشیلەی بۆ دەهێنن فاتمە خان بەهۆی پشیلەکەوە زۆر خۆشحاڵ دەبێ، بەڵام ڕۆژێکیان فاتمە خەریکی چێشت لێنان دەبێ دەنکە مێوژێك لە دەم ئاگردانەکە دەکەوێت بۆیە فاتمە خان دەنکە مێوژەکە هەڵدەگرێتەوە و دەیخاتە دەمی و دەیخوات پشیلەکە داوای ئەو دەنکە مێوژەی ناو دەمی فاتمە خان دەکات هەرچی دەکات فاتمە خان پشیلە ڕازی نابێ هەر چەند دەنکی مێوژی تری بۆ دەهێنێ و بۆی دەخاتە دەم ئاگردان هەر ڕازی نابێ بۆیە پشیلەکە هەڵدەستێ و میز دەکات بە ئاگری ناو ئاگردانەکە و دەیکوژێنێتەوە فاتمە خان نازانێ چی بکات و چۆن ئاگر پەیدا بکات ئاخر ئێستا براکانم دێنەوە و برسیانە، دەبێ هەر ئاگر پەیدا بکەم ، کاتێك فاتمە خان سەیر دەکات ئاگرێك لە دوور دیارە بۆیە ئەویش زۆر بە هێمنی و بە نهێنی بۆ لای ئاگەرکە دەڕوات بۆ ئەوەی ئاگر بهێنێ ، کاتێك دەگات بەو شوێنە ماڵی دێوە و دێو لەوێ نیە بۆیە بە خێرایی دەست دەکات بە هەڵگرتنی پشکۆ ئاگرێك و دەگەڕێتەوە بەڵام لەکاتی گەڕانەوەی تۆپێك داوی دەزووی لێ بەردەبێتەوە و بەدوایدا دەخشێ تا دەگاتەوە ماڵ و چێشت درووست دەکات، کاتێك کە دێوەکە دێتە ماڵەوە سەیر دەکات و هەست بە گۆڕانێك دەکات، بۆیە شوێن جێی داوەکە دەکەوێت و تا دەگاتە بەر دەرکی ماڵی فاتمە خا، لە دەرگا دەدات. بەڵام، فاتمەخان لەسەر ئامۆژگاری براکانی دەرگا ناکاتەوە، بۆیە دێوەکە دەڵێت: فاتمە خان براکانت ئەنگوستیلەیەکیان بۆ کڕی وی و بەمندا ناردویانەوە بۆ تۆ بۆیە دەرگا بکەوە

چونکە ئەگەر نەبیٚ بەدەستت ئەوا دەیبەمەوە بۆ کابرا و دانەیەکی ترت بۆ دەهێنم ، بەلاّم فاتمەخان هەر دەرگا ناکاتەوە ، بۆیە دێوەکە دەلّێت: باشە لە کونی دەرگا دەستت بێنە دەرەوە بۆ ئەوەی لە پەنجەتی بکەم دوا جار دەستی لە کونی دەرگاکە دەردەهێنیٚ، دێوەکە دەستی دەگریٚ و دەلّیٚ: فاتمە خان پەنجەی بچوکت واتە (قلنچك)بمژم یان هەر حەوت برات بکوژم. ئەویش دەلّێت: بەنچەی بچوکم بمژە و براکانم مەکوژە، دێوەش دەست دەکات بە مژینی پەنجەی فاتمەخان، هەموو ڕۆژێك بە هەمان شێوە دێوەکە دەهاتەوە و دەیووت: پەنجەی بچوکت بمژم یان براکانت بکوژم، تا دەهات فاتمە خان لاواز تر و زەرد تر دەبوو، هەرچەند براکانی داوایان لیٚ دەکرد ،ئەویش نەی ئەووت: ئەوە دێوە و داوا دەکات ، هەر ئەی وت: بیٚ تاقەتم، تا ڕۆژێکیان کاتێك حەوت براکە لە ڕاو دەگەڕێنەوە دەبینن فاتمەخانی خوشکیان لەژێر دەرگاکە لەهۆش خۆی چووە، کاتێك فاتمەخان دێتەوە هۆش خۆی براکانی پێی دەلّێن: چی بوە؟ بۆ وات لیٚ هاتوە کیٚ وای لیٚ کردووی؟ ئەویش دەلّێت: کەس بۆیە براکانی دەلّێن: ئەگەر پێمان نەلّێی ئەوە سوێند بیٚ یا خۆمان دەکوژین وەیا تۆ دەکوژین ، بۆیە فاتمە خان سەر و سەربردەی دێوەکە بۆ براکانی دەگێڕێتەوە بۆیە براکانی فاتمەخان دەلّێن: فاتمەخان ئاهەنگێك دەگێڕین و هەموو دێوەکان دەعوەت دەکەین بۆ ئەوەی ئەو دێوە ببینین و دەست نیشانی بکەین براکان چالّێکی زۆر قولّ لیٚ دەدەن پڕی دەکەن لە نەوت و قیر، سەرەکەشی دادەپۆشن ڕۆژی ئاهەنگ دادیٚ و دێوەکان دێن بۆ دەعوەت، فاتمە خان هەر لە دووری دێوەکە دەناسێتەوە بە پەنجەی هێمای بۆ دەکات لای براکانی بۆیە ئەو دێوە کەوای بە فاتمەخان کردبوو خستیانە سەر چالّەکە دوای نان خواردن و ڕۆشتنی دێوەکان ... بۆیە هەر بەخێرایی بەڕەی ژێر دێوەکە کەوای بە فاتمەخان کردبوو دەرهێنا و کەوتە ناو چالّەکە و ئاگریان تێبەردا، دێوەکە هاواری کردوو وتی: فاتمەخان ئەو پیازانەی کە لەسەر ئەم چالّە دەڕوێن مەهێلّە براکانت بیخۆن ، ڕۆژ هات و ڕۆژ ڕۆیشت لە شوێنی چالّی دێوەکە چەند پیازێك ڕوا، ڕۆژێکیان فاتمە خان چێشتی لێنا و براکانیشی چاویان بەم سەوزە پیازانە کەووت وتیان: دەبیٚ فاتمەخان ئەم پیازانەمان بۆ پاك بکات

ئەویش دەڵێ: نابێ بیخۆن، چونکە دێوەکە وتی: شتی خراپتان بەسەر دێ براکان دەڵێن: دێوەکە درۆ دەکات دەی بچۆ بیهێنە، هەر چەندی فاتمەخان دەکات بەڵام، براکانی هەر سورن لەسەر خواردنی پیازەکان بۆیە فاتمەخان بۆیان پاك ناکات، ئینجا برای بچوك دەچێ پیازەکان دەهێنێ و پاکیان دەکات و دەیخۆن. بۆیە هەر حەوت برا دەبن بە (مامز)ئینجا ڕۆژانە خوشکە واتە فاتمەخان ئەم مامزانە دەبات بۆ دەشت و بۆ لەوەڕ چەند مانگێکی پێ دەچێ بەم شێوەیە دەبێ، ڕۆژێکیان پیاوێکی خانەدان چاوی بە فاتمەخان دەکەوێت کە هەر دەگری و حەوت مامزی لایە بۆیە لێی دەپرسێ کچێ: تۆ چۆن بە تەنیا لەم دەشتە لای ئەو مامزانەی؟ ئینجا فاتمەخان بە تێر و تەسەلی باسی بەسەرهاتی خۆیی و براکانی بۆ کابرای ڕێبوار باس دەکات، کابراش زۆر بە پەرۆش دەبێت و دەمێك دادەمینێ، پاشان سەری بەرز دەکاتەوە و دەڵێ: من دەتوانم براکانت چاك بکەمەوە، فاتمەخان زۆر بەم قسەیە دڵ خۆش دەبێ بۆیە دەڵێ: دەی کابرا چۆن؟ ئەویش دەڵێ: بەبێ ئەوەی سەیری دواوەی خۆت بکەی حەوت گرد (تەپۆلکە) ببڕی و لەهەر گردێك شۆڕێك لە دارێکی باریکی تەڕدا بهێنی و بەبێ ئەوەی بوەستی، فاتمە هەر بەخێرایی هەروەك چۆن کابرا ووتی: ڕۆیشت و حەوت گردی بڕی و حەوت شوڕکی هێنا بۆ کابرا، ئینجا کابرا ووتی: فاتمەخان ڕووت بکە بەم بەر و هەر برایەکت حەوت شوڕکی لێ دەدەم نابێ بڵێی (ئۆف) چونکە ئەگەر وات ووت بۆ هەتا هەتایە چاك نابنەوە فاتمەخان ڕازی دەبێ، ئینجا کابرا دەست دەکات بە لێدان لە مامزەکان و هەر مامزێك حەوت شوڕکی لێ دەدا واتە شوڕکی یەکەم حەوت جار لە مامزی گەورە دەدات و چاك دەبێتەوە ، ئەوانی تریش بەهەمان شێوە تا دەگاتە برا بچوکەکەی بۆیە لە کاتی لێدانی شەشەم جار فاتمەخان دەڵێ: خوشکت بمرێ بۆیە مامزەکە نیوەی چاك دەبێتەوە و نیوەی تری بە مامزی دەمێنێتەوە، کابرا دەڵێ: ئەم جارە هەر قسەیەك بکەی ئەوا بۆ هەتا هەتایە چاك نابێتەوە ئینجا جاری حەوتەم لەبرای بچوك دەدات و چاك دەبێتەوە و بەیەکتر شاد دەبنەوە وە لەبری چاکەی کابرای ڕێبوار حەوت براکە خوشکەکەیان واتە فاتمەخان دەدەن بە کابرا وەك وەفا داریەك بۆ ئەم کارەی، هەرچەندە کابرای ڕێبوار

**دەڵێت: من ڕێبوارم ئەم خوشکەی خۆتان بۆ خۆتان باشە، بۆ ئەوەی کار و باری ماڵەوە و نانتان بۆ بکات، ئەمانیش دەڵێن : بەهیچ شێوەیەك نابێت و دەبێت فاتمەخان پێشکەشی تۆ بێت، لەکۆتایی دا خوشك و براو کابرای ڕێبوار گەردنی یەکتر ئازاد دەکەن و دەڕۆن.**
**منیش کلاَشم دڕا و هیچم پێ نەبڕا .**

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: دێو و پیاز سەوز بوون لە چاڵی دێو کوژراو و پیاز خواردنی براکان و بوونیان بە مامز و چاك بوونەوەیان بە حەوت شۆڕ بەومەرجەی فاتمەخان لەکاتی لێدانیان، نەڵێ: ئۆف! .**
**ـ ئەم چیرۆکەش زۆر شێوەی هەیە، لێرە هەندێك جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوانی تر .**

# حەسەنە کەچەڵی پوشکە فرۆش

**کۆکردنەوەی : زانا سابیر ئیسماعیل**
**گێڕانەوەی : عەتیە سمایل عەزیز**

**هەبوو نەبوو، دایك و کوڕێك هەبوون، کوڕەکە ناوی حەسەن بوو دەچونە پوش درون و دەیانفرۆشت، نزیکەی (100)دیناریان ئیش کرد، ڕۆژێك حەسەن چووە لای دوکان دارێکی فێڵباز و وتی: حەسەن وەرە ئەم کۆڵکە دارەم لێ بکڕە بە هەر فێڵێك بێت حەسەن کۆڵکە دارەکەی بە (100)دینار کڕی کاتێك کە بردیەوە ماڵەوە، لەگەڵ دایکی بوو بەشەڕیان لەسەر ئەوەی چۆن بەرهەمی ڕەنج و ماندوبونی پوش فرۆشتن، چۆن تەنیا بە کۆڵکە دارێکی داوە حەسەن توڕە بوو دایکی بەجێ هێشت و چووە شارێك و لەوێ بوو بە شاگردی چای چی. دایکی حەسەنیش بە ناچاری کۆڵکە دارەکەی فڕێ دایە ژورێ کە کەڵ و پەلی ناپێویستی لێ بوو، پاشان کۆڵکە دار بوو بە ژنێکی زۆر جوانی بالاّ بەرزی دەوڵەمەند کە ڕۆژانە یارمەتی دایکی حەسەنی دەدا، لە شارەکەی ماڵی حەسەن کابرایەکی زۆر دەوڵەمەند و توجار هەبوو، کە خانوێکی بەرزی گەورەی هەبوو لە تەنیش ماڵی پیرێژنەکە، واتە دایکی حەسەنی پوشکە فرۆش، ڕۆژێك ژنە جوانەکە واتە کۆڵکە دارەکە داوای لە پیرەژن کرد بۆ ئەوەی باشترین وەستای بیناسازی پیشان بدات،ئەوجا ژنە جوانەکە قەسرێکی لە تەنیشت ماڵی توجار دروست کرد کە (7) نهۆم لەماڵی توجار بەرزتر بوو، کاتێك توجاریش لە کاروان گەڕایەوە بینی خانوی پیرەژن بوە بە قەسرێکی زۆر خۆش کە لەهی توجار بەرز ترە، بۆیە گوتی: لەم شارە کەس لەمن دەوڵەمەند تر نییە دەبێ کێ ئەم قەسرەی لە تەنیشت قەسری من دروست کردبێ، کە توجار دەگەڕێتەوە ماڵەوە بە توڕەیییەوە بە هەرسێ ژنەکانی دەڵێ ئەوە کێیە قەسری لەهی من بەرز تر دروست کردوە، بۆیە ژنەکان گوتیان تۆ ماندوی وەرە ماندو بونی خۆت بحەسێنەوە ئەوجا تێت**

دەگەیەنین، ئەویش وتی: ئەبێ بزانم کێیە لەمن دەوڵەمەند ترە. ژنەکانی توجار گوتیان حەسەن بە (100)دینار کۆڵکە دارێکی کڕی، ئەم کۆڵکە دارە بوە بەم ژنە دەوڵەمەندە کە خانوی لەهی تۆ بەرز تر دروست کردوە، کابرای توجاری زۆر بەتەماع بوو ، بۆیە بە فرسەتی زانی و ژنی گەورەی نارد بۆ دیوانی ژنە جوانە دەوڵەمەندەکە وەقاپێك زێڕ و قاپێك زیوی پێدا نارد بۆ ئەوەی هەتا حەسەن نەهاتۆتەوە ژنەکە خوازبێنی بکا ، کاتێك ژنی گەورەی توجار داوای خوازبێنی لە ژنە جوانەکە دەکات، ژنەکەش لێی دێتە دەست و بە خولأمەکانی بەشەق تا بەردەرگای ماڵەوەی دەبەنەوە، توجار بەمە نەوەستا ژنی دووەمی بە قاپێك زێڕ و زیوو ناردەوە بۆ خوازبێنی ، بۆیە بە هەمان شێوە ئەویشیان بەشەق بردەوە بەر دەرگا، ئەنجا توجار داوای لە ژنی سێیەم کرد بۆ ئەوەی بە هەمان ئەرك هەڵسێ، پاش پاڕانەوەیەکی زۆری ژنی بچوك، واتە ژنی سێیەمی بەهەمان شێوە بە قاپێك زێڕ و قاپێك زیو ناردیەوە بۆ لای ژنە کۆڵکە دارەکە، ئەم جارەیان ڕازی دەبێ بە خوازبێنی توجاری تەماع، بەلأم بە مەرجێك دەبێ بچینە لای قازی شەرتێك دەکەم ئەگەر لە شەرتەکە بردمەوە ئەوا هەمو سەروەت و سامانی توجار دەبێ بەهی من، و ئەگەر نەم بردەوە ئەوا بەخۆم و هەموو سامانەکەم دەیم بە ژنی توجار، شەرتەکەشم ئەوەیە من یەك ئەنگوستیلەم هەیە بەرامبەر هەموو زێڕ و زیوو سامانی توجار دادەنێم ئەگەر شەوقی ئەنگوستیلەکەم بڕا ئەوا دەبم بەهی ئەو بەلأم ئەگەر نەیتوانی شەوقی ئەنگوستیلەکەم ببڕێ ئەوا هەموو سامانەکەی دەبێ بەهی من. ئەنجا ژنەکەی توجار هەواڵەکە بۆ توجار دەباتەوە، بەلأم لەبەر چاوی برسی توجار خۆی دەخاتە بەردەم تاقی کردنەوەکە و ڕازی دەبێ، بۆ بەیانی دەچێتە لای قازی لەلایەك هەمو زێڕ و زێو و سامانی توجار، لەلایەکی تریش تەنها ئەنگوستیلەکەی ئاغا ژنی حەسەنی پوشکە فرۆش، بەلأم هەموو سامانی توجار ناتوانێ شەوقی ئەنگوستیلەکە ببڕن، لە ئەنجامدا توجار دەدۆڕێنێ لە شەرتەکە و ئاغاژنی حەسەن دەباتەوە، کەل و پەل و سامانی توجار دەگوازێتەوە بۆ قەسری خۆی ، بۆیە توجار دەستە ئەژنۆ دادەنیشێت ، هەوڵ ئەدا بۆ ئەوەی فێڵێك بدۆزێتەوە لەبری دۆڕاندنەکەی توجار دەست دەکا بە

ڕۆیشتنی بۆ ئەو شارەی کە حەسەنی پوشکە فرۆش و لەوێ لە چایخانەی حەسەن دادەنیشێ، حەسەن پوشکە فرۆش توجار ناناسێتەوە، بۆیە توجار دەڵێت: چیە حەسەنە کەچەڵی پوشکە فرۆش دەبینم کەنام ناسیتەوە، ئەویش دەڵێت: توجار ئەوە بۆ وا گۆڕاوی؟ چیت بەسەر هاتووە، توجاڕ دەڵێ ئەو کۆڵکە دارەی کەتۆ کڕیبوت بووە بە ژنێك و هەموو سەروەت و سامانەکەمی دزیوە و کردوویە بە قەسرێك، زۆر گەورەترە لەهی من، حەسەن بەم قسانە زۆر قەڵس دەبێت و کەمێکیش بە گومانەوە هەواڵەکە وەردەگرێت بۆیە یارمەتی لەوەستاکەی وەردەگرێ و لەگەڵ توجار دێتەوە بۆ شارەکەی خۆیان، کاتێك دەگەنەوە شار سەیر دەکات شوێنی کاولەخانوەکەیان بووە بە قەسرێك و تەواو گۆڕاوە بۆیە بە قسەکەی توجار باوەڕ دەکات کاتێك دەچێتەوە بۆ قەسرەکەیان ، دوای سلاَو و ئەحواڵ پرسین پیرە دایکی حەسەن ژورەکە چۆڵ دەکات بۆ حەسەن و ژنەکە، ئەنجا ئاغاژن بانگ دەکات کەوا خواردن بۆ حەسەن بهێنن، بەلاَم حەسەن زۆر بە توڕەییەوە شەقێك لە خواردنەکە دەدات ژنەکە گومانی ئەوە دەبات کەوا لەوانەیە خواردنەکەی بەدڵی حەسەن نەبێت بۆیە داوا دەکات بە چێشتێکی تر بۆی بگۆڕن، بەلاَم بەهەمان شێوە حەسەن شەقێکی تر لە خواردنەکە دەدات، ئەنجا ئاغا ژن توڕە دەبێ و دەڵێ حەسەنە کەچەڵی پوشکە فرۆش هەتا دوێنێ پوشکەت دەفرۆشت ئەمڕۆ لەچیت کەمە؟ بۆ وا دەکەی لەبەر ئەوەی حەسەن بە قسەکانی توجار زۆر توڕە ببوو، لەپڕ هەڵسا و ژنەکەی گرت و دوو خەنجەری لێدا و لە قەسر فڕێی دایە خوارێ سوێندی لەدایکی خوارد کەنابێ نەخۆی و نەکەسی تر یارمەتی بدات، بۆیە درەنگانێکی شەو، کوڕی توجار بەڕێگادا دەڕوات گوێی لەناڵەی دەنگێك دەبێ، کاتێك نزیکتر دەبێتەوە سەیر دەکات کە ژنێکی خانەدانی زۆر جوانە بۆیە هەر زوو پێی دەڵێت: ئەگەر چاکت بکەمەوە شوم پێ دەکەی؟ ژنەش لەبەر ئازارەکانی دەڵێ: بەڵێ، کوڕی توجار ڕۆژ بە ڕۆژ پەلە دەکات لە چاك بونەوەی ژنەکە بۆ ئەوەی لەسەر داوای خۆی شوی پێ بکات. بەلاَم کاتێك چاك دەبێتەوە ، ڕازی نابێ شوی پێ بکات و کوڕی توجاریش بەهەمان شێوە چەند خەنجەرێکی لێ دەدات و بریندای دەکات لە ڕکی ئەوەی کە شوی پێ ناکات

ئەمیش فرێی ئەدات. ئەنجا کوڕێکی دیان (مەسیحی) بەوێدا ڕەت دەبیٚ، سەیر دەکات ژنێکی زۆر جوانە. ئەویش بە هەمان شێوە، بۆیە داوای لیٚ دەکات چاکی دەکاتەوە بەلاٚم بە مەرجێك شوی پیٚ بکات، ژنەش ڕازی دەبێت بۆیە کاتێك ژنە چاك دەبێتەوە کوڕەی غەیرە دین داوای لیٚ دەکات کە بەڵێنەکەی بەجیٚ بگەیەنیٚ. ژنەش دەڵێت: ئێمە موسڵمانین تۆش کوڕێکی غیرەدین بۆیە لای ئێمە دەستور.

وایە دەبیٚ خۆت بشۆی ئەنجا شوت پیٚ دەکەم، کوڕەی غیرەدین ڕازی دەبیٚ بە سواری ئەسپێك دەڕوات بۆ لای ڕوبارێك، کوڕە دیانەکە خەریکی خۆشوشتن دەبێت کاتێك کچە جلەکانی کوڕە و ئەسپەکە دەبات و ڕادەکات، دەگاتە ڕۆخی زێیەکی گەورە کەچەند کەسێکی لێیە و خەڵك دەپەڕێننەوە واتە چەند قاغەوانێکی لێیە و کچە دەچێتە لایان و داوایان لیٚ دەکات کە یارمەتی بدەن و بیپەڕێننەوە، لەبەر ئەوەی کچەکە زۆر جوانە قاغەوانەکە داوای لیٚ دەکات کە پاش پەڕاندنەوەی شوی پیٚ بکات، کچەش ناچارە ڕازی دەبێت، پاش پەڕاندنەوەی شەویان بەسەردا دێت لە شوێنێك دایدەنێت و کچەکە دەیەویٚ ڕا بکات بۆی دەڵیٚ: پێویستم بەسەر ئاوە کابرای قاغەوان پەتێك لە دەستی ژنەکە دەبەستیٚ، وەك ئەوەی هەستی بە شتێك کردبیٚ، مەسینەکە دەدات بە ژنە و ڕەوانی دەکات، کاتێك ژنە تۆزێك دور دەکەوێتەوە، پەتەکە لە دەستی خۆی دەکاتەوە و لە دەستی مەسینەکە گریٚ دەداتەوە بە گورجی ڕادەکات دوای ئەوەی کە ژنە جوانەکە دوا دەکەویٚ کابرای قاغەوان پەتەکە ڕادەکێشیٚ مەسینەکە دەست دەکا بە تەقە تەق و بۆ لای دێت، کە سەیر دەکات ژنەکە هەلاٚتووە پاش چەند ڕۆژێك ڕۆیشتن ژنە جوانەکە دەگاتە سیٚ ڕاوچی هەر کە چاویان بەم ژنە جوانە دەکەویٚ ، دەبیٚ بەشەڕ لەنێوانیان هەر یەکە و دەڵێت بۆ من بۆ من ژنە جوانەکەش دەڵێت، ئاوا نابێت، من تێرێك هەڵدەدەم هەر یەك لە ئێوە توانی یەکەم کەس بیٚ تیرەکە هەڵگرێتەوە و دەست بدات لەمن دەبم بە خێزانی ئەو ، کاتێك تیرەکە داویٚ هەرسیٚ ڕاوچییەکە دەکەونە دوای تیرەکە بۆ ئەوەی هەوڵ بدەن یەکەم کەس بن، بەلاٚم دوای تیر هەڵدانەکە ژنەکە دەڕوات و بە جێیان دەهێڵیٚ، پاش ماوەیەك ڕۆیشتن دەگاتە شارێك ، پێش ئەوەی بچێتە

ناو شارەکە جلە پیاوانیەکەی کوڕەی غەیرە دینەکە کە لێی بردبو لەبەری کرد و چوە ناو شار و لەبن دیواریچك دانیشت ، لەشارەکەشدا پاشای شار کۆچی دوایی کردبوو، وەك دەستوریش بو لە شارەکە دوای مردنی پاشای شار تانجی سەری پاشا فڕێ دەدەن بکەوێتە سەر هەر کەسێك ئەو دەبێ بە پاشا و ژنی پاشاشی لێ مارە دەبڕێ، بۆ تانجان فڕێ دا لەسەر سەری ژنە نیشت لەبەر ئەوەی کابرایەکی نەناسرا و شیاو نەبو ڕازی نەبون. بەڵام، جاری دوهەم و سێهەمیش تاجەکە هەر کەوتە سەر سەری ژنە جوانەکە، بۆیە بڕیاریاندا کە بیکەن بە پاشا و هەر سێ ژنەکەی پاشاشیان لێ مارە بڕی، چونکە نەیاندەزانی خۆی ژنە لەبەر جل و بەرگە پیاوانەکە ، پاشای نوێ یەکەم بڕیار کەدای گوتی : کوپەیەك ئاو لەسەر دەروازەی سەرەکی شار دا بنێن و وێنەی منیش لەوێ هەڵواسن ، هەر کەسێك هات و ئاوی خواردەوە پاشان ئاخی هەڵکێشا بیگرن و بیهێنن بۆ لام پاش چەند ڕۆژێك هەر یەك لە حەسەنە کەچەڵی پوشکە فرۆش و کوڕی توجار و کوڕە غەیرە دینەکە و قایەغەوان و هەرسێ ڕاوچیەکە دەهاتن و ئاویان دەخواردەوە و ئاخیان هەڵدەکێشا. بۆیە هەموویان گیران و بران بۆ لای پاشای تازە. پاشاش بە جیا پرسیاری لە هەموویان کرد و پێی وتن: بۆ چی لەکاتی ئاو خواردنەوە کە سەیری ئەم وێنەیەتان دەکرد ئاختان هەڵدەکێشا بۆیە کوڕی توجار گوتی: من ژنێکی جوانم بە بریینداری بردەماڵەوە و چاکم کردوە بۆ ئەوەی شوم پێ بکات. بەڵام، شوی پێ نەکردم، منیش بەهەمان شێوە بریندارم کردەوە بۆیە ئەم وێنەیەش زۆر بەم ژنە دەچوو، کوڕی غەیرە دین بە هەمان شێوە وتی: من کچێکی بریینداری زۆر جوانم چاك کردەوە بۆ ئەوەی شوم پێ بکات. بەڵام، پاش ئەوەی چاك بۆوە لە دەستم ڕای کرد. ئەم ژنەش زۆر بەم وێنەیە دەچوو بۆیە ئاخم هەڵکێشا. پاشان قاغەوان وەڵامی داوە وتی: من کچێکم لە زێدا پەڕاندەوە بەڵێنی پێدام کە شوم پێ بکات بەڵام ڕای کرد کەزۆر بە خاوەنی ئەم وێنەیە دەچوو، ئەنجا هەرسێ ڕاوچیەکە وتیان: کچێك هاتە لامان تیرێکی هەڵدا وتی: هەرکەسێ ئەم تیرە بگرێ و بیهێنێتەو لام و دەستم لێ بدات دەبم بە خێزانی کە زۆر بە خاوەنی ئەم وێنەیە دەچوو، بۆیە ئاخمان هەڵکێشا، ئەنجا حەسەنە کەچەڵی پوشکە فرۆش وەڵامی

دایەوە و وتی: من کۆلکە دارێکم کڕی کاتێك ئەم کۆلکە دارە بوو بە ژنێك زۆر بە خاوەنی ئەم وێنەیە دەچوو بە قسەی توجارێك کە لەشارەکەمان هەبوو هەڵخەڵەتام و بە خەنجەر لێم دا و فڕێمدا ، بۆیە ئێستا زۆر پەشیمانم شار نەمایە بەدوای دا نەگەڕێم کەچی هەر نەمدۆزیەوە زۆر بەم وێنەیە دەچوو بۆیە لەگەڵ سەیر کردنی ئاخم هەڵکێشا.

پاشای تازە واتە ژنە جوانەکە لەسەری هەمووانی دا و حەسەنیشی لەجێی خۆی کرد بە پاشا و خۆی و هەر سێ ژنەی پاشای کۆن بوون بە ژنی حەسەنە کەچەڵی پوشکە فرۆش. لە کۆتایی دا حەسەنە کەچەڵی پوشکە فرۆش بوو بە حەسەن پاشا .(حەکایەتم بڕا و هیچ پێ نەبڕا)

*ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: کۆڵکە دارەکە دەبێت بە ژنێکی جوان.

# ئەو كوڕەی ژنە خراپەكەی هێنا چی بەسەر هات؟

**كۆكردنەوە: ساكار ڕەسول ڕەشید**

هەبوو نەبوو، لە گوندێكی دور پیاوێك هەبوو، ئەم پیاوە زۆر باش بوو كوڕێكی زۆر باشیشی هەبوو، بەڵام ئەم كوڕ و باوكەوخێزانەكەیان هەژار بوون هەر لەم گوندەش پیاوێكی زۆر دەوڵەمەند و باش هەبوو. بەڵام، ئەم پیاوە دەوڵەمەندە كچێكی زۆر خراپی هەبوو كە خەڵك لێی بێزار بوون لەبەر كارە شەڕانییە خراپەكانی.

ڕۆژێكیان كوڕەكە بە باوكی وت: من زۆر لەم ژیانە هەژارییە بێزارم چیتر نامەوێ بە هەژاری بژیم، و ناتوانم ئەم گوندە بەجێ بێڵم بۆ پەیدا كردنی نان بۆیە ئەمەوێ كچێكی دەوڵەمەند بخوازم بۆ خۆم لەبەری بحەسێمەوە. باوكە لە مەبەستی كوڕەكەی گەیشت و وتی: كوڕم ئەوی تۆ لەمێشكت دایە مەحاڵە! چونكە ئەم كچە دەوڵەمەندە كەس ناوێرێ لێی نزیك بێتەوە دور نییە ئەگەر ببێ بە خێزانت بتكوژێ ، هەرچۆنێ بێ كوڕەكە توانی باوكی ڕازی بكات كە ئەم كچەی بۆ بخوازێ ، باوكی كوڕەكە چو بۆ لای هاوڕێكەی خۆی كە باوكی كچە خراپەكە بوو داوای كوڕەكەی پێ ڕاگەیاند، باوكی كچەكە وتی: ئەگەر من بەم داوایە ڕازی بم دیارە زۆر خراپم بەرامبەرت چونكە دەزانی كچی من چۆنە و كوڕی تۆش ئاوا باشە ئەترسم توشی بەڵایەك بێ بەدەستیەوە، هەر چۆنێ بێ باوكی كچە ڕازی بوو.

دوای تەواو بونی مارەیی و گواستنەوە كوڕو كچە چونەماڵی تازەی خۆیان، بەڵام كەس و كاری كوڕە و كچە زۆر چاوەڕێی ئەوە بون بزانن بەیانی چی ڕو ئەدا نەوەك كچە شتێك بەسەر ئەم كوڕە بێنێ، كچە و كوڕە دانیشتن بێ ئەوەی هیچیان قسە بكەن، كوڕە سەیرێكی چار دەوری خۆی كرد و كەسی نەدی جگە لە كچە و سەگێكی خۆیان بانگی سەگەكەی كرد و پێی وت: وەرە ئاو بە دەستەكانم دا بكە تا دەستەكانم بشۆم و نان بخۆم. بەڵام سەگ (نەبای دێ و نە بۆران) گوێی نەدایە كوڕەكە لەبەر چاوی كچە سەگی سەر بڕی كچە سەیری بەمە هات، ئینجا كەسی تری نەدی چو بۆ دەرەوە و ئەسپەكەی خۆی

**هێنا کە هیچی تری نەبو جگە لەم ئەسپە بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی . پێی وت : وەرە ئاو بێنەوە بە دەستمی داکە بۆ ئەوەی دەستم بشۆم چەند جارێکی تر دوبارەی کردەوە. بەلأم، ئەسپەکە گوێی نەدایە بۆیە کوڕەکە بە خەنجەرەکەی ئەویشی کوشت . گەڕایەوە و دانیشت و لەبەرخۆیەوە بە دەنگی بەرز ئەی وت: ئەگەر هەزار ئەسپ و سەد سەگ و هەزار ژنم هەبێ هەمویان دەکوژم ئەگەر ئیشم بە قسە نەکەن و خوێن لە خەنجەرەکەی دەهاتە خوارێ. ئینجا داوای لە ژنەکەی کرد ژنە بە خێرایی ئاوی هێنا دەستی ششت و نانێکی چاکی بۆ کوڕە ئامادە، کرد ئینجا کوڕە وتی: ئەون من زۆر ماندوم دەچم دەنووم نەهێڵی دەنگە دەنگ بێ و خەبەرم بکەنەوە دەنا دەتکوژم. کچە زۆر ترسا کەسوکاری بوك و زاوا ئەم شەوە هەر چاوەڕوان بون بزانن چی ڕوو ئەدا ئایا کوڕە ماوە یان مردوە، بەیانی کە هاتن سەیری دەرگایان کرد داخرابوو کاتێ لە دەرگایان دا کچە هاتە دەرەوە وتیان بەخوا کوڕەکەمان یا مردوە یا بریندارە، بەلأم کچەکە پێی وتن هەی شێتی شورینە هاتو هاوار مەکەن با مێردەکەم خەبەری نەبێتەوە دەنا هەمومان دەکوژێ! کە کچەکە ئەم قسەی کرد ئەوان سەیریان پێ هات. کوڕەکە زۆر لەبەرچاویان بەرز بۆوە کە توانی ئەم کچە خراپە بگۆڕێ . لەو ڕۆژەوە کچە و کوڕە تا مردن بە خۆشی ژیان .**
**دوای ڕۆژێك باوکی کچە لەبەر چاوی ژنەکەی کەڵەبابێکی کوشت بەلأم ژنەکە پێی وت: ئەگەر هەزار کەڵەبابیش بکوژی تازە من و تۆ یەکتر چاك دەناسین ، زو تر وات بکردایە .... .**

***ئەم حەکایەتە سەڵمێنەری ئەو پەندەیە، کە دەڵێ: شەوی یەکەم، سامی خۆت بنوێنە.**

# کچە ئازاکە

**گێڕانەوە : مەحەمەد عەلی حوسێن**

**دەگێڕنەوە: لە شارێك پاشایەك هەبوو کە پاشایەکی چاك بوو، ئەم پاشایە پێنج کوڕ و کچێکی جوانی هەبوو. دایکی ئەم کوڕانە و کچەکە مردبوو بۆیە باوکەکە بڕیاری دا ژن بێنێتەوە.**

**پاشا لە شارێکی تر ژنێکی هێنا. بەڵام دوای ماوەیەك ئەم ژنە لەگەڵ ئەم منداڵانە زۆر خراپ بوو هەوڵی دەدا منداڵەکان لەناو بەرێ، ئەم ژنە ژنێکی خراپ و جادو کەر بوو، بۆیە بڕیاری دا بە جادو ئەم منداڵانە لە پاشا دور بخاتەوە . شەوێکیان ژنە لە ژورێك دەستی کرد بە جادو کردن بڕیاری دا کە کوڕەکان بۆ باڵندەی ناشیرن بگۆڕێ. بەڵام، منداڵەکان بون بە چەند مەلێکی سپی و جوان هەڵفڕین و لە کۆشك دەرچون .**

**و توانی کچە جوانەکە بکات بە کچێکی زۆر ناشیرین کە کەس نایناسێتەوە هەر کەس ئەم کچەی دیبا لێی ئەترسا .**

**و کوڕەکان لەشەودا ئەگەڕانەوە شێوەی ئاسایی خۆیان .**

**کاتێك کە ڕۆژ بۆوە پاشا لەگەڵ ژنە جادو کەرەکە چاوەڕێی منداڵەکانیان ئەکرد. بەڵام، پاشا هیچ شتێ نازانێ دەربارەی ئەم ڕوداوە سەیرە .**

**وە کچەکە کاتێ لەخەو هەستا چو بۆ ژوری براکانی. بەڵام، کەسیان دیار نەبون کچەش نازانێ چی ڕوی داوە و خۆشی بووە بە کچێکی ئاوا ناشیرین. کاتێ کە هاتە لای باوکی بۆ ئەوەی هەواڵی براکانی بە باوکی بڵێ: باوکی نەیناسیەوە و بە خزمەتکارەکانی ڕاگەیاند کە لەماڵ دەری کەن. بەم شێوەیە پیلانی ژنە جادوکەرەکە سەر کەوت تەنیا خۆی و پاشا لە کۆشك مانەوە و منداڵەکانیش بەم شێوەیە باسم کردوە وە کچە بەگریان ماڵی بەجێ هێشت و زانی ئەمە کاری ئەم ژنە جادو کەرەیە چونکە چەند جارێ بینیبوی کە کاری جادوی ئەکرد بەڵام باوکی باوەڕی بە کچەکەی نەدەکرد .**

کچە دەگەڕا بۆ ئەوەی شوێنی براکانی بزانێ بەڵام بێ سود بوو کە شەو داهات مانگی بینی پرسیاری لە مانگ کرد. بەڵام، هیچ هەواڵی براکانی پێ نەبوو مانگ پێی وت: کە پرسیار لە ڕۆژ بکات ئەو لەوانەیە ئەوانی دی بێ.
کە ڕۆژ داهات پرسیاری لە خۆر کرد خۆریش وتی : من نازانم بەڵام پرسیار لە (با) بکە کچەش لەسەر قسەی ئەم لە بای پرسی با پێی وت: بەڵێ براکانی تۆ بوون بە پێنج مەلی سپی لە دورگەیەك ئەژین لەناوەڕاستی دەری . ئەویش زۆر سوپاسی بای کرد و ڕۆیی بۆ شوێنی دورگەکە بەڵام هەر ڕۆیی و زۆر هیلاك و ماندو بوو لە ژێر سێبەری دارێکی پیر ویستی تۆزێ پشو بدات بەڵام خەوێکی قوڵی لێ کەوت .
کاتێ کە بەخەبەر هات لەو خەوە خۆشە پیرێژنێکی ڕوح سوکی بینی کە لەتەنیشتیەوە دانیشتبوو. بە پیرێژنەکەی وت: من بەدوای براکانم دەگەڕێم کە لە دورگەیەکی دورن. بەڵام، هیچ کەس یارمەتیم نادات. چونکە من بوم بە کچێکی ئاوا ناشیرین و ڕەزا گران پیرێژنەکە وتی: من دەتوانم یارمەتیت بدەم؟ بەڵام تۆ بەسەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕەوە .
و کچەکە بەسەر هاتی خۆی بۆ ئەم پیرێژنە چاکە گێڕایەوە ژنەکە بڕیاری دا یارمەتی بدا پێی وت: پێش ئەوەی بڕۆی بۆ ئەم دورگەیە با ئامۆژگاریەکت بکەم بۆ ڕزگاربونی خۆت و براکانت پێی وت: دوای ئەوەی کە براکانت ئەدۆزیەوە پێیان بڵێ: هەڵت بگرن و بت بەن بۆ ئەشکەوتی ناو گۆڕستانی نزیك دورگەکە کە ئەو مەلانە چاك پێ دەزانن لەناو ئەم ئەشکەوتە جۆرە ڕوەکێکی سحری و دڕکاوی ڕواوە تۆ ئەم ڕوەکانە دەبڕی و دەیانکەی بە داو و پێنج کراسی بۆ براکانت لەو ڕوەکە دروست ئەکەی کە لەبەریان کرد چاك دەبنەوە. بەڵام، نابێ تا کراسەکان تەواو ئەکەیت هیچ قسەیەك بکەی.
ژنە توانی کچە بگەڕێنێتەوە سەر شێوە جوانیەکەی جارانی خۆی. وە ئەسپێکی سەیری دا بە کچەکە کە زۆر خێرا تر بوو لە ئەسپی ئاسایی. توانی بە ماوەیەکی کەم بیگەیەنێتە دورگەکە . دوای ئەوەی کە بە براکانی شاد بۆوە. ئینجا براکانی بردیان بۆ ئەشکەوتە سەیرەکە. بەڵام، ئیتر براکانی نەدیتەوە .

**وە دەبوایە ئەم کراسانە بۆ ماوەی (40) ڕۆژ تەواو بکات دەنا ئیتر ئەم کوڕانە هەتا هەتایە هەر دەبن بە مەل.**

**دوای ماوەیەك کچەکە لە ئەشکەوتەکە خەریکی تەون و کراس دروست کردن بوو. کوڕی پاشایەك لەگەڵ دارو دەستەکەی هاتبون بۆ ڕاو لە دارستانی نزیك ئەم گۆڕستانە. وە شازادە چاوی بە مامزێك کەوت و تیرێکی تێ گرت و مامزەکە بریندار بوو ڕای کرد شازادە دوای کرد مامزەکە چوە ناو گۆڕستانەکە و لە ئەشکەوتەکە نزیك بۆوە و ون بوو. شازادە بەدوای مامز چوە ناو ئەشکەوت. بەڵام، لەناو ئەشکەوت چاوی بە کچی پاشای جوان کەوت و سەیری پێ هات کە کچێکی ئاوا جوان و خانم بە تەنیا لەم ئەشکەوتەیە بڕیاری دا لەگەڵ خۆی بیبا بۆ کۆشك، کچەش نەیتوانی هیچ بکات نەش دەبوو هیچ قسەیەك بکات. دوای چەند ڕۆژێك لە کۆشکی شازادە کچە هیچ قسەیەکی نەکرد شازادە زۆر ناڕەحەت بوو. کە کچێکی ئاوا جوان قسە نەکات بەڵام، هەر چۆنێ بێ شازادە عاشقی ئەو کچە بوو . یەکێ لە وەزیرەکان کە بەتەمای ئەوە بو کە کچی خۆی بدات بە پاشا زۆر ڕقی لەم کچە بوو بڕیاری دا کە ئەم کچە دور بخاتەوە بە هەر شێوەیەك بێ. بەڵام، دەیزانی کە ئەگەر ئەم کچە بزر بێ لەوانەیە پاشا لە داخان بمرێ.**

**شەوێکیان کچە بڕیاری دا کە بچێتەوە بۆ گۆڕستانەکە و ڕوەکەکان بێنێ بۆ دروست کردنی کراسەکان چونکە ماوەکە ئەهات تەواو بێ. بەڵام، وەزیرەکە بەمەی زانی کە ئەم کچە دەچێ بۆ گۆڕستان بە شازادەی وت: کە ئەم کچە جادو کەرە ئەبێتە هۆی تێکدانی شارەکە بڕیار درا کە کچەکە لە ژورێکی بڵندی کۆشك بەند بکرێ. بەڵام، کچەکە ڕوەکێکی زۆری کۆ کردبۆوە، براکان زۆر بە دوای خوشکیان گەڕان ڕۆژێکیان کچەکە لەبەر پەنجەرە خەریکی دروست کردنی کراسەکان بوو براکانی (مەلەکان) خوشکەکەی خۆیان بینی بانگیان کرد. کچەکە زانی کە سەربازەکان ئەم مەلە جوانانە ببینن تیر بارانیان ئەکەن لەبەر ئەوە ئیشارەتی دا براکانی کە ئەم شوێنە بەجێ بێڵن تا خۆی ئەچێتەوە لایان. وە کراسەکانیش زۆریان نەمابوو تەواو بن تەنیا یەکێکیان مابوو. بەڵام، دەبوایە بە یەکەوە کراسەکانیان بداتێ .**

سەربازەکان مەلەکانیان تیر باران کرد. یەکێ لە براکان بریندار بوو کەوتە خوارەوە مەلەکانی تریش بەدوای دا ڕۆیشتن کاتێ سەربازەکان ویستیان بریندارەکان بگرن. مەلەکان بەرگریان لێ کرد. بەڵام، کچەکە توانی کراسەکە تەواو بکات لە دەرگای ژورەکەی دا دەریان هێنا بە ڕا کردن کراسەکانی لەبەر براکانی کرد و گەڕانەوە شێوەی ئاسایی خۆیان . ئینجا بەسەر هاتی بۆ شازادە گێڕایەوە . کچەکە مێردی بە شازادە کرد و براکانیش چونەوە شاری خۆیان و دەستیان کرد بە حوکم کردنی شاری خۆیان و پیرێژنە جادو کەرە خراپەکەشیان لە ناو برد . بەڵام باوکیان لەم ماوەیە کە ئەوان دیار نەبوون لە داخان مردبوو .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە:جادوگەر منداڵەکان دەکا بە باڵندە کچە ناشیرین دەکات، مانگ و ڕۆژ با قسە دەکەن، دڕکی سحراوی دەبێتە کراس و منداڵە کۆتراەکان چاك دەبنەوە.**

# سوڵتان مەحمود

**کۆکردنەوەی : ساکار ڕەشید شەریف**
**گێڕانەوەی : گوڵزار ئیسماعیل ڕەسوڵ**

هەبوو نەبوو، سوڵتان مەحمود هەبوو، ڕۆژێکیان لەگەڵ هەیاس دەچنە ڕاوێ، لایان دا چوونە لای ڕەشماڵێك، چوون میوانی خاوەن ڕەشماڵەکە بوون ئەو ماڵە سێ کچیان هەبووە، کچی یەکەم واتە گەورەکە وتی: بێتوو سوڵتان مەحمود من بخوازێ، دەبێ (لایەك مافور دروست بکەم لە دوو خوری) ، کچی ناوەندی وتی: ئەگەر بێتو من بخوازێ، (بەیەك مەنجەڵ شیو سەد میوانی بەڕێ دەکەم)، کچی بچوك وتی: ئەگەر بێتو من بخوازێ (دوو منداڵم دەبێ کوڕێك و کچێك کوڕەکە قاقول زڕینە کچەکە ددان مرواری) سوڵتان گوێی لە قسەکان بوو سوڵتان مەحمود وتی: دەبێ هەر سێکیان تاقی بکەمەوە، سوڵتان مەحمود بەبابی کچەکانی وت: ئایا کچەکانت تەون دەزانن؟ باوکە وت : بەڵێ یەکیان لە کچەکانم تەون کەرە، باوکی بە کچەکەی وت: لەمافورێك چەند خوری تێ دەچێ؟ کچەکە وتی: لە مافورێك دوو خوری تێ دەچێ، ئینجا سوڵتان مەحمود دوو خوری هێنا کچەکە ڕستی و پاکی کرد، بەشی ڕاێر نەکرد. پاشان کچی دووەمی تامیکردەوە، پاشا میوانم هەیە دەمەوێ خواردن دروست بکەم چەنج مەنجەڵە شیو بەش دەکات، کچی ناوەندی وتی: بە دوو مەنجەڵە شیو سەد میوانی بەرێ دەکەم، بۆ تاقی کردنەوە سوڵتان مەحمود خواردنی حازرکرد بەشی چارێکە کەسێکی نەکرد، سوڵتان مەحمود هەستا کچە بچووکەکەی داخوازی کرد باوکی کچەکە پێشکەشی کرد، سوڵتان مەحمود کچەکەی گواستەوە، سوڵتان مەحمود بەخۆیی و ژنی گەورەی لەماڵەوە بوو ژنە بچوکەکە زگی بوو سوڵتان مەحمود لەگەڵ هەیاس چونە ڕاوێ لە وەختی منداڵ بوونی دا بوو بەجێی هێشت چونکە سەفەرێکی دووری لە ڕێگادا بوو ژنە گەورەکەی مامانێکی هێنا بۆ ئەوەی نەجاتی بدات کە ژنەکە ڕزگاری بوو

دوو منداڵی بوو کوڕەکە قاقۆل زێڕینە کچەکە ددان مرواری، بێت و سوڵتان مەحمود بێتەوە ئەو دوو منداڵە بووە من بەرەڵلاّ دەکات، ژنە گەورەکە بە مامانی وت: بۆ ئەوەی بچێتە لای نەجاڕ سندوقێکی (بەقیر)کراو دروست بکات هەردوو منداڵەکەی خستە ناو سندوقەکە خستیە ناو ئاو و بە ئاودا ڕۆیشت.
هەستا دوو گوجیلە سەگیان هێنا، ژنەکە ووتی: من چم بووە؟ وتی: دوو گوجیلە سەگت بووە. ئەو سندوقەی کە بەئاودا ڕۆیشت، ئاشەوانێك هەڵی گرت ئەو سندوقەی منداڵەکەی تێدابوو، هەستا هێنایە بەر ئاگر کردیانەوە دوو منداڵی جوانی تێدابوو، ئاشەوان وجاخ کوێر بوو. هیچ منداڵیان نەبوو زۆر پێیان خۆش بوو. سوڵتان مەحمود کە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە وتی: چیمان بووە؟ وتی: چیتان بوو دوو فەرخە سەگتان بوو، وتی: نایکوژم بەلاّم لەناو حەوت پێستی گامێش داینا و دووری کردیە پرد مەڕ و مالاّتی بەسەر دا بڕوات، ئەو کچە و کوڕە گەورە بوون گەنج و جوان بوون، ڕۆژێکیان برایەکەی بە خوشکەکەی وت: ئێمە پێ ناچێ منداڵی وان بین واتە منداڵی ئاشەوان بین چونکە ئێمە زۆر جوانین، ڕۆژێك ئێوارەیەك دانیشتبوون منداڵەکان وتیان: بەڕاستی ئێمە منداڵی ئێوەین؟ ئاشەوانەکە وتی: ئەگەر ئێوە منداڵی ئێمە نەبن ئەی ئێوە لەکوێ بوون، زۆر جار لێی دووپات کردەوە. ئێوەرەیەك سندوقەکەی هێنا و وتی: ئێوەم لەناو ئەو سندوقە هەڵگرتۆتەوە، ئێستاش هەردەزانم ئێوە نابنە کوڕو کچی من، کوڕەکە وتی: ئەگەر وەها بێ ڕێمان بدەرێ بۆ خۆمان بڕۆین، باوکە وتی: هیچم نییە، بەلاّم یەك ئەسپم هەیە، لەگەڵ شیرێك ئینجا شیر و ئەسپەکەی دایە دەستی و ڕۆیشتن، لەدوایی دا ڕۆیشتن تا گەیشتنە سەحرایەك لەو شارە نزیك بوو کە سوڵتان مەحمودی لێیە ڕەشماڵیان هەڵدا ئێوارەیەك سوڵتان مەحمود چووە سەربانێ بە دووربین تەماشای ئەکرد، دیتی ڕەشماڵێك هەڵدراوە لەو شارەی کە سوڵتان مەحمودی لێیە، هەستا سوڵتان مەحمود لەگەڵ هەیاس چووە لای ڕەشماڵەکە، سوڵتان مەحمود دیتی کوڕەکە و کچەکە زۆر جوان بوون زۆری خۆش ویستن پێی وتن: تەیر ناتوانێ لەسەر زەوی بفڕێ، چۆن ئێوە هاتوونەتە سەر زەوی من، کوڕەکە وتی: سوڵتان مەحمود زۆرت ئەگەر پێ ناخۆشە ئێمە لێرە دەڕۆین.. نەخێر نامەوێ ئێوە

برۆن ، هەر ئیشێکتان هەبوو بەسەر چاوم، چونکە سوڵتان مەحمود هەردوو منداڵەکەی خۆش دەویست. دەبا هەموو ڕۆژێ سەر لەم دوو منداڵە بدات ڕۆژێك سوڵتان وتی: دەبێ ڕۆژێ جارێك بێنە دیوەخانێ کاتێك مامانەکە چاوی بە کوڕەکە کەوت زانی منداڵەکان ماون. مامانەکە چوە لای ژنەکە پێی وت: هەردوو منداڵەکە ماون هەبێ و نەبێ کچەکە و کوڕەکەن. وەڵلاّ ئەگەر سوڵتان مەحمود بزانێ ئەوا کوڕو کچی خۆیەتی دەمان فەوتێنێ، سبەینێ پیرێژنەکە واتە مامانەکە بە فێڵی دار کردن و کۆکردنەوە هەستا بزانێ کچەکە قسەی لێ پرسیار بکات ، پیرێژنەکە بە فێڵی دار خڕ کردنەوە چوە لای کچەکە پێی وت: ئەی دایك و باوکت هەیە؟ وتی: ئێمە دایك و باوکمان نییە خوشك و برایەکین پێکەوە دەژین، کچەکە بە پیرێژنەکەی ووت: دەتوانی ڕۆژی جارێك بێیتە لام؟ چونکە من بە تەنیام برایەکەم دەچێتە ڕاوێ پیریژنەکە وەلاّمی دایەوە ئەگەر توانیم بێم بۆ لات سەردانت دەکەم، پیرێژن گەڕایەوە ماڵەوە بۆ لای ژنەکەی سوڵتان مەحمودووتی: هەردوو منداڵەکە منداڵی سوڵتان مەحمود نییە ووتی: ئەوانە خوشك و برایەکن قاقۆڵ زێڕین و ددان مرواری، وتی: دەبێت چارێك بدۆزینەوە بۆ ئەوەی ئەو دوو منداڵە بفەوتێنین هەتا وەکو سوڵتان مەحمود نەیزانیوە ، بەیانی پیرێژنەکە دەچێتە لای کچەکە پێی دەڵێ: بۆ بەبرات ناڵێی بچێتە باخی (حەسەنی) زارێ هەندێك نارنج و لیمۆ بۆنی بەسەر شار بڕوات کچە ئێوارێ برایەکەی لە ڕاو دێتەوە و کچەکە پێی دەڵێ کاکە گیان هەندێك نارنج و لیمۆلە (باخی) زارێ کە بۆنی بەسەر شاردا دەڕوات، برایەکەی دڵی نایەت خوشکەکەی عادز بکات بەیانی زوو دەڕۆم ئێوارێ ئالیکی بۆ ئەسپەکەی دانا و وتی: ماینی شێر سەفەرمان لە پێشە ماینەکە وەلاّمی دایەوە و وتی: ئەگەر بە گوێی من دەکەی ناچی لەبەر ئەوەی زەرەر دەکەی هەستا شەوێ ڕۆی ڕۆی هەتا گەیشتە ئەو باخەی، ماینەکە وتی: وەرە هەر چوار دەوری کوڕەکەی بە زنجیر داکوتا حەسەنی زارێ دەستی بە لاوك گوتنێ کرد و لەگەڵ حەیران کەس خۆی پێ ڕانەگیرێ هەرکەسێ لەدوای دەنگی بچێ دەبێ بەبەرد حەسەنی زارێ دەستی بەلاوك کرد، کوڕەکە هیچ نەیتوانی بەدوای دەنگی بچێ هەتا وەکو خەوی لێ کەوت ئەوسا ئەسپەکە

دەوری کوڕەکەی کردەوە زنجیرەکەی پساند هەگبەت پڕ لە نارنج و لیمۆ یەکسەر بێ ڕاوەستان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای خوشکەکەی بۆنی هەند خۆش بەسەر شاردا دەڕوات کەس خۆی پێ ڕاناگیرێ بەیانی دیسان پیرێژنەکە هاتوە بۆ لای کچەکە پێی وت : ئەوا برایەکەت زۆر زۆر زیرەکە بۆنی بنە ڕەشماڵاَن زۆرە ئێستاش بۆنی دەگاتە سەر شار بۆ بە برایەکەت ناڵێی بچێ (کراسی زاریێ) بێنێ قابیل بە بەژنی تۆیە، دیسان کچەکە هەروەختێ برایەکەی هاتەوە پێی وت: بۆ ناچی کراسی زاریم بۆ بێنی. برایەکەی دەڵێ: بەسەر چاو بۆت دەهێنم، دیسان ئێوارێ ئالیکی بۆ ئەسپەکەی دانا وتی: ماینی شێر سەفەرمان لە ڕێگادایە، کوڕەکە دیسان هەستا ڕۆیی بەشەو هەتا گەیشتە باخی حەسەنی زارێ. ئەسپەکە پێی دەڵێ دەگەیە سەگێك جۆی لەپێش دایە و ئەسپەکەش ئێسکی لە پێشە برۆ جۆیەکە لە پێش ئەسپەکە دابنێ و ئیسکیش لە پێش سەگەکە دابنێ لەوێ دەڕۆی دەگەیە هەندێك دڕکی گەورە هەیە لە بنی پێی ڕا دەچێ لە پشتی پێ دێتە دەرێ، برۆ خۆت لەناوی دا وەردە و بڵێ: دەڵێی لێف و دۆشەکی ماڵی بابمە، لەدوایی دا تووشی کانیەك دەبی لەبەر بۆن و بۆگەنی کەس ناحەوێتەوە ، قومێك بخۆ هەندێکیش بە دەم و چاوت داکەو بڵێ: دەڵێی شەکراوی ماڵی بابمە، لەوێ دەڕۆی توشی دەرگایەك دەبی ئەو دەرگایە لەناو قوڕ و ئاو دایە هەڵی گرە بیخە سەر شوێنێکی ووشك کراسەکەی زارێ لە ژوورەکەدا بە دارێکەوەیە دەستی بدێ و یەکسەر بگەڕێوە. ئینجا کراسەکەی برد و گەڕایەوە، زارێ وتی: دەرگا بیگرە دەرگا وەلاَمی دایەوە وتی: نایگرم هاوین و زستان لەناو ئاودا ڕزیوم ئەویش منی دەرهێنا و نایگرم، گەیشتە لای کانی و وتی: کانی بیگرە کانی وەلاَمی دایەوە وتی: نایگرم تۆ بەلام دادێی دەڵێی لەبەر بۆن و بۆگەنی ناحەوێمەوە، بەلاَم ئەو قومێکی خواردەوە و دەم و چاوی پێ شوشت و وتی: دەڵێی شەکراوی ماڵی بابمە، گەیشتە دڕکەکە وتی: دڕك بیگرە وتی: نایگرم ساڵی جارەك بەلام دادەچی دەڵێی: کۆر بیتەوە ئەو ئاقاری کە تۆی لێوە شین بۆتەوە، ئەو بە پێ خاوسی بەسەرم دا ڕۆیشت و وتی: دەڵێی لێف و دۆشەکی ماڵی بابمە. ئەوجارە گەیشتە لای سەگ و ئەسپەکە وتی: بیگرن وتیان: نایگرین قەد بووە

سەگ جۆی لەپێش بێ و ئەسپیش ئێسکی لە پێش بێ ئەو سواری ئەسپ بوو گەڕایەوە کراسەکەی لەگەڵ خۆی برد بۆ خوشکی بە خوشکەکەی وت: هەستە کراسەکە لەبەر کە بزانم جوانی، ئەحمەد وتی: دەڵێی بۆ تۆ دروست کراوە دیسان پیرێژنەکە بۆ لای کچەکە هات وتی: بەخوا جوانی چەند پێی شیرینی پیرێژنەکە بە کچەکەی وت: برایەکەت بۆ ناچێ ساحێبی ئەو کراسەت بۆ بێنێ هەم دەبێتە براژنت هەم دەبێتە هاوەڵت و گوتی: باشە. براکەیدیسان ئێوارێ ئالیکی بۆ ئەسپەکەی دانی وتی: ماینی شێر سەفەرمان لە ڕێگا دایە ئەسپەکە وەڵامی دایەوە وتی: بەگوێی من دەکەی ناچی، بەڵام کوڕەکە وتی: هەر دەچم، دیسان ڕۆیشت و هەتا گەیشتنە ئەو شوێنەی کە ساحێبی کراسەکەی لێیە ئەسپەکە بە ئەحمەدی ووت : ڕاوەستە هەر چوار دەوری ئەحمەدی بە زنجیر داکوتی گوتی: سێ جار بڵێ ساحێبی کراسی زارێ وەرە یەکەم جار بانگی کرد نەهات ئەسپەکە و ئەحمەد نیوەیان بووە بەرد، جاری دووەم بانگی کرد هەر نەهات هەتا ملی بوونە بەرد، بۆ جاری سێیەم بانگی کرد ئەحمەد وتی: ناتوانم هیچی تر بانگی بکەم لەتوانام نەماوە ئەوجارە بانگی بکە و ئەگەر نەهات بەدوای دەنگت ئێمە دەفەوتێین دەبینە بەرد.

کۆتایی جار بانگی کرد ساحێبی کراسی زارێ وەرە ئێرە جوابی دایەوە و وتی: گیانە ئەحمەد وا هاتم کچەکە فووی لێ کرد بوونە سواری جاران ئەسپەکە بە ئەحمەدی وت : بڵێ ئەو هەموو سوارەی بەدوای تۆدا هاتوونە هەموویان چاك بکەنەوە لەگەڵ خۆمان دەیانبەینەوە، کچەکە بەیەك فوو هەموویانی چاك کردەوە هەموویانی لەگەڵ خۆیان هێنایەوە بوونە خەڵکێکی زۆر، دیسان پیرێژنەکە بە کچەکەی وت: بۆ ناچی بە برایەکەت بڵێی حەسەن و لاوك بێژ هەموو ڕۆژێ لاوك و حەیرانت بۆ بڵێ، دیسان ئێوارێ بە ئەسپەکەی وت و ئالیکی لە پێش دانا و وتی: سەفەرمان لە ڕێگا دایە، دیسان ئەسپەکە هەر چوار دەوری کوڕەکەی بە زنجیر داکوتی، دەڵێ: حەسەنی لاوك بێژ وا حەیرانی دەڵێ کەس خۆی پێ ڕاناگیرێ ئەحمەد دەیەوێ بە دوای دەنگی دا بڕوات. بەڵام، ئەسپەکە ناهێڵێ هەتا وەکو حەیرانی خۆی تەواو کرد کە خەوی لێ کەوت ئەوسا ئەسپەکە وتی : ئێستا بچی (مۆری)خەوێ لەسەر سنگی ئەو

(مۆریەکە)دەست بدەیێ و یەکسەر بە خەبەر دێت کە بەخەبەر هات ئەو ئەسپانەی بە دوای دەنگت هاتوونە هەموویان چاك بکەیتەوە، ئینجا کوڕەکە چوو (مۆری) هەڵگرت و بە خەبەر هات پێی دەڵێ: هەموو ئەسپ و سوارانەم هەموو بۆ چاك بکەیتەوە لەگەڵ خۆمان دەیانبەین، حەسەن لاوك وتی: تۆ چۆن توانیت بگەیتە لام کەس نەیتوانیوە بێت بۆ لام هەموویان بوون بە بەرد هەموو سوارەکانی حەسەنی لاوك بێژیشی لەگەڵ خۆیان برد .

لە هەموو کارەکانی سەرکەوتنی بەدەست هێنا، پیرێژنەکە دیسان هات بزانێ دیسان چی کردوە، یاخوا پیرۆزتان بێ ئێستاکە بوونە خەڵکێکی زۆریش پێشتر بە تەنیا دەژیان، ژنی سوڵتان مەحمود وتی: ئەوان دوو تاقە کەسێك بوون نەت توانی لەناویان بەری ئێستا دەتوانن شاریش لەناو بەرن سوڵتان مەحمود لەدوای ئەحمەدی نارد بێتە میوانی من بۆ ئەوەی لەناوی بەرن زارێی خێزانی جوابی ئەحمەدی دایەوە وتی: دەبێ یەکەمجار تۆ ئەو دەعوەت بکەی، ئەحمەد وتی: دەبێ سوڵتان مەحمود تۆ دەعوەتی من بی لەگەڵ جەماعەت، هەستا زارێ خواردنێکی زۆری دروست کرد لە قاپ و کەوچکی هەمووی لە زێڕ دروست کرابوو، سوڵتان مەحمود لەگەڵ جەماعەتی هاتن بۆ لای ئەحمەد، میوانی ئەحمەد بوون هەستا خواردنی بۆ هەموو میوانەکان دانا، سوڵتان مەحمود بە تەنیا لەبن یەك ڕەشماڵ دابوو، هەموو ئێسکەکانیان خستە ناو قاپێکی زێڕ و لە پێش سوڵتان مەحمودی دانا وتی: سوڵتان مەحمود بیخۆ کە سوڵتان مەحمود سەری قاپەکەی کردەوە دیتی بەس ئێسکە لەناو قاپی زارێ وتی: پاشام خۆش بێ بۆ نایخۆی؟ سوڵتان مەحمود وتی: خۆ من سەگ نیمە زارێ وتی: ئەگەر تۆ سەگ نەبی چۆن سەگت لێ دەبێ ، زارێ بانگی ئەحمەد و خوشکەکەی کرد ووتیە سوڵتان مەحمود ئەوە هەردووك منداڵی تۆن، سوڵتان مەحمود گەڕایەوە ماڵەوە بانگی ژنەکەی و پیرێژنەکەی کرد، سوڵتان مەحمود هەستا هەردووکیانی کوشت و لەناو برد هەستا بانگی ئەحمەدی کرد وتی: دایکتم کردە بەرد هەستان دایکیان دەرهێنا و دکتۆریان دەرهێنا و چاکیان کردەوە لە دوایی دا هەردوو مناڵەکان لەگەڵ دایك و باوکیان شاد بوونەوە .

*ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: ژنە دوو منداڵی دەبێت، یەك دوان مراوی و قاقۆڵ زێڕ، حەسەنی زاری کە دەنگ خۆشەو حەیران و لاوك دەڵێ، ئەوەی خۆی پێ ڕانەگیرێ بەرامبەر بە خۆشی دەنگەکە دەیکاتە بەرد. کراسی زارێ، ئەوەی نەتوانێ بە دەستی بێنێ دەبێتە بەرد، هەروەها مۆری خەوێ. ـ ئەم ئەفسانەیە زۆر شێوەی هەیە، بەلاّم، ئەمە یەکەم جارە، من ببێنم کە پاشای ئەم چیرۆکە سولتان مەحمودە، ئەمەش، خاڵێکی پاڵەوان گۆڕییە لە ئەفسانە.

# سوری چاو شین

**کۆکردنەوە: سەنگەر عەبدولغەفار عەولاّ**

**گێڕانەوەی : عوسـمـان جەعفـــــەر**

هەبوو نەبوو، سەری حیکایەت بوو، کەس لەخودا گەورە تر نەبوو.
حاکمێك کوڕێکی هەبوو ، چەند ساڵ و زەمانان خەریکی بوو کە ژن بێنێ کوڕەکەی کە تاقانەش بوو ژنی نە دەهێنا ، لە دوایدا کوڕەکە ناو بانگی کچێکی بیست کە لە ناوەڕاستی چیایەك لە ئەشکەوتێك دەژیا ناوی (مەرجان)بو .

کوڕەکە هەستا بە دایکی گۆت کە نانی چەند ڕۆژێکی بۆ دابنێ دەچم بە شوێن ئەم کچە ، ئەوەندی دایك و بابی گۆتیان مەچۆ گۆتی هەردەچم و گۆتی ئەسپی من ئەسپی خێرێیە بۆ کوێ بچێ دەچمە وێ ناوی کوڕی حاکمەکە (میرزا ئەحمەد)بوو ، هەستا ئەسپی خۆی بەردا ڕۆیشت ڕۆیشت سێزدە شەو سێزدە ڕۆژان نەگەیشتە هیچ ئاوەدانێك و ڕۆیی خۆی دایە سەحرا و پشتی لە ئاوەدانی کرد و چو چیایی ، دوایی ئەوەی کە چوو چیای لەبن چیای، کاتێك (مەرجان)لەسەر چیا تەماشای خوارەوەی دەکرد و دیتی کە (میرزا ئەحمەد)ە گوتی: تۆو ئێرە ئێرە و تۆ ،(میرزا ئەحمەد)گوتی من لەدوای ئەشق و ئەوینی تۆدا هاتوم .

مەرجان گۆتی: جا دایکم دێوە چۆتە ڕاوێ بت بینی دەت خوا.
گۆتی جا چارە: مەرجان کەزی خۆی فڕێ دایە خوارێ بۆ ئەوەی میرزا ئەحمەد بەهۆیەوە سەرکەوێتە سەر بۆ ئەشکەوتەکە و ئەسپی خۆشی بەڕەڵلا کرد مەرجان و میرزا ئەحمەد قولتێکیان لە ئەشکەوت لێ داو میرزا ئەحمەد چوە ناوی و چەپەرێکیان لەسەر دانا و مافورێکیان لەسەر ڕاخست ئێوارێ کاتێك دایکی هاتەوە خۆی بە دەری ئەشکەوتەکە دادا گۆتی: مەرجان کچم بۆن دەکەم، بۆنی بێگانیان دەکەم، بۆنی خەڵکی جوان دەکەم ، مەرجانیش گۆتی: دایە ئەگەر من بخۆی ئەگەرنا لەم سەحرایە کێی تر هەیە .

گۆتی:. کیژی خۆم چاوی خۆم بخۆم بخۆم تۆ ناخۆم ، کاتێ بەیانی دایکی چو بۆ ڕاو مەرجان گۆتی: میرزا ئەحمەد هەستە با بڕۆین شەوێکی تر تۆ لێرەبی دایکم لە قولآیی ددانی خۆتی دەنێ ، هەستا خۆیان حازر کرد و ڕۆیشتن گەیشتنە ڕوبارێك هاوین بوو ، میرزا ئەحمەد گۆتی: من کوڕی حاکمم عەیبە ئاوا بت بەم بۆ دیوەخانی بابم ، کە پرێکی بۆ مەرجان دروست کرد لە کەناری ئاوەکە خۆی گۆتی تۆ لێرە بە من دەڕۆم خزمەتکارەکانی خۆمان دێنم ، میرزا ئەحمەد ڕۆیشت لەولای کەپرەکەیان ماڵە دۆمێکی لێ بوو(ژنێك و پیاوێك بوون لەو ماڵە پیاوەکە بە ژنەکەی خۆی گۆت بڕۆ ئاوم بۆ بێنە ژنە دۆمەکە چو ئاو بێنێ دیتی لە ئاوەکە ژنێکی زۆر جوان دیار بوو ، وای زانی خۆیتی ، هەستا گۆزەکەی شکاند و گۆتی:(دم دم دوچینە ئاو دەکێشم بە گۆزە و جەڕە بۆ مێردی کێر ئەستور و تەڵلا ئاوی ناخواتەوە لە دەستم من ئاوا جوانم) (3)جاران ئەوەی دوبارە کردەوە جاری سێیەم مەرجان گازی کرد (گۆتی خوشکم ئەو جوانی تۆ نیە هی منە بڕۆ ئاوی لۆ میرت ببە ، ژنەکە ناوی (سوری چاوشین) بوو) سورەی چاوشین تەماشای کرد گۆتی:. منیش بەرە لای خۆت مەرجان کەزیەکانی خۆی بۆ هەڵدا و سورەی چاوشین بەسەرکەوت ژنە دۆمەکە گۆتی: خانمەکەم جلەکانی خۆت بدە من هی جلك نییە خەڵکی جوان هەر جوانە، جلەکانی خۆی دایە ژنە دۆمەکە ، ژنە دۆمەکە گۆتی: بێنە سەرت بخورێنم هەموو سەری مەرجانی بە شوژن کون کون کرد مەرجان ئەوەندە عەزابی خوارد دوعای کرد لە خوای پاڕاوە گۆتی خودایە هاوارە ببمە تەیرێك و دوعام قەبوڵ بکەی خوای تەعالا لە دەستی ئەم ژنە دۆمە ڕزگارم بی.

دەڵێن دوعای مەرجان قەبول بۆیە تەیرێك چو بۆ ئاسمان دوای ئەوەی میرزا ئەحمەد گەڕایەوە بەخۆی و خزمەتکارەکانی دەبینی کە ئەمە مەرجان نییە بەڵکو یەکی ترە ، گۆتی: تۆ بۆ وات لێهاتوە گۆتی: (خەمی تۆ) خزمەتکارەکان هەمو گوتیان ئەمە هەر ژن نیە کوڕی حاکم ئینایتی، هەستان سوری چاوشینیان کردە بوك بۆ میرزا ئەحمەدی .

میرزا ئەحمەد باخچەیەکی هەبوو باخەوانێکیشی هەبوو .

مەرجان کە ببو بە تەیر خۆی گەیاندە لای باخچەوانەکە و هەردەی گۆت هۆ ڕەز و ڕەزوان ئەحمەد پاشا لە ماڵە لەگەڵ سوری چاوشین ڕەزەوانەکە (باخچەوان)گەڕایەوە بە میرزا ئەحمەدی گۆت تەیرەك هەیە لەناوڕەزەکەت سور نەبێ شین نەبێ بە هەموو ڕەنگێك خۆی ئەنوێنێ و هەر دەڵێ (ئەحمەد پاشا لەماڵە ...)میرزا ئەحمەد گوتی: جا تۆ بۆ من ئەم تەیرە بگرە ، بە ماڵی دونیا خەنیت دەکەم دوایی ئەوە ڕەزەوانەکە چو بۆ ناو باخچەکە تەیرەکە دیسان هاتەوە دەستی بە قسەکەی خۆی کردەوە، باخەوانەکە گۆتی: من گویچم گرانە وەرە نزیك بزانم چ دەڵێی تەیرەکە لێی نزیك بوەوە ڕەزەوانەکە گرتی و بردی بۆ لای میرزا ئەحمەد . ئەم تەیرە لە پێش چاوی میرزا ئەحمەد و بە هەموو ڕەنگێك خۆی پیشان ئەدا و خوناوی لێ ئەباری بەلاٚم ئەگەر سوری چاوشین دیار با وشك ئەبو سوری چاوشین (ژنە دۆمەکە)ئەمەی تێبینی کرد و گۆتی: ئەمە مەرجانە هەستا گوتیە میرزا ئەحمەدی من زگم هەیە و دەبێ ئەم تەیرەم بۆ سەر بڕی و بخۆم ، ئەوەندەی میرزا ئەحمەد گوتی: دەچین بەرانەکت بۆ سەر دەبڕین نەك ئەم تەیرە ژنە دۆمەکە گوتی: نەخێر من هەر زو تەیرم دەوێ و گۆشتی ئەو دەخۆم وە دەبێ کاتێك ئەو تەیرە سەر ئەبڕن نابێ خوێنی بڕژێتە سەر ئەرز و ئەبێ لەسەر تەشتێك سەری بڕن، ناچار بون تەیریان بۆ سەر بڕی لەکاتی سەر بڕین دو پشکە خوێن ڕژانە سەر زەوی ، ئەو دوو پشکە خوێنە بوونە دوو دار سپیندار ڕۆژ بە ڕۆژ بە مەتر درێژ ئەبون و هەڵدەکشان.

ئەگەر میرزا ئەحمەد چوبا بۆ بن ئەو دو دار سپیندارە بە هاوینانیش خوناویان لێ ئەباری بەلاٚم ئەگەر سوری چاوشین ڕۆیشتبا بن ئەم دوو دار سپیندارە سیس ئەبون، سورەی چاوشین زانی کە ئەم دو سپیندارە لە خوێنی تەیرەکە دروست بونە گۆتی:. هێشتا من منالٚم نەبێ لانکم بۆ دروست کەن لەم دار سپێندارانە، هەستان ناردیان لەدوای نەجاڕ، نەجاڕیان هێنا دار سپینداریان بڕین سورەی چاوشین گۆتی:. نابێ هیچ تەلیشە دارێك بکەوتە خوارێ لەسەر ئەرزەکە، نەجاڕ لانکیان دروست کرد .

دوای ئەو زۆری پێ نەچوو ژنی گاوانی گوندی لە تەلیشەدار ئەگەڕا کۆی ئەکردنەوە تەلیشەدار سپیندارەکانی بۆ خۆ بردنە ماڵ ، ئەم ژنو پیاوە گاوانە

هیچ منالّیان نەبوو ئەو تەلیشە سپیندارانە بوونەوە بە مەرجانەکەی جاران کیژێکی جوان و ناسك. جارێکی تر سورەی چاوشین گۆتی: من ئەو شەو منالّم دەبیّ نابیّ کەسیش لام بیّ چەندی گۆتیان نابیّ ئەبیّ خزمەتکارێکت لا بیّ گۆتی: نەخێر . بەیانی هەڵسا گۆتی: من کوڕێکم بووە دارێکی لەناو پەڕویان نابو لەسەر لانکی نابو بە میرزا ئەحمەدی گۆت: کوڕم بووە ، دەق دەق لانکی دەهەژاند چییە و تەڵلا منالّم بووە منالّ لە کۆلاّنیّ یاری تۆپی پێیان ئەکرد تۆپیان چوە مالّی ژنە گاوانەکە. منالّەکان چوون تۆپیان بهێننەوە دیتیان کچێکی جوان یان هەیە تەونی دەکرد زۆر زۆر جوان نازی ئەکا.

جواب گەیشتە مالّی حاکمی گوتیان: حاکممان خۆش بێت ئەوەندە مالّ و زەمانە کەس نەیزانیە پیر و گاوان منالّیان هەبن ئێستا کیژێکی وایان هەیە نازی لەسەر عەرد ئەکا.

هەستا حاکم زانی گۆتی: هەبیّ و ببیّ ئەو کچە مەرجانەیە حاکم جوابی نارد و بەدوای گاوان گوتی: سبەینیّ گاوان لە مالّ دەرنەچیّ گاوان زۆر عاجزبو.

گۆتی: هەبیّ و نەبیّ حاکم سەرم دەبڕێت، حاکم هات گۆتی: گاوان پێویستە تۆ کچەکەی خۆت بدەیە میرزا ئەحمەدی ، گاوان زۆری خەم خوارد کاتیّ گۆتی: کچەکەت بدە کوڕی من دوایی گۆتی ئێمە فەقیرین ئێمە گاوانین میرزا ئەحمەد کوڕە حاکمە حاکم گۆتی هیچ نییە ئێمە ڕازین .

حاکم گۆتیە پیریّ هەر لە مالّی ئێوە تا مالّی ئێمە زێڕان ڕێز دەکەین لەسەر زەوی تۆش بۆ خۆت خڕیان بکەوە ئەوجا بوکیان بردە مالّی پیریش هەر زێڕی بە کۆشی خڕ دەکردەوە کاتیّ میرزا ئەحمەد زانی کە سورەی چاوشین وای کردوە هەستا دوو ئەسپی هێنان و یەکیانی تێنی کرد و ئەوی تریان برسی هەر دەست و پێیەکی سورەی چاوشینی لە یەکیان بەست و دوایی تینوەکە ئاوی پیشان دا و ئەسپە برسیەکەش گیا دوو ئەسپەکە ڕایان کرد بۆ خواردنی ئاو و گیاکە سوری چاوشین بوو بەدوو پارچە .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: دێو و بوونە تەیر و قسەکردن، خوێن بوون بە ئەسپیندار.**

# درندە

**کۆکردنەوە: سەنگەر عەبدولغەفار عەولْلاّ**

**گێڕانەوەی: عەبدولغـەفـار عـەولْـلاّ**

دەگێڕنەوە کە پاشایەك هەبووە لەکاتی خۆی، ئەو پاشایە زۆر دەوڵەمەند و بەناوبانگ بووە لەو ناوچەیە هیچ پاشایەك نەبووە کە شان لەشانی بدات چەند پیاوی ئازا و چاو نەترسی هەبووە، بۆ هەر کارێك بیناردنایە بەخێرایی جیٚ بەجێیان دەکرد، ئەم پاشایە دەگێڕنەوە کە خاوەنی سەروەت و سامانێکی زۆر بووە لەهەموو ڕوویەکەوە. یەکیٚ لەو سەروەت و سامانانە ئەوە بووە کە باخێکی یەکجار گەورەی هەبووە لەناوچەکەدا کە هیچ پاشایەك لەو سەردەمە نەی بووە، ئەم باخە جۆرەها میوەی تێدا بووە ، ماوەی چەند ساڵێك بەرهەمەکەی بۆ خۆی و دەست و دارەکانی بەکار هێناوە. بەلاّم ڕۆژێك بەهەر شێوەیەك بێت هەواڵ ئەگات کە دڕندەیەك بینراوە چوەتە ناو باخەکەی بە قسەی یەکیٚ کە بەچاوی خۆی بینیویەتی، بەلاّم کەس نەیدەزانی ئەم دڕندەیە چییە ئیتر لەو ڕۆژە بە دواوە پاشا و دار و دەستەکەی نەیاندەوێرا بچنە ناو ئەو باخەوە، بگرە پاشا چەندین جار بانگەوازی بلاّودەکردەوە ئەگەر هەر کەسێك بچێتە ناو ئەو باخەوە هەواڵی دڕندەکەی بۆ بهێنیٚ ئەوا خەلاّت دەکریٚ بەلاّم چەند کەسێك بۆ چەند جارێك خۆیان تاقی کردەوە دەچوونە ناو باخەکە کەچی کەسیان تەنانەت هیچ سۆراخێکیان نابێت و هەموویان لەناو دەچن و کەس نازانیٚ (حاڵیان لە چ دەبێت)ئەم کارە چەند ڕۆژێك دووبارە دەبێتەو بەلاّم بیٚ سوود دەبێت. پاشا هیچی دەست ناکەویٚ، چونکە ئەوەی کە دەچێتە ناو باخەکە ناگەڕێتەوە بۆیە پاشا نا ئومێد دەبیٚ لە باخەکەی بەلاّم دوو برا لەو گوندە دەبن کە کەس و کاریان نییە نە دایك و نە باوك و نەخوشك (بیٚ کەس دەبن).

و پاشاش لەو کاتە بڕیار دەدا ئەگەر هەر کەسیٚ بچێتە ناو باخەکەم تەنیا یەك شەو لەویٚ بیٚ و یەك سێوم بۆ بێنیٚ ئەوا من خەلاّتی دەکەم و کچەکەمی دەدەمیٚ . بۆیە هەر کە دوو براکە ئەم هەواڵە دەبیستن، یەکسەر برای بچووك بە

برای گەورە دەڵێ: برام من و تۆ هەر هیچمان نییە ، لەم گوندە بابڕۆین بۆ لای پاشا پێی بڵێین کە ئێمە دەچین، بەڵام برا گەورەکەی زۆری گاڵتە پێ کرد و پێی وت: برام ئەوە چەند کەس چوونە ناو باخەکە بەبێ ئەوەی بگەڕێنەوە ، ئێستا من و تۆ چۆن دەتوانین بچینە ناوی.

بەهەر شێوەیەك بوو برا گەورەی ڕازی کرد، بۆیە بەیانی هەردووکیان چوونە لای پاشا و ووتیان پاشا ئێمە کەسمان نییە و بۆیە ئێمە دەچین بۆ ناو باخەکەت و شەویش لەوێ دەبین و سێویش دەهێنینەوە بۆ ، بەڵام پاشا زۆری گاڵتە پێ کردن ووتی من چەندین کەسی ئازام ناردووە بۆ ئەو جێیە کەچی هیچ کەسیان ئێستاشی پێوە بێ نەهاتوونەتەوە، ئیتر ئێوە چۆن دەتوانن بچن بۆ ئەوێ ، بەهەر شێوەیەك بێ پاشا ڕێگەیان پێ دەدات کە بڕۆن، بۆیە هەردووکیان دەست دەکەن بە ڕۆیشتن و دەگەنە باخەکە و دەچنە ژوورەوە. پاش کەمێك گەڕان بەناوی دا کە زۆر ترسناك دەبێ هەتا درەنگ هەر لەناوی دەسووڕێنەوە و شەویان بەسەر دادێ هەردووکیان ترسیان لێ دەنیشێ، برا گەورەکەی دەڵێ: با هەریەکێ لە جێگایەك بخەوین بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێکمانی خوارد ئەوی تر بمێنێ، بەڵام برا بچووکەکەی دەڵێ: نەخێر هەردووکمان بەیەکەوە دەخەوین و قاچمان تێکەڵ دەکەین سەرمان هەریەك بۆ لایەك درێژ دەکەین بەم شێوەیە دەخەوین، بەڵام کاتی شەو درەنگ دڕندەکە دێتە سەریان و دەبینێ کە دوو سەریان هەیە لەگەڵ ئەوەی کە یەك بەشەرە بۆیە دڕندەکە دەڵێ : دنیا گەڕام لەم سەر و ئەو سەرە نەم دی بنیادەمی دوو سەرە بۆیە هەر لەو کاتەوە یەکسەر باخەکە بەجێ دێڵێ و دەڕوات، کاتێ بەیانی ڕۆژ دەبێتەوە هەردوو کوڕەکە دەگەڕێنەوە بۆ گوندەکە و یەکی چەند سێوو پرتەقاڵێك لەگەڵ خۆیان دەهێننەوە بۆ گوندەکە ، کاتێ پاشا ئەمە دەبینێ و باسەکەی بۆ دەگێڕنەوە ئیتر پاشا برا بچووکەکەی دەکاتە وەزیری خۆی و کچەکەشی دەداتێ و براکەشی خەڵاتێکی گەورە دەکات .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: قسەکردنی دڕندەکەیە.**

# هەمزەی پاڵەوان

**کۆکردنەوە: سرود ناسر عەبدولڕەحمان**

**گێڕانەوەی : ســـافیە عومەر نەجـم**

هەبوو نەبوو، کابرایەکی زۆر بەهێز و ئازاو بە توانا هەبوو، کە ناوی (هەمزە) پاڵەوان بوو، ڕۆژێك لە ڕۆژان کاتێك بۆ ڕاو کردن چوو بوە دەشت دەگەڕایەوە، لەکاتی گەڕانەوەی دا تووشی ژنێك بو لە دەو ڕوبار جلی دەشوشت، ئەو ژنە ژنی پاشا بو ئەم ژنە ئەوەندە جوان بو کەس لێی تێر نەدەبو لەبەر جوانی ڕوخساری ئەم ژنە میرە .

کاتێك هەمزە پاڵەوان لەڕاو گەڕایەوە ماڵێ کە پیرێژنێکیان هەبوو کارەکەریان بوو، هەمزە پاڵەوان بە پیرێژنەکەی گوت: ژنێکی وام بینییە دەبێ ئەم ژنە جوانە هەر بۆ خۆم بێ. پیرێژنە کارەکەرەکە کە لەماڵی هەمزە پاڵەوان بوو گوتی چیم دەدەیێ ئەگەر بۆت بینم؟ هەمزە پاڵەوان گوتی: کێشی خۆم پەتەت دەدەمێ! پیرێژنەکە هەستا بەدوای گەڕان بەدوای ئەم ژنە جوانە کە هەمزە پاڵەوان عەشقی ببوو، کاتێ چووە دەو ڕوبارێ ژنەکە لەوێ نەمابوو بەلاّم هەندێك پرچی زەردی لەشوێنی ئەو دیتەوە و هەڵسا بەدوای گەڕان لەشارەکەی بەهۆی ئەم پرچانەوە دەرکە بە دەرکە دەرۆزەی دەکرد و پرچەکانیشی لە بەرکی بوو، لە یەکێك لە دەرکەکانی دا ژنێك دەرگای کردەوە کە چاوی بەو ژنە کەوت یەکسەر زانی ئەو ژنەیە، کە هەمزەی پاڵەوان عەشقی ببوو. هەموو قسەکانی هەمزەی پاڵەوانی بۆ ئەم ژنە باس کردو گوتی: هەمزەی پاڵەوان عەشقت بوە و دەیەوێ بتهێنێ، ئەویش دەڵێ چۆن بتوانێ بتهێنێ هەمزەی پاڵەوان دەڵێ: من بەهۆی نەفەق لێرەوە هەتا ماڵی ژنەی بەژێر زەوی دا دەچم. کاتێك هەمزەی پاڵەوان چوە لای ژنەی کە ناوی (گوڵ خاتر) بوو لەگەڵی ڕێك کەوت هێنای دوو منداڵی لێ هەبوو کچێك ناوی (زولێخا)بوو کوڕەکەشی ناوی مەحەمەد بوو، ڕۆژێکیان پیاوە پاشاکە زانی کە گوڵ خاتر

مێردی بە هەمزە پاڵەوان کردییە لە هەمان کاتیشدا کوڕە پاشایەکی تر هەبوو ئەویش عەشقی ژنە میرەکە بوو ئەو کوڕە پاشایە دەیویست هەمزەی پاڵەوان بگرێت، بەڵام نەیان دەتوانی چونکە هەمزەی پاڵەوان زۆر بەتوانا بوو. بەڵام ژنەکەی کە گوڵ خاتر خیانەتی لەگەڵ کرد ڕۆژێکیان بە هەمزە پاڵەوانی گوت تۆ چۆن دەتوانی بەرزەفت بکرێی ئەویش گوتی من تەنیا بە مووی پرچم ئەگەر لە پەنجەی پێم هەتا پشتی سەر ملم تەنها بەو ڕێگایە بەرزەفت دەکرێم بەهیچی تر ناتوانن من بگرن .

کوڕی پاشای شار ڕۆژێکیان هاتە لای گوڵ خاتر و گوتی ئێمە دەرەقەتی هەمزەی نایەین بەشیر و بەشەڕ کردن، بەڵام ژنەکە کە فێر بوو بە هەمزەی گوت ئەو داوە پرچە لە پەنجەی پێم هەتا پشتی سەر ملت دەبەستم ئەویش ژنەکەی خۆش دەوێ و دڵی ناشکێنێ. بەفێر کوڕی پاشای شارەکە لەگەڵ پیاوانی هەمزەیان گرت و لە کون پێستەی چێرێ هەبوو هاویشتیانە ناوێ و سەریان دوری و لەسەر ڕێگای ڕوبار دایان ناو کردیان بە پرد، خەڵکیش بەسەری تێپەڕ دەبوو . ڕۆژێکیان گوڵ خاتر دەچێتە جل شوشتن لەڕۆخ ڕوبار لەگەڵ کچەکەی بەڵام شانەیەکیان لەبیر کردبو دەڵێتە کچەکەی بڕۆ بۆم بێنە، کچەکە بەسەر پردەکەی دا دەچێ و هەمزە لەو کاتەدا دەڵێ: وەرە بابی خۆت وەرە دەست و پێم بکەرەوە کچەکە بە هەمزەی دەڵێ پیرە سە ئەوە مای وەڵاهی دەبێ بە پیاوەکان بڵێم بێن بتکوژن. هەمزە لەو کاتەدا لەخوا دەپاڕێتەوە دەڵێ: (خوایە هەر کەی بای شەماڵێ ئەو کچەی دەی لە پنچك و پارێ ناوی هەمزەی بچێ لەزارێ) کچەکە کاتێ گەڕایەوە هەموو شتێکی لەبیر چوو بۆوە هەتاکو شانەکەشی لەبیر چوو بۆوە. بەڵام ئەمجارەیان کوڕەکەی دەنێرێ بۆ هێنانی شانەکەی واتە (شەی پرچی) کاتێك کوڕەکە بەسەر پردەکە دا ڕۆیی لەو کاتەدا هەمزە پاڵەوان گوتی: کوڕی خۆم ئەوە تۆی دە وەرە ڕزگارم کە کوڕەش گوتی: بابە ئەوە تۆی گوتی بڕۆ شمشێرەکەم بۆ بێنە بمکەوە کوڕەش بە دزی دەچێت شمشێرەکەی لەماڵ دێنێ و پێستەکەی پێ دەدڕێنێ و هەمزە دێتە دەرێ لەکاتی شەودا هەموویان لە ژوور دانیشتن و دەست دەکەن بە قاقای پێکەنین و خواردن و خواردنەوە بەڵام تەنیا کوڕەکەی لە کونچکێکی ژوورەکە بە تەنیا

دادەنیشێ لەو کاتەدا ژنەکە دەڵێ ئەم شەو خەونێکی ناخۆشم دیت کابرایەك بۆمان هات و هەمووماني کوشت تەنیا (مەحەمەد)ی نەکوشت، لەو قسانە دابو هەمزە پاڵەوان بە ژووریَ کەوت و یەك بەیەکی پیاوەکانی سەر پەلدا، بەلأم کاتێك نۆرەی ژنەکەی هات گوتی: کوڕە هەمزە نەکەی بمکوژی گوتی: ئەگەر تۆ خێزانی من بی ئەوا شمشێر ناتبڕێ شمشێری لەسەری داناو کردی بە دوو کەرتەوە . لەو کاتەدا مەحەمەدی کوڕی ترساو وای زانی ئەویش دەکوژێ بەلأم هەمزەی پاڵەوان گوتی: کوڕی خۆم وەرە تۆ کوڕی منی هەڵی گرت و لەسەر ملانی خۆی داناو ڕۆیشتن.

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: یەکەم: مووی سەری کە هۆی شکستی هەمزە پاڵەوانە، دووەم: شیری هەمزە پاڵەوان کە لە خۆیەوە ژنەکە دەکاتە دوو کەرت چونکە تاوانبارە.**

# پەنجە ڕواندن

**گێڕانەوە : شێروان حوسێن حەمەد حەسەن**

جارێکیان کۆمەڵە کچێك لەدێ دەچنە دەرەوە بە مەبەستی کۆکردنەوەی دار لەشاخدا چاویان بە دارێکی بەردار دەکەوێ کەمیوەیەکی جوانی پێوەیە حەزیان دەچێتە ئەو میوەیە هەر یەکێکیان بەوەی تریان دەڵێت تۆ بچۆ لێ بکەرەوە . هیچیان ناچن تا لەکۆتایی دا کچە بچوکەکە ڕازی دەکەن بچێتە سەر دارەکە ئەویش پێیان دەڵێت بە مەرجێك دەچم کە دەبێ چەند میوە لەسەلەکەی خۆتان کەن ئەوەندەش بۆ من تێبکەن و من بۆتان دەخەمە خوارەوە. کچەکە چووە سەر دارەکە و میوەکەی لێ کردەوە بەلاَم ئەوانەی خوارەوە هیچیان بۆ ئەو کۆ نەکردەوە داشیان نەگرتە خوارەوە کچەکە زۆری هاوار کرد پاڕایەوە بەجێم مەهێڵن بمهێننە خوارێ بەلاَم بێ سود بوو کچەکانی تر لێیان داو ڕۆیشت . کچە بچوکەکە لەسەر دارەکە مایەوە زۆر هاواری کرد گریا بەلاَم بێ سود بو کەس نەبو بێتە فریایەوە . تاکو ورچێکی لێ پەیدا بو خۆی هێنایە سەر شێوەی لاوێکی شۆخ و شەنگ و دەڵێ: من دات دەگرم بەلاَم بە مەرجێك شوم پێ بکەی ئەویش زۆر هەوڵی دا نەیکا بەلاَم چاری نەبو ڕازی بو ورچەکە هێنایە خوارەوە دوایی خۆی خست تاکو گەیاندیە ماڵەوە کچەکە زۆر چوە دڵی ورچەکە هەموو شتێکی پێ سپارد کلیلی هەموو دەرگاکانی دایە دەست وتی هەموو دەرگاکان بکەرەوە تەنها یەکێکیان نەبێ ساڵ هات و ڕۆیشت ئەو کچە لە هەوڵی ئەوە دا بوو کە دەبێ بزانێ ئەم ژوورە چی تێدایە . تا ڕۆژێك بڕیاری دا بیکاتەوە کە کردیەوە بینی ئەو ژوورە پڕیەتی لە ئێسقان و لاشەی مرۆڤ لاشەی نیوە خورا و هەندەك لەو لاشانە هێشتان زیندون . کاتێ ئەو دیمەنەی بینی زۆر ترسا لە ژوورەکە هاتە دەرەوە لە ورچ کەوتە ترسەوە بیری دەکردەوە دەیوت ڕۆژێك لەڕۆژان ئەوهاش لەمن دەکات کاتێك ورچ گەڕایەوە بینی کچەکە زۆر تێك چوە پێی وت: بۆ وات لێ هاتوە چییە؟. ئەو وتی: بیری دایکم و باوکم و براکانم دەکەم. پێی وت: خۆت ئەزیەت مەدە من دەچم لەشار براکەت بۆ دەهێنم لەسەر شێوەی مرۆڤ چوو لەشار براکەی بۆ

هێنا دوای ماوەیەك دانیشتن ووتی: بە كچەكە ئێمە دەچینە ڕاو تۆ لێرە بە.
چوون بۆ ڕاو لە داردا سەری براكەی بڕی و گۆشتەكەی بۆ هێنایەوە كچەكە
دەستی كرد بە گریان وتی كوا براكەم؟ وتی براكەت وتی بەمن زۆر وەرس بوم
لێرەدا ناحەوێمەوە دەڕۆمەوە ڕۆیشتەوە. كچەكە زانی درۆیە بەڵام وتی: باشە.
بڕیاری دا دەبێ ڕاستی بزانێ گەڕا تا پەنجەیەكی براكەی دۆزیەوە ئەوكات
زانی كوشتویەتی. هێنای پەنجەكەی لە خاك دا ڕواندی هەموو ڕۆژێك ئاوی
دەدا تاكو دارێكی لێ ڕوا ئەو دار بەرێكی دا ئەو بەرە ژنەكە خواردی منداڵێكی
كەوتە گیانیەوە منداڵەكەی بوو لەسەر شێوەی براكەی بوو.

لەلای دێوەش وەهای نیشاندا كە هی خۆیانە ئەو منداڵە گەورە بو ڕاستی
لای دركاند و ژوورەكەی نیشاندا باسی براكەی بۆ كرد ڕووداوەكەی هەمووی
بۆ گێڕایەوە وتی: ئێستا تۆ برای منی دەبێ تۆڵەی لێ بكەینەوە بەڵام دەبێ
لەكاتی خەودا بێت. وتی ئەوەش بزانە كە چاوی نوقابو ئەوا نەنوستوە بەڵام
ئەگەر چاوی كراوە بو ئەوا نوستوە كوڕەكە هێنای لەكاتی نوستن دا كە چاوی
كراوەبو بە خەنجەر چاوی كوێر كردن و لێیان دا ڕۆیشتن و تۆڵەی خۆی
كردەوە .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆكە: ورچ خۆی دەكاتە گەنج، كچە پەنجەیەكی
برایەكەی دەروێنێ و دەبێتە دار و بەرهەمی دەدات و كچە بەرهەمەكە
دەخوات، زگی دەبێ و منداڵێكی دەبێ لەسەر شێوەی براكەی .**

# خوشکێك و حەوت برا

**گێڕانەوە : بەختیار مەحەمەد مەحەمەد کەریم**

خوشکێك و حەوت برا لە شارێك دەژیان، بەڵام بەهۆی کارەساتی مردنی باوك و دایکیان ئەم حەوت برایە و خوشکەکە هەموویان دەر بەدەر دەبن خوشکیان ناوی فاتمەیە و لە براکانیان ون دەبێ حەوت براکان هەموویان دەست دەکەن بە گەڕان بەدوای ئەودا نایدۆزینەوە حەوت براکان لە خەم و خەفەتی فاتمەی خوشکیان ئاوارەی شاخ و دەشت دەبن لەدواییدا حەوت براکان دەچنە دەرەوەی شار لە ئەشکەوتێك ژیان دەبەنە سەر حەوت براکان ڕۆژانە خەریکی ئیشی کشتوکاڵ دەبن شەوانەش بۆ کاتی خەوتن دەگەڕێنەوە بۆ ئەشکەوت . ڕۆژانە ئەمە کاری ئەم حەوت برایە دەبێت هەتا ماوەیەکی دوور و درێژ . دێوێك هەبوو دەیکوژن لەپاشان دەیشارنەوە لەناو ئەشکەوت لەسەر گوڕەی دێوەکە پیازێك شین دەبێت بەهیچ شێوەیەك ئەم پیازە بخۆن چونکە لەشیان نیوە دەبو بە مەڕ ئەوی تریان دەبوو بە مرۆڤ. واتە قەدەغە بوو خواردنی پیازەکە.

ڕۆژێکیان فاتمەی خوشکیان هەواڵی براکانی خۆی دەپرسێ لە خەڵك خەڵکیش دەڵێن حەوت برا هەن لەناو ئەشکەوت دەژین. خوشکەکە سەردانی حەوت براکانی خۆی دەکات بە دزی خۆی لەپەنای قوژبنی ئەشکەوت خۆی دەشارێتەوە. نان و چای بۆ براکانی حازر دەکات بەڵام براکانی بەم کارە نازانن . کە خوشکیان هاتۆتەوە بۆ ناو ئەشکەوت بەم شێوەیە دوو ڕۆژ خوشکیان نانی بۆ ئەوان حازر دەکات . براکان کۆ دەبنەوە بۆ زانینی ئەم کارە. برا گەورەکەیان خۆی دەشارێتەوە بەڵام نەیتوانی بیدۆزێتەوە. ئەمجارە برا بچوکیان خۆی دەشارێتەوە ئەو دەیدۆزێتەوە لەدوایی دا هەموویان بەیەکرتی شاد دەبن. بەم جۆرە براکان ئیشی دەکەن و خوشکیان نانی بۆ ئەوان حازر دەکات بەڵام خوشکیان نازانێ کە پیازەکە شین بو لەسەر گۆڕی دێوەکە. ڕۆژێکیان حەوت براکان دەچن بۆ کار بۆ دابین کردنی ژیانی خۆیان فاتمەی خوشکیان هەستا بە حازر کردنی نان بۆ براکانی خۆی. هەستا

پیازەکە لەگەڵ نان تێکەڵی یەکتری دەکات . کاتێك کە براکانی دێنەوە نان دەخۆن هەموویان لەشیان نیوەیان دەبێتە مەڕ نیوەی لەشی تریان دەبێتە مرۆڤ. فاتمەی خوشکیان بەم کارە زۆر دڵگران دەبێت بەردەوام فاتمە ئەم حەوت برایە دەباتە دەشت بۆ ئەوەی گژ و گیا بخۆن شەوانەش دەیبردنەوە ئەشکەوت. فاتمەی خوشکیان زۆری پرسیار کرد بۆ چاك کردنەوەی براکانی خۆی. پیاوێك دەڵێ من براکانت بۆ چاك دەکەمەوە. بەمەرجێك فرمێسك لەچاوت نێتە خوارەوە ژنەکە دەڵێ باشە پیاوەکە دەڵێ دەبێ بێیت دارێکی زۆر ناسك بهێنی فاتمە دەچێت دارێکی زۆر ناسك دەهێنێت پیاوەکە حەوت براکان ڕیز دەکات. دارەکی زۆر توند لە برا گەورەکەیان دەدات فاتمەی خوشکی نەگریا واتە فرمێسك لەچاوی نەهاتە خوارەوە. هەتا دەگاتە برای بچوکی پیاوەکە دارێکی زۆر توندی لێ دەدات فاتمەی خوشکی دەست دەکات بە گریان برای بچوکی چاك نەبێتەوە چونکە فاتمە گریا بەم جۆرە برا بچوکی نیوەی لەشی دەبێت بە مرۆڤ و نیوەی تری لەشی دەبێت بەمەڕ فاتمە زۆری بۆ دەگریا هەتا دوایی هەردووکیان مردن .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: دێو، کوشتنی دێو و سەوز بوونی پیاز لە شوێنی و خواردنی پیاز دەبێتە هۆی ئەوەی براکانی نیوەیان ببێتە مەڕ و نیوە مرۆڤ، ئەم برایانە چاك دەبنەوە، ئەگەر کچە لەکاتی دار لێدانیان نەگریێ.**

# شێته و ژیره

**گێڕانەوە : ئاریان سەدیق عەزیز**

شێته و ژیره دوو برا دەبن باوکیان دەمرێ و تەنها مانگایەکیان بۆ جێ دەهێڵێ ، دایکیان دەڵێ: بڕۆن ئەو مانگایە بفرۆشن و کاسبی بکەن مانگاکە دەفرۆشن و پارەکە دەخۆن، پاشان بۆ کار کردن هەر یەکیان دەچێتە شوێنێ ژیره و خەنجەرێ دەچەقێنێ بە زەویدا ، ژیره دەڵێ ئەگەر دیوی لای من ژەنگی هێنا ئەوا مردوم و ئەگەر لای تۆش ژەنگی هێنا ئەوا تۆ مردووی و لێك جیا دەبنەوە، ژیره دەگاتە دێیەك دەچێتەماڵێك دەڵێ کرێکارتان ناوێ خاوەنی ماڵیش دەڵێ با دەمانەوێ، بەڵام من مەرجم هەیە ژیره دەڵێ چیە؟ خاوەن ماڵەکە ئەڵێ ئەوەیە هەر کاممان توڕە بوین ئەبێ بکوژرێ. ژیره ئەڵێ باش خاوەن ماڵەکەش ئەڵێ باشە بەیانی وەرە کارت پێدەدەم بەیانی ژیره دەڕواتەوە. خاوەن ماڵ دەڵێ ئەو پاچ و خاکەنازە هەڵگرە و ئەو سەگەش با بێ لەکوێ دانیشت ئەو شوێنە بکێڵە. ئەڵێ باش دەکەونە ڕێ سەگەکە دەچێتە سەر شاخێکی بەرز کە هەموو بەردە دادەنیشێ ، ژیرەش هەر چەند ناڕەحەت دەبێ بەڵام پێویستە خۆگربێ و توڕە نەبێ دەستدەکا بە کار کردن.

لای چێشتەنگاو منداڵێکی بچووك مەنجەڵێکی بچوك ماست و دۆ و نانی بۆ هێنا و وتی باوکم ئەڵێ ئەو ماستە بخوا بەڵام با سەر توێژەکەی نەشکێنێ ژیرەش توڕە دەبێ ئەڵێ چۆن شتی وا ئەکرێ واز لە کار دێنێ و دەچێ بۆ لای خاوەن ماڵ ئەڵێ من ئەم کارەم پێ ناکرێ، خاوەن ماڵ ئەڵێ توڕە بوی؟ ئەویش ئەڵێ بەڵێ، خاوەن ماڵ پێستی ژیره دەهێنێتەوە بەسەر چاو یاو دەیکوژێ. شێته پاش ماوەیەك بیری براکەی دەکەوێتەوە ئەڵێ با بچم بزانم چۆنە، سەیر دەکا خەنجەرەکە دیوەکەی لای ژیره ژەنگی هێناوە ئەویش دەست دەکا بە گریان و ئەچێ بەدوای مەیتەکەیدا بگەڕێ و تۆڵەی بسەنێ، ئەگاتە دێیەکە و ئەمیش ڕێك دەچێ بۆ ماڵی بکوژانی براکەی ئەڵێ کرێکارتان ناوێ، خاوەن

ماڵ وتی با دەمانەوێ بەڵام مەرجم هەیە، ئەویش ئەڵێ چیە؟ خاوەن ماڵ ئەڵێ هەر کاممان تورە بوین ئەبێ بکوژرێ، شێتەش ئەڵێ باشە خاوەن ماڵ ئەڵێ باشە بەیانی وەرە دەتخەمە سەر کارەکەت. بەیانی شێتە دەچێتەوە خاوەن ماڵ ئەڵێ ئەو پاچ و خاکەنازە هەڵگرە با ئەو سەگەش بێ لەکوێ دانیشت ئەوێ بکێڵە، یەکسەر تێدەگا کە ژیرەی براکەی لێرە کوژراوە شێتە ئەڕوا. سەگەکە لەسەر شاخێکی بەرزی پڕ لە بەرد دا دەنیشێ شێتەش یەك خاکەنازی پێ دادەکێشێ و دەیکوژێ بۆ خۆی دەچێ شوێنێکی تەخت دەکێڵێ، لای چێشتەنگاو منداڵێك دێ مەنجەڵێکی بچوك ماست و دو نانی پێ بو وتی باوکم ئەڵێ ئەو نان و ماستە بخوا. بەڵام با سەر توێژەکەی نەشکێنێ ، شێتەش ئەڵێ باشە بوەستە با تەواوی کەم و بنی مەنجەڵەکە هەڵدێنێ لە خوارەوە ماستەکە دەخواو سەرتوێژەکەی ناشکێنێ مەنجەڵە شکاوەکە دەداتەوە منداڵەکە و ئەڵێ ها بیبەوە ئەو سەگەشم کوشتوە. خاوەن ماڵ کاتێ ئەوە دەبیستێ تورە دەبێ و دێ بۆ لای ئەڵێ کورە ئەوە بۆ وات کردوە ئەویش ئەڵێ سەگەکە لە شوێنێك دانیشتوە مشتێ خاکی لێ نییە . مەنجەڵەکەش خۆت وتوتە سەرتوێژەکەی نەشکێنێ خۆ تورە نەبووی؟.

خاوەن ماڵ ئەڵێ نا تورە نەبوم دەستت خۆش بێ ئیشی ئێرە تەواو وەرەوە بۆ ماڵەوە ئێمە دەچین بۆ سەفەر ماڵەکە خاوێن کەوە بە شێوەیەك کە ڕۆنی لەسەر هەڵگریتەوە شێتەش ئەڕوا ماڵەکە ئەشواو یەك تەنەکە ڕۆن ئەڕێژێ و کۆی ئەکاتەوە کە دێتەوە سەیرە دەکات ماڵ چەورە ئەڵێ کورە ئەوە چیت کردوە؟ شێتەش ئەڵێ خۆت وات وتوە کە ڕۆنی لەسەر هەڵگرمەوە خۆ تورە نەبوی؟ ئەویش لە ترسا ئەڵێ نەوەڵا تورە نەبوم دەستت خۆش بێ من و خێزانم دەچین بۆ بازاڕ تۆ ئاو گەرم کە و سەر و ملی منداڵەکان بشۆ و یەکی پارویەك نان و کەرەیان بدەرێ و بیان خەوێنە. شێتە ئاو گەرم ئەکاو منداڵەکان یەك یەك دێنێ سەریان ئەکا بە ئاوە گەرمەکەدا هەموویان دەمرن یەکی پارویەك نان و کەرە دەداتە دەستیان و دەیانخاتە ناو جێگاو بەتانیان دەدا بەسەریان . کە دێنەوە خاوەن ماڵ هاوار دەکا ئەڵێ باوکە ڕۆ کورە چیت کردوە ماڵت وێران کردم. شێتەش ئەڵێ خۆشت وتوتە بە ئاوی گەرم سەریان

بشۆ خۆ توڕە نەبووی؟ ئەویش لە ترسی گیانی خۆی ئەڵێ نا توڕە نەبووم. بە ژنەکەی ئەڵێ با بڕۆین بەخوا سەرمان ئەخوات شێتەش پێیان ئەزانێ ئەو شتانەی پێچاویانەتەوە بۆ سەفەر لایان دەباو خۆی دەچێتە شوێنیان و گرێیەکی لێ دەدا بەسەر داو لە دەشتێکدا دەبن گورگ دێ بۆیان پیاوەکەش ئەڵێ ئاخ شێتە ئێستا لەکوێی بێنم چاریان کەی بۆم . شێتەش کۆڵ و بارەکەیاندا هاوار دەکا دێتە دەرەوە ئەڵێ لێرەم هەموو گورگەکان ڕاو ئەنێ. ژن و پیاوەکە زیرە ئەکەن و ئەڵێن چارمان ناچارە ئەم شەو کە خەوتین لەسەر پردەکە ئەخەوین شێتەکە ئەخەینە نێوانمان نیوە شەو هەڵتدەستێنم یەکی لایەکی نوێنەکەی دەگرین و فڕێی دەدەینە خوارەوە ، شەو دێ و دەخەون شێتە وا نیشان دەدا کە خەوتوە . پیاوەکە ئەڵێ ژنەکە بخەوە با نیوە شەو هەستین نەوەك خەبەری بێتەوە شێتەکە تێدەگا مەسەلە چییە کە ئەوان ئەخەون هەڵدەستێ ژنەکە ئەخاتە شوێنی خۆی و ئەخەوێ. نیوە شەو پیاوەکە هەڵدەستێ و وا ئەزانێ ژنەکەیەتی بە شێتە ئەڵێ هەستە با فڕێی دەینە خوار شێتەش قسە ناکا بەبێ دەنگی هەڵئەستێ و هەر یەکەیان لایەکی ئەگرن و فڕێی ئەدەنە خوار. شێتە ئەڵێ خوا عەفوی کا ئەویش ڕۆیی پیاوەکە هاوار ئەکا ئەڵێ بۆ وات لێ کردم ماڵت کاول کردم ، شێتە ئەڵێ بۆ توڕە بوی؟ پیاوەکە ئەڵێ ئەرێ وەڵلا هەر ئەو کاتە سەگەکەت کوشت توڕە بوم شێتەش ئەڵێ دە بێنە با تۆڵەی برا ئازیزەکەمت لێ بکەمەوە پێستی سەرت بێنمەوە سەر چاوتا. هەر لەوێ ئەویش ئەکوژێ و ئەیبەستێتەوە بە کەرەکەی و کەرەکە بەرەڵا ئەکا بە ناو کێڵگەکەیدا و هەرچی شەتڵە تەماتە و باینجان هەیە ئەیخوا خاوەن کێڵگەش هەر لە دوورەوە دێ یەکێك ئەکێشێ بە پشتە ڕاو ئەیخاتە خوارەوە یەکسەر شێتە بەڕاکردن دێ بۆ لای و دەست دەکا بە باوکە ڕۆ کردن و ئەڵێ باوکت کوشتم ئەبێ خوێنەکەی بەی ئەگینا ئەتکوژم .

جوتیارەکەش خوێنەکەی ئەداتێ و شێتەش بە پارەیەکی باش و سامانێکی زۆرەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای دایکی .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: ژەنگ هەڵهێنانی خەنجەرە لە کاتی مردنی یەکێك لە براکان.**

# مەحەمەد پاشا

**کۆکردنەوە: شـــیاو ڕەشـید ئەبوو بەکر**
**گێڕانەوەی: گوڵەندام عەبدوڵڵا مام یەحیا**

هەبوو نەبوو، کەس لەخوا گەورە تر نەبوو ، وەزیرێك هەبوو ، ئەو وەزیرە کچێکی زۆر جوان و نەشمیلانەی هەبوو و زۆری خۆشدەویست، بۆیە نەیدەدا بە هیچ کەسێك. لەو شارەش پیرەژنێك دەژیا هەتا بڵێی فەقیر بوو ، کەڕۆژ دەبووەوە ، دەچوە ناو بازاڕ و دەرۆزەی دەکرد و خواردنی لە خەڵك وەردەگرت و کەسی نەبو ، ڕۆژێکیان پیرەژن لەناو بازاڕ دەسوڕایەوە و زۆری برسی بوو بەبەردەمی قەسابێك دا ڕەتبووو قەسابەکە گۆشتی ورد دەکرد و دەیفرۆشت پیرەژن چوە پێش و داوای لە قەسابەکە کرد پشکێکی گۆشت بداتێ بیخوات قەسابەکە گوێی نەدایێ، پیرەژن دیسان داوای کرد ئەو جارە قەسابەکە زۆر توڕە بوو وپیرەژنی دەرکردە دەرەوە . پیرەژن لە بەردەمی دوکانەکە ئێسکێکی گەورەی بینی ، پشیلەیەك خەریك بوو بیخوات، خێرا ڕای کرد و هەڵیگرتەوە و لەناو سەبەتەکەی دانا، ئینجا لە ناو شار گەڕا چەند پارچە نانێکی پەیا کردو چوەوە بۆ کۆنە خانوەکەی خۆی کە لەناوەڕاستی شاردابوو، هەمو دیوارەکانی کۆن و داڕوخابوو دڵۆپەی دەکرد ، پیرەژن دانیشت بۆ ئەوەی نان بخوات. چەندی کرد ئێسکەکەی پێ نەشکا ، لەداخان فڕێیدا قوژبنێکی ژورەکە.
شەوێ پیرەژن زۆر ماندو بوو خەو ئەیبردەوە ، سەری بە بالیفەکەی کرد و بۆرژا ، لەناکاو گوێی لە دەنگێك بوو ، بانگی دەکرد : دایە ، دایە ، دایە ، ... .
ژنەکە هەڵسا خەوارو بوو، وتی: ئەوە کێیە ؟ تۆ کێی؟
دەنگەکە وتی: دایە من کوڕی تۆم.
ژنەکە وتی: بەڵام من کوڕم نییە ، تۆ لە کوێ هاتوی؟
دەنگەکە وتی: من لەناو ئەو ئێسکە بووم کە تۆ ئەمڕۆ بەیانی لە بەردەم دوکانی قەسابەکە هەڵتگرتەوە .

پیرەژن هەر خەوار و بوو وتی:. کوڕی خۆم من پیرەژنێکی فەقیرم، نەجێم هەیە و نەڕێ و خواردنیشم نییە بتدەمێ ، ئەگەر لەکن من بی هەر لە برسان دەمری ئەوە بۆ خۆم نان نییە بیخۆم ، نانم لەکێ بوو بیدەمە تۆ .

کوڕەکە وتی: دایە لەمەودوا خەمی نانت نەبێ ، هەمو ڕۆژێ من نانی تۆ پەیدا دەکەم و پێویست ناکات لەمەولا لە کۆلانان بۆ نان بگەڕێی، بەلام داواکاریەکم هەیە .

ژنەکە وتی : فەرموو داواکاریەکەت چییە؟

کوڕەکە وتی: بەیانی زوو بچۆ مالی وەزیر و داوای لێبکە کچەکەی بداتە من و هەر داواکاریەکیشی هەبێ ئەوە بۆی جێ بەجێ دەکەم .

ژنەکە نووستەوە و بەیانی کە هەستا دیتی ئەوە نان حازر کراوە و، مالەکە گەرمە و ئاگردانەکەی بۆ پێکراوە و خواردنی لە سەردانراوە، ژنەکە زۆر سەیری پێهات و لە دلی خۆی وتی: دیارە ئەو شەو ئەو قسانەی گوێم لێ بوو ئەو قسانەی کردم خەون نەبوو وبە ڕاستی ڕویداو ، بەلام چی بکەم؟ خۆ من ناتوانم بچمە داخوازی کچی وەزیر بەو جلە شڕ و وڕانەوە ، هەموو کەسێکیش دەزانی من مندالم نییە و فەقیرم و خەلك بە خێوم دەکات، ئینجا من چۆن داواکاریەکانی وەزیرم پێ جێ بەجێ دەکرێ. ئەو ڕۆژە بە سەرچوو هەر بیری دەکردەوە ، شەوێ دیسان کە بۆرژا گوێی لە دەنگێك بوو دەیگوت: دایە، دایە هەستە چیت بۆ کردم؟

پیرەژن بە دەنگێکی خەوالوو لەناو جێگەکەی وتی : نەچومە داخوازی کچە وەزیر .

کوڕەکە وتی: لەبەر چی نەچوی؟

ژنەکە گۆتی: کوڕم زۆر دەترسم، چونکە من ژنەکی فەقیر و دەست کورتم ونانم نییە بیخۆم، ئینجا چۆن بچمە داخوازی کچە وەزیری؟ وەزیر بەمە بزانێ یەکسەر سەرم دەپەڕێنێ و دەمکوژی .

کوڕەکە وتی: مەترسێ تۆ بچۆ داوای لێبکە و وەزیر هەر داواکاریەکی هەبوو بە منی بلێ و تۆ حەقت نەبێ .

پیرەژن وتی: باشە .

بەیانی دیسان هەستا نانی خوارد و چوە دەرەوە، بەڵام نەیوێرا بچیتە ماڵی وەزیر لە ترسان و لە شەرمان ، چونکە جلەکانی کۆن و کون کون بوون و هەموی پینە کرابوون، هاتەوە ماڵەوە و دانیشت. شەویٚ بۆرژا بوو کوڕەکە گۆتی: دایە، دایە ، هەستە پێم بڵیٚ وەزیر چی ووت؟

ژنەکە گۆتی: کوڕم نەچومە ماڵی وەزیر؟

کوڕەکە وتی: لەبەر چی؟

ژنەکە گۆتی: چونکە جلەکانم شڕ و وڕو کون کونن، زۆر شەرمم کرد بەو جلانەوە بچمە ماڵی وەزیری ، هەر دەریشم دەکەن ئەگەر بچم و ئەو داوایەیان لێبکەم .

کوڕەکە گۆتی: خەمی ئەوەت نەبیٚ، بەیانی کە هەستای لە خەویٚ هەمو شتێك حازر دەبیٚ و جلەکانت بۆ دادەنێم .

ژنەکە نوست کە بەیانی لەخەو هەستا دیتی جلێکی نوێی بۆ حازرکراوە، نانی خوارد و جلی خۆی گۆڕی و چو بۆ ماڵی وەزیر، لە دەرگای داو حەرەسەکان هاتن دەرگایان کردەوە و گۆتیان: فەرموو دایە چیت دەویٚ؟

گۆتی: دەمەویٚ چاوم بە وەزیری بکەویٚ .

گۆتیان: چ ئیشت بە وەزیریە؟

گۆتی: هاتیمە بۆ داخوازی کچەکەی .

حەرەسەکان زۆر بە پیرەژن پێکەنین و گۆتیان: دایە گیان، کچی وەزیری خواردنی کەسی وەکو تۆ نییە .

پیرەژن هەر سوڕ بوو لەسەر داواکاریەکەی و گۆتی: ئەمڕۆ دەبیٚ هەر چاوم بە وەزیر بکەویٚ و داوای کچەکەی لێبکەم .. .

حەرەسەکانیش نەیانهێشت و لێیان بوو بە قرە قڕ، لەوکاتەدا وەزیر بەویٚ دا تێپەڕی، گۆتی: ئەوە چییە ئەو دەنگە دەنگە چی ڕویداوە؟

حەرەسەکان گۆتیان: ئەم پیرەژنە، دەیەویٚ چاوی بە جەنابتان بکەویٚ .

وەزیری گۆتی: بێڵن، با پیرەژن بێتە ژورەوە .

پیرەژن چوە حزوری وەزیری، وەزیر زۆر بە وردی تەماشای کرد لە نوکی پێیەوە تا تەوقی سەری و پێی گوت : ها دادە چیت دەویست؟

پیرەژن بە ترس و لەرزەوە گۆتی: قوربان هاتیمە خوازبێنی کچەکەت بۆ کوڕی خۆم .
وەزیر گاڵتەی بە قسەی پیرەژن کرد و لە دڵەوە زۆری پێپێکەنی و بەخۆی دەوت: ئەوە هیچ بازرگان ودەوڵەمەندێك ناتوانیّ داوای کچەکەم بکات، ئەویش بە هەموو عەقڵیەوە هاتیە داخوازی کچی من بکات، بەلاّم بۆ ئەوەی دڵی پیرەژن نەشکێنیّ و نەیڕەنجێنیّ، بە پیرەژنی گۆت: دایە گیان، ئەگەر کوڕەکەت دەیەویّ کچی خۆمی بدەمیّ دەبیّ تا بەیانی قەسرێکی گەورەی بۆ دروست بکات کە لە خشتی زێڕ و زیو دروست کرابیّ، باخچە و باغێکی گەورەی هەبێت کە هەموو جۆرە باڵندەیەکی جوان و دەنگ خۆشی تیادا بێت و دو جۆگەش لە حەوشەکەی هەڵبقوڵیّ، یەکێك لە جۆگەکان هەنگوین بیّ و ئەوی تریان شیر بێت، هەمو خەڵکی ئەم شارە لێی بخۆن وە هەر گیز تەواو نەبێت و نەبڕێت .
شەویّ ژنەکە قسەکانی وەزیری هەر هەموی بۆ کوڕەکە گێڕایەوە .
کوڕەکە گوتی: ئەوە هەر هیچ نییە .
بەیانی زوو وەزیر بۆ نوێژیّ هەستا گوێی لە دەنگە دەنگێك بوو لە دەرەوە دەهات ، خێرا بە گورجی خۆی گۆڕی و چوە دەرەوە ، کە بینی ئەوە قەسرێکی گەورە دروست کراوە و هەر خشتێکی لە زێڕ و زیویە و دو جۆگەش لە حەوشەکە دێنە دەرەوە یەکێکیان هەنگوین و ئەوی تریان شیرە. وەزیر زۆر سەری سوڕمان لەو کارە و دڵی خۆش بوو لەدوای پیرەژنی نارد و، پێی گوت : من ڕازیم کچەکەم بدەمە کوڕت .
دەستیان کرد بە ئامادە کردنی شت و مەك و جیازی بووکیّ و حەوت شەو و حەوت ڕۆژان لە شاردا ئاهەنگ و بەزم شایی گەرا و، هەمو خەڵك بەشداری شاییەکەیان کرد . شەوی حەوتەم بووکیان بۆ ماڵی زاوا برد .
کە شەویّ بووك چو بۆ ژوری خۆی چاوی بە زاوا کەوت ، کوڕێکی بالاّ بەرز و کەڵەگەت و شۆخ دانیشتبوو ، کچە سەری سوڕما لە جوانی کوڕەکە و یەکسەر بوورایەوە .

بۆ بەیانی کە لەخەو هەستا بینی کوڕەکە لەویٚ نەماوە و ڕۆیشتووە، پاش چەند ڕۆژێك بەم شێوەی ، ماڵی وەزیری (واتە باوکی کچە)بۆ باوەخوندی کچەکەیان و مێردەکەی بۆ ماڵی خۆیان داوەت کرد، کچەش بە کوڕەکەی وت: ماڵی باوکم داوەتیان کردوین، دەبیٚ بەیانی لەگەڵم بێیت .

کوڕەکە پێی وت: تۆ خۆت بچۆ من ئیش و کارم زۆرە و ناتوانم لەگەڵت بێم.

کچەکە بەیانی خورامێکی بۆ ماڵی باوکی نارد و گۆتی : ناتوانین بێین ، چونکە مێردەکەم ئیش و کاری زۆرە .

جاری دوەم ماڵی باوکی کچە داوەتیان کردن ئەوجارەش کچە بە هەمان شێوە بە کوڕەکەی گوتەوە ، کوڕەکە پێی گوت: من ناتوانم بە ڕۆژ بە دەرکەوم چونکە جن منیان بەخێو کردوە و گەورەیان کردوم و جوانترین پێستی باڵندەیان داومەتیٚ تا کەس من نەبینیٚ، بەشەو لە پێستەکە دێمە دەرەوە و بە ڕۆژیش دەچمە پێستەکەوە و دەڕۆم نابێت کەسیش من ببینیٚ تەنیا تۆ نەبیت ، بشزانە ئەو نهێنیەی بەتۆم وت ئەگەر بێتو بەهەر یەکێکی بڵێی ئەوە لەکنت دەڕۆم و چاوت بەمن ناکەوێتەوە .

بەیانی کچەکە بە تەنیا چو بۆ ماڵی باوکی، دوای نان خواردنی نیوەڕۆ باوك و دایکی کچە و خزم و کەس و کاری لە کچەیان پرسی: بۆچی مێردەکەت لەگەڵت نەهاتو؟

کچە گوتی: ئەوەندە سەری قاڵە و مەشغوڵە، هیچ کاتی نییە بێتە داوەت و سەردانی خەڵکی. دوای ماوەیەکی تر وەزیر داوەتی کردنەوە و بە کچەکەی گوت: دەبیٚ ئەو جارە مێردەکەت هەر بێنی ئەگەر هەزار ئیش و کاریشی هەبێت، زاوای کچی شیرینم تاکو ئێستاکە نەبینیوە، وا دیارە مێردەکەت ناشیرینە یان کەم و کوڕیەکی هەیە .

ئیتر دایك و باوکی کچە و هەمو ئەوانەی لەویٚ بوون ئەوەندە پێیان لەسەر کچە داگرت و ئەوەندە پرسیاریان لیٚ کرد تا کچەکە لە دەمی دەرچوو حاڵ و مەسەلەی هەمو بۆ گێڕانەوە لەسەرەتاوە تا کۆتایی . کە گەڕایەوە ماڵەوە زۆر دڵی توند بوو ئۆقرەی لەبەر بڕا کە شەو داهات و کوڕەکە هاتەوە، کچە ئەوەی بەسەری هاتبوو بۆی گێڕایەوە .

کوڕە وتی: من ئێستا ناتوانم لێردا دابنیشم و دەبێ بڕۆم، چونکە نهێنی منت ئاشکرا کرد .

کچەکە زۆر گریا و پاڕایەوە کە بمێنێتەوە و نەڕوا بێ سود بوو دوای ئەوەی کچەکە حەوت شەو و حەوت ڕۆژ چاوەڕوانی کوڕەی کرد بگەڕێتەوە، بەلاّم بێ سود بوو کوڕە ڕۆیشت و نەگەڕایەوە، لە داخان کچە نەخۆش بوو کەوتە ناو جێ، هەمو دەم دەگریا و فرمێسکی دادەباراند لەدوری کوڕەکە و سەر تاپای شارەکە جلی ڕەشیان پۆشی. هەردو جۆگەکە (هەنگوین و شیر)وشکیان کرد و باخی قەسرەکە کز بوو دار و گوڵ و گوڵزاری باخەکە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کز و بێ زەوق تر دەبوون و هەمو گەلاّ و گوڵیان هەڵوەراند و سەوزاییان نەمابوو ، سێ ساڵ بەم شێوەیە ڕۆیشت .

کچە وەزیر کۆمەڵێك خورامی هەبوو هەر یەکەیان ئیشێکی بۆ دەکرد یەکێك لەو خورامانەی هەمو دەم لەگەڵ کچەکە بوو هەرگیز لێی دانەدەبڕا و زۆری خۆش دەویست، ڕۆژێکیان کچە خورامە خۆشەویستەکەی بە ئیش ناردە شارێکی تری نزیکیان و خورامەکە تا ئیشەکانی تەواو کرد زۆری پێ چو درەنگ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە شەوێ درەنگ گەیشتە ماڵەوە ، بەسەر دەرگای ماڵەکە کەوت و هاتە ژورەوە و وردە وردە بەرەو چێشتخانەکە هات، کە بینی ئاگر داگیرساوە و چەند مەنجەڵێکی گەورەی لەسەر دانراوە و کەسیان لە دەور و بەر نییە، خورامەکە زۆر توڕەبوو لە دڵی خۆی گۆتی: بزانە چونکە ئەمڕۆ من لێرە نەبووم و خانمەکەم سەر زەنشتی ئەو چێشتکەرانەی نەکردیە، ئاگر و خواردنیان ئاوا بەجێ هێشتوە و ڕۆیشتینە. کە زیاتر نزیك کەوتەوە و لە پەنجەرەوە تەماشای ژورەوەی کرد لە هێکڕا سەری یەکێك لە مەنجەڵەکان هەر دراوە و بە کەوگیر برنجەکەی ناوی تێك دەدرا و کەسیش دیار نەبوو خورامەکە لەم دیمەنە زۆر ترسا و بەخۆی گوت: بەخوای من لەبەر ماندی بوونی ڕێگا چاوم ڕێشکە و پێشکە دەکات، دەنا کو ئەو شتانە لەخۆیانەوە دەجوڵێن!؟ چوە ژوری خۆی نوست. لۆ بەیانی چوە خزمەت خانمەکەی و ئەو ئیشانەی کە پێی ڕاسپاردرابوو هەموی بۆ کردبوو دایە دەستی و سەفەرەکەی لەسەرەتاوە تا کۆتایی بۆ گێڕاوە هیچی لەبارەی شەوی ڕابردوی بۆ

نەگێڕایەوە، شەویٚ دیسان بە تەنیا لە کونجێکی چێشتخانەکە خۆی مات کرد و گوێی خۆی هەڵخست کە بووە سەعات دوانزەی شەو تەق و هۆڕهات و مەنجەڵ خرایە سەر ئاگر و شیو حازر کرا، ئەوجارە خورامەکە دەستی برد خواردنەکە بخوا، یەکێك کەوگیرێکی لە دەستی دا و گوتی: نەکەی بیخۆی خواردنی (محمد . پاشا)یە و بۆ کەس نییە لێی بخوا .

کچە زۆر ترسا و دەستی کێشایەوە و ڕۆیشت، بەیانی ئەوەی کە ئەو دو شەوە دیتبووی بە دورد و درشتیەوە هەموی بۆ خانمەکەی گێڕایەوە کە گەیشتە ناوی (محمد . پاشا)کچەکە گەشایەوە و پێی گوت: ئەو شەو منیش لەگەڵت دێم و دەمەویٚ ببینم شەوی سێیەم کچە لەگەڵ خورامەکەی خۆیان لە قوژبنێکی چێشتخانەکە مات کرد و تەماشایان دەکرد کە خواردنەکە پێگەیشت خورامەکە دیسان دەستی لۆ خواردنەکە برد بیخوا، کەوگیرێکی لەدەستی درا و یەکێك بەسەری دا قیڕاندی: ئەو خواردنە هی (محمد . پاشا) یە دەستی لۆ نەبەی ، ئەو جارەیان کچەکە چوە پێش و دەستی برد خواردنەکە بخوا دیسان یەکێك کەوگیری لە دەستی داو هەمان قەسی پێشوی دوبارە کردەوە ، بەلاٌم ئەمجارەیان دەنگێك لەولا تر بەوەی تری گوت: لێی گەڕیٚ با بیخوات ، ئەو کەسەیە کە (محمد . پاشا)عاشقی بووە و بۆی سوتاوە، ئەگەر شامان بزانیٚ نەتهێشتوە ئەوە زۆر توڕە دەبێت و هەڵمان دەواسی .

کچەکە بە بیستنی ئەم قسانە فرمێسك لە چاوەکانی هاتە خوارەوە و داوای لیٚ کردن کە شوێنی (محمد . پاشا)ی پیٚ بڵێن گەلێك پاڕایەوە، تا یەکێکیان گوتی: پاش کەمێکی تر دێتەوە بۆ نان خواردن و لە باخەکە دادەنیشێت تا بەری بەیان، بەلاٌم دەبیٚ ئاگادار بیت چونکە کۆمەڵێك پاسەوانی لەگەڵە، ئەگەر ئەوان بتبینن ئەوا هەل هەلت دەکەن، چونکە زۆر لێت داخ لە دڵن کچەکە چوە ناو باغەکەو لە پشت داران خۆی شاردەوە و چاوەڕێی کرد لە پڕێك بینی باغەکە گەشایەوە و دار و درەخت و دەوەنی باغەکە پشکوتن و گەشانەوە و گوڵ و گوڵزار کرانەوە و باغەکە بۆنێکی ئەوەندە خۆشی لیٚ دەهات مێشکی بەنی ئادەمی دەکاساند، کچەکە زۆر سەیری پیٚ هات و تەماشای کرد

(مەحەمەد پاشا)بەدیار کەوت و لە ناوەڕاستنی باغەکە مێزێکی بۆ ڕازێنرابۆوە و دانیشت .

بولبول و تەیرو تواری ناو باغەکە دەستیان کرد بە چڕینی ئاوازی خۆش خۆش و هەردو جۆگەکە ژیانەوە، بەڵام (مەحەمەد پاشا)زۆر بە غەمباری و دڵ تەنگی دانیشتبوو .

کە لەنان خواردن بۆوە بە پاسەوانەکانی گوت: لێم گەڕێن با سەرخەوێك بشکێنم. پاسەوانەکان ڕۆیشتن کە بەتەنیا مایەوە کچەکە بە لەسەر خۆیی چوە کنی ، (مەحەمەد پاشا)هەر بە دیتنی کچەکە گەشایەوە و خەندەی کەوتە سەر لێوان و دانیشتن .

کوڕەکە گوتی: چی دەکەی لێرەدا؟ ئەگەر پاسەوانەکانم بزانن تۆ لێرەی دەتکوژن و لەناوت دەبەن .

کچەکە گوتی: ئەوەندە پەرێشان و مشتاقم بۆت، گوێم لە ڕۆحی خۆم نییە، چونکە ژیانم بەبێ تۆ تاریکستانە. کوڕەکە گوتی: تۆ وات لێ کردم سەرم هەڵبگرم و بەجێت بهێڵم، تەنیا یەك چارەسەریش هەیە ئەویش بە دەست تۆیە.

کچەکە گوتی: زوو پێم بڵێ چییە؟ تا بۆتی بکەم، ئەگەر ڕۆحی خۆشمی لەسەر دانێم ئەوە هەر بۆتی دەکەم .

کوڕکە گوتی: دەبێ سەر هەڵبگری و بچی بۆ ئەو شارەی کە پاشایەکی هەیە ئەو پاشایە کچەکەی هەموو شتێك بە ڕەش و سپی دەبینێ و پاشا هیچ حەکیم و زانا نەمایە ئەو کچەی نیشان نەدات، بەڵام چارەی پێ ناکرێ، ئەو کچەش دوو تاڵە مووی ڕەنگا و ڕەنگ لە پشتی سەری هەیە، ئەگەر بێت و ئەو تاڵە موانەی لێ بکەیەوە، ئەوا کچەکە چاك دەبێتەوە و ئەو تاڵە موانەش دوای هەڵچڕانیان یەکسەر دەبێتە کلیل و دەرگای ئەشکەوتێکی پێ دەکرێتەوە ، کەکانی ڕەنگا و ڕەنگی تیایە ئەگەر بێت و من لەو کانیە دا مەلە بکەم دێمەوە سەر شێوەی جارانی خۆم و دەتوانین پێکەوە بژین، بە مەرجێ لەو شارەش نەمێنین و بچینە شارێك کە کەس نەماننناسێ .

کچەکە گوتی: باشە من ڕازیم و دەبێ ئەو شارەش ببینمەوە .

کوڕەکە گوتی: من دور بە دوری چاودێریت دەکەم و کە لە شارەکە نزیك کەوتییەوە ڕێ نیشانەدرێکت بۆ دەنێرم .

لەو قسانە دابوون دەنگی کەڵەشێر بەرز بۆوە و کوڕەکە بە کچەکەی گوت: هەر ئێستا ئێرە بەجێ بهێڵە پاسەوانەکانم دێن دەبێ لەگەڵ گزنگی بەیان بڕۆین .

کچەکە دەستی بە گریان کرد و چوە پشت دارەکان پاش کەمێك بینی (مەحەمەد پاشا) هەستا و چوە پێستی کۆترێکی جوان دڵت نەدەهات تەماشای بکەی هەموو پەڕەکانی ڕەنگا و ڕەنگ بوو، کۆمەڵێکی کۆتری لەگەڵ بوو ئەوانیش هەر یەکەیان ڕەنگێك بوون .

هەر کە کۆترەکان هەڵفڕین لە باغەکە دەرچوون، هەموو دار و درەخت و گوڵ و گوڵزاری باغەکە دەستیان بە شین و شەپۆڵ کرد و گەڵا و گوڵیان وەراند و هەرچی باڵندەی دەنگ خۆش هەبوو دەستیان بە شین و گریان کرد و پەڕ و باڵی خۆیان وەراند و جۆگەکان سەر لەنوێ ووشك بووون .

کچەکە بەیانی بە خورامەکەی گوت: کەل و پەلەکانم خڕ بکەوە و ئەو شارە بەجێ دێڵین دەبێ ئەو شارە بدۆزمەوە کە دەرمانی (مەحەمەد پاشا)ی لێیە بە کەسیش نەڵێی تەنیا من و تۆ پێکەوە دەچین بە دزی نابێ کەس بزانێ .

کچەکە زۆر شار و وولاتان گەڕا و شار نەما سەری پێدا نەکات بەلاّم بێ سود بووو. نیوەڕۆیەکی زۆر ماندی و برسی بووون و لەژێر دارێك دانیشتن بۆ حەسانەوە .

خورامەکەی گوتی: خانمەکەم ئەوە کوخێکم لێ دیارە چاکتر وایە بچینە ئەوێ بەڵکو ئاوەدان بێ و تۆزێك خواردنمان دەست کەوێت، کچەکە و خورامەکەی وردە وردە بەرەو کوخەکە چوون کە نزیك کەوتنەوە دیتیان پیرەژنێك لەبەر دەرگا دانیشتوەو تەشی دەڕێسێ ، سلاّویان لێ کرد و دانیشتن ، پیرەژن زۆر بەخێرهاتنی کردن و شوێنی حەسانەوەی بۆ دابین کردن و خواردنی بۆ ئامادە کردن ، دوای حەسانەوە پیرەژن پێی گوتن: ئەوە بۆ کوێ دەچن؟ وە بەدوای چی دادەگەڕێن؟

کچەکە گوتی: بەدوای دەرمانێك دادەگەڕێم بەلاّم زۆر گەڕام و تا ئێستا مەندۆزیەوە .

پیرەژن گوتی: کەواتە تۆ ژنی (مەحەمەد پاشا)ی؟
کچەکە گوتی: بەڵێ ، بەڵام تۆ چۆن (مەحەمەد پاشا)ی دەناسی؟
پیرەژنەکە گوتی: (مەحەمەد پاشا)منی ڕاسپاردوە ، کە ڕێت نیشان بدەم ئەو شارەی لێشی دەگەڕێی لە پشت ئەو دارستانەیە پێش ئەوەی بڕۆن دەمەوێ نەسحەتێکتان بکەم و چاك لەگوێی بگرن .
کچەکە گوتی: بیلێ داپیرە گوێم لێتە .
پیرەژن گوتی: کە گەیشتنە شار هەوڵ بدەن ببنە خورامی کچی پاشا و زۆر خزمەتی بکەن و بە دڵی ئەو هەڵسن و دانیشن ، تاکو خۆشەویست بن لەلای و بۆ هەموو شوێنێك لەگەڵ خۆیا دەتانبات، کچی پاشا دوو تاڵە مووی ڕەنگا و ڕەنگی لە پشتی سەری هاتییە و بەهۆیەوە شتەکان بە ڕەش و سپی دەبینێ ، ئەگەر ئەو تاڵە موانە بپچڕێنی چاك دەبێتەوە هەر کەسێك دەستی لۆ ببات و ڕای بکێشێ لە شێنەیی ئەوا ئازاری کچەکە دەدات و پاشاش بەمە بزانێ یەکسەر ئەو کەسە دەکوژێ، بەڵام کچەکە هەموو هەفتەیەك لەگەڵ خورامەکانی دەچێ لە حەمام خۆی دەشوات لەکاتی خۆ شوشتنی دەبێ ئەو موانە ڕا بکێشی و ئەو کات کچە پاشا هەستی پێ ناکات لەبەر گەرمی حەمامەکە ئەو حەلە دەتوانی (مەحەمەد پاشا)ڕزگار بکەی .
کچەکە گوتی : سوپاس داپیرە بۆ نەسحەتەکەت و لە بیری ناکەم .
پاش ئەوەی خوا حافیزیان لە پیرەژنەکە کرد و کەوتنە ڕێ ئێوارە گەیشتنە شارەکە و لە کەلاوەیەك خۆیان حەواندەوە و بەیانی جلی خۆیان گۆڕی و جلەکانی خۆیان لە کەلاوەکە شاردەوە ، چوونە بەردەمماڵی پاشا و داوای کاریان کرد ، پاسەوانەکانی پاشا هاتنە دەرەوە و بردیانە ژوورەوە کە چوونە ژوورەوە شاژن گوتی: دەبێ یەکێکتان ببێتە خورامی کچەکەم و ئاگاداری بکات و بۆ هەموو شوێنێك لەگەڵی بێت ، ئەوی تریشیان بچێتە چێشتخانە کچە وەزیر بووە خورامی کچی پاشا و خورامەکەشی چوە چێشتخانە . کچەکە چوە ژووری کچی پاشا ، بینی کچێك دانیشتوە و خورامێکیش پرچی بۆ شانە دەکات و کچەکە ئەوەندە جوانە دەڵێی گوڵە ، بەژن و باڵایەکی جوان و قژێکی

درێژی ڕەش و دوو چاوی سەوزی گەش ، کچە پاشا کە چاوی بە خورامەکەی کەوت زۆر خۆشی ویست و هێنای لە تەنیشت خۆی دانا .
کچەکە دوو سێ حەفتە ئاوها مایەوە، کچی پاشا و شاژن زۆریان خۆش دەویست چونکە بێ دڵی ئەوانی نەدەکرد ، شاژن ڕۆژێك بە کچەکەی گوت: ئەوە دوو حەفتەیە دەبێ تۆ لەگەڵ کچەکەم بچیتە حەمام و سەری بشۆی چونکە خورامەکانی تر هەموو حەفتەیەك ئازاری دەدەن و بە هێمنی لەگەڵی دا ناجوڵێنەوە .
کچەکەش لە خوایەکی دەویست بەبێ یەك و دوو گوتی: باشە خانمەکەم .
لۆ بەیانی لەگەڵ کچی پاشا چووە حەمام ، لەکاتی سەر شوشتن تاڵە مووەکانی دەرهێنا و خستیە گیرفانییەوە ، کچە پاشا کە چاوی کردەوە بە خورامەکەی گوت: زۆر سەیرە ئەو شتانەی جاران بە ڕەش و سپی دەمدیتن ئێستا هەر یەکەیان ڕەنگی خۆی هەیە . کچەکە پێی گوت: خانمەکەم ئەوە چاوەکانت چاك بووونەتەوە .
کچە پاشا زۆر دڵخۆش و بەختەوەر بووو تا گەیشتە ماڵەوە هەر تەماشای دەور و بەری دەکرد و دەیگوت : ئای دونیا چەند جوانە! ئەی ئەو گوڵ و گوڵزارانە چەندە جوانن! من ئێستا هەموو شتێك وەکو خۆی دەبینم .
پاشا کە بەم خەبەرە خۆشەی زانی گوتی: هەر کەسێك ئەو کچەی منی چاك کردۆتەوە ئەوا با بێتە لام و بخوازێ ماڵی دنیایێ .
کچە وەزیرەکە چوە بەردەم پاشا و گوتی: من کچەکەی تۆم چاك کردۆتەوە و خۆشم کچە وەزیرم و لەشارەکەی خۆم سەرم هەڵگرتوە بۆ ئێرە تاکو ئەم کچە چاك بکەمەوە پاشاش لە پاداشتی ئەو چاکەیەی کە کردی پێی گوت: چیت دەوێ لە ماڵی دونیا بیخوازە تا بۆتی بکەم .
کچەکە گوتی: خورامەکەی خۆم بدەنەوە و سێ ئەسپی زۆر چاك و بە غارم دەوێ لەگەڵ دەستە جلێکی پیاوانەی کۆك و جوان .
پاشاش داواکاریەکەی بۆ جێ بەجێ کرد و هەر سێ ئەسپەکەشی بە خشڵ و زێڕ و زیو بۆ ڕازاندەوە، کچەکە و خورامەکەی ماڵئاواییان کرد و ڕۆیشتن و ڕۆیشتن و ڕۆیشتن، زۆر دەشت و بیابان و دارستانیان بڕی بەڵام هیچ

نیشانەیەکی (مەحەمەد پاشا)یان لێ بەدیار نەکەوت، تا گەیشتنە سەر کانی و کانیاوێکی خۆش بۆ حەسانەوە لایاندا ئەوێ دوای ئاو خواردنەوە کچەکە دەست نوێژی دەشوشت لە ئاوەکەوە سەیری کرد، بینی ئەوە کۆترێکی ڕەنگا و ڕەنگ لەسەر چڵێك لەسەر ڕێگای هەڵنیشتوە، کە سەری بڵند کرد و سەیری کرد ، کۆترەکە بەرەو ئەشکەوتێکی قەد پاڵی چیایەکی بەرز هەڵفڕی و کچە و خورامەکەی خێرا خۆیان پێچایەوە و بەرەو ئەوێ چوون، کە گەیشتە ئەشکەوتەکە بینی دەرگای ئەشکەوتەکە بە قوفڵێکی ڕەنگا و ڕەنگی گەورە داخراوە و کۆترە ڕەنگا و ڕەنگەکەش لەسەر قوفڵەکە هەڵنیشتوە و کۆمەڵێ کۆتری تریشی کە هەریەکەیان ڕەنگێك بووون لە دەوری بووون .

کچەکە کلیلەکەی دەرهێنا و قوفڵەکەی کردەوە کۆترەکەی لەگەڵ خۆی برد و چووە ژوورەوە ، تا گەیشتە سەر کانی و ئاوەکە ، کۆترەکە مەلەی تیا کرد و بۆوە هەمان کوڕەکەی جاران و کچەکە دەستە جلەکەی دایێ و ئەویش کردیە بەری و لەگەڵ کچە دەستی یەکیان گرت و خورامەکەشیان لەگەڵ خۆیان برد، چوونە شارێکی زۆر دوور کە کەس نەیان ناسێ قەسر و قسورێکی گەورەیان کرد هەموو ژیانیان بە خۆشی و شادی تیا بەسەر برد .
کراشم دڕا و هیچم پێ نەبڕا .

*ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: قسەکردنی کوڕی ناو ئێسك و چونە ناو پێستی باڵندەو گەڕانی کەوگیر لەخۆوەو دوو تالەمووی دەبنە کلیل و زۆر ڕەگەزی تر .
ئەفسانەیەکی زۆر نوێی یە.

# ئەو کچە پاشایەی شو بە پەرییەك دەکات

**کۆکردنەوە: شیلان عوسمان عەبدولڕەحمان**

پیرە مێردێك هەبوو، هەموو ڕۆژێ دەچوو، چیلکە داری کۆ دەکردنەوە ڕۆژەك تولە مارەك خۆی لەناو چیلکە دارەکان شاردبۆوە و لەگەڵی چوەوە ماڵێ، کە پیرە مێرد گەیشتەوە ماڵێ تولە مار لێی دەرهات پێی گۆت (پێت وەدەدەم ئەگەر نەچی کچی پاشام بۆ داخوازی بکەی)پیرە مێردی بەستەزمان هەستا چوو بۆ لای پاشا گۆتی (قوربان چت لێ بشارمەوە بۆ ئیشێك هاتووم خۆت دەبینی من پیاوێکی فەقیرم و پیرم هەموو ڕۆژ دەچم چیلکە دار کۆدەکەمەوە ئەو ڕۆ کە هاتمەوە ماڵ تولە مارەکم لێ دەرپەڕی وتی دەبێ کچی پاشام بۆ داخوازکەی دەنا پێت وەدەدەم ........) .

پاشا گۆتیە: دار و دەستەی خۆی، با سەری ببڕین کو قسەی وا دەکا، یەکەك لەوان گۆتی: (ئێستا قوربان ئەگەر سەری ببڕین ئەوا خەڵکی دەرێن دەرۆزەکەر بوە چویتە بەردەرکەی سەریان بڕیە) ناوەڵا بارەکی بەسەر هەرنێ پێی جێ بەجێ نەکرێ ئەوجا لەسەری دەدەین. جا بە پیرەمێردیان گوت: (دەبێت هەتا سبەینێ قەسرەکی حازرکەی بارەکی لە زێڕبێ و بارەکی لە زیو چوار هۆدەشی تێدابێت کە یەکیان زستانی یەك هاوینی یەك پایز یەك بەهار ئەگەر چو سەری ببەیە ناو هۆدە زستانەکە برێی چەند سەرمایە بچیە ناو هاوینەکە برێ چەند گەرمە هەر هۆدە و بە وەرزی خۆی) .

پیرە مێرد هاتەوە گۆتیە تولە مارەکەی ئەویش گۆتی باشە بۆ منی لێ گەڕێ، هەر کە بەیانی داهات توولە مار قەسرە داواکراوەکەی لەبەر دەمی کۆشکی پاشا حازر کرد بوو، پاشا قسەی نەما ناچار کچەکەیان کردە بوك و دایانە تولە مار، تولە مارەکەش بە قەستی خۆی وەلێ کردبوو، بەخۆی پەری بوو شەوێ بوە کوڕە گەنجەکی هەن جوان هەن جوان! ناویشی میر هاوجان بوو کە سبەینە داهات کچە پاشا لە خەوێ هەردەستی دەبینی (میر هاوجان) بزر بووە دەرێتە پیرەمێرد کا (میر هاوجان) دەم وێتەوە، پیرە مێرد گۆتی: نازانم لە

**کوێیە؟ فاتمەش (کچە پاشا)هەستا دەستی کرد بە گەڕان بە دوای (میر هاوجان)ی مێردی لەو گوند بۆ ئەو گوند لەو شاخ بۆ ئەو شاخ حەوت ساڵی پێ چوو، لەو گەڕانە کراسی هەموو لەبەر دڕا تا گەیشتە ماڵەکی دیتی ژنەك وا دەنیشتیە فاتمە پێی گۆ:. ئەرێ خورامکەری ڕاناگرن ، ژنەکەش خەسوی بو(داکی میرهاوجان) .**

**میر هاوجانیش چاوی پێ کەوت گۆتی: با ڕادەگرین داکی میرهاوجانیش هەرچی ئیشی ئەو ماڵە بو پێی دەکرد، هەن لە گەری خراپ بوو هەن لەگەری خراپ بوو، جا بە فاتمەی گۆ هەستە ئەو هۆدەم هەموو لۆ بە فرمێسکی برشێنە ، میرهاوجان وەکێ گوێی لەو قسەیە بوو چووە سەر هۆدەکە کونەکی لێ بو دۆخینی خۆی کردەوە و گۆتیە فاتمەی لاکۆ با بەمیزی لۆت بڕشێنم فاتمە چو گۆتیە داکی میرهاجانی وەرە ڕشاندم گۆتی :. بە فرمێسکت رشاند گۆتی :. ئا ، گۆتی :. ئێی دەزانم ئەوە فێری میرهاوجانیە .**

**ئەوجارە گۆتی بڕۆ ماری خوشکم (کدولە و هەمساز و سمتورا) ی بێنە ژنی لۆ میرهاوجانی دێنین. میرهاوجان گوێی لێ بو پێی گۆت: ئەوە نەلەسمە (تەڵە . کەمین)ی بۆ دانای باپێت برێم دەڕۆی دەڕۆی دەگەیە کانیەکی (کێم و خینی)هەندەکی لێ بخۆوە هیچت لێ ناکات، ئەوجارە دەگەیە پارچە عەردەکی هەموی دڕك و دار و قونجیلکەیە برێ:. ئەلاٚ چەند نەرمە نەرم دەرێی دۆشەك و مافورە ئەو جا دڕکەکە چ لە پێست ڕاناچی، میرهاوجان هەندەك لۆکەی دا فاتمەی گۆتی لە دوای دا دەگەیە دارەکی بە زەنگور دەبێ هەر زەنگورە و قیچە لۆکەکی لە ناوینێی دوڕانە گۆشتیش ببە دو سەی لێیە یەکەو ڕانیان بدێ ئەو جادە گەیە ئەوجا دەگەیە کن دەرکەی لەوێش دو وراغ هەیە یەکیان جۆو کای لە پێشیە یەکیان ئێسکی لە پێشە ئەتوو ئێسکەکەی فڕێ دەو جۆ و کایەکە بەش کە لەبۆ هەردو وراغەکەی نیوەی لە پێش یەکیان دانێ و نیوەکەی تریش لە پێش ئەوی دی دانێ ، جا دەچیە ژۆرێ ساز و سمتورەکەی تریش لە سەر**

[3] کەمان و ساز و عودی ئێستایە .

سەرتە یەکسەر دەستی لۆ درێژ کە و بیهێنەو هەرێ ، فاتمەش بەڕێ کەوت هەرچی میرهاوجان پێی گۆتبوو جێ بەجێی کرد.

چووە کن کانی کێم و خێن هەندەکی لێ خواردەوە چووە سەر عەردی بە دڕك و داڵ گۆتی (ئەلاٚ چەند نەرمە دەرێی مافور و دۆشەکە) عەردەکەش هیچ ئازاری نەدا ، ئەوجا چوە کن داری بەنگورێ هەرزەنگورە و قیچە لۆکەی تێنا دوو سەگەکەش لەولای دیت یەکەو ڕانە گۆشتەکی فڕێدایە پێشیان ڕۆیی هەتا چۆوە کن دەرکەی دیتی دو وراغی لێیە یەك ئێسکی لە پێشە یەك کاو جۆ هەستا کاو جۆکەی لۆیان بەش کرد چوە ژۆرێ پلکی میرهاوجانی چاوی پێ کەوت گۆتی (ئەوە لۆ ساز و سمتورای هاتی وەرە بتدەمێ)فاتمەش ئەوهای کردێ دیتی وا لەسەر سەریتی ڕاست پڕی دایێ و بردی و هەرات .

ژنەکەش هاواری لێ برند بو گۆتی: وراغەکانی بەردەستیی گۆتی: بەدوی کەون بیگرن گۆتیان: (وەلاٚ بەدوی ناکەوین ئەتو ئێسکمان لە پێش دادەنێی ئەو کاو جۆمان لۆ دادەنێ)ئەوجارە گۆتیە سەیەکان مەیەڵن بڕوا بیگرن گۆتی: (ئا .. ئا ئەتو ئێسکمان نادەیێ ئەو گۆشتمان دەداتێ) گۆتیە داری بە زەنگورێ ئەتو مێڵە بڕوا گۆتی: (ئا ئەتو هەتا ئێستا قیچە لۆکەت تێ نەناین دایم زڕو زڕ و زڕ)گۆتیە عەردی بە دڕك ودال لە پێ ڕاچو دڕکی پیس گۆتی (ئا ئەتو دەرێی دڕکی پیس ئەو دەرێ چەند جوانی دەرێی مافور ودۆشەکی) ئینجا دەرێتە کانی کێم وخێن(دەخیلت بم نقومی بکە) گۆتی: (ئا .. ئا ئەتو بێزم لێ دەکەیەوە ئەو دەم خواتەوە) فاتمەش نەجاتی بوو چۆوە دیتی ژنیان لۆمیرهاوجانی هێنایە میرهاوجانیش هەر کە دەبینێ فاتمە هاتەوە سەری بوکەی دەبڕێ و لەگەڵ فاتمە هەردێن دەڕۆن .

کاتێك داکی (میرهاوجان)ی پێی زانین دو سێ پیاوی نارد تا بەدوای بکەون پێیانی وت (هەرچی و لەسەر ڕێ و دی بینین ئەگەر هەرنا بەس پارچە چارۆکەکەم لۆ لێ بکەنەوە) .

میرهاوجان گۆتی ئەمن قەیدیناکا (چونکە بەخۆی پەری بوو)گۆتی: دەبێ فاتمە ئەتوی بشارمەوە هەستا فاتمەی کردە بیستانەکی گندۆرە خۆشی کردە پیرەمێردەك، جا ئەوەندەی پێ نەچوو پیاوەکان گەیشتنە لای بیستانە

گندۆرەکە ولە پیرە مێردەکەیان پرسی وتیان: هیچ ژنت نەبینیوە؟ پیرەمێردەکەش گوتی: دەبزانن هیچ گندۆرە گەییە لۆ خۆ لێ کەنەوە گوتیان: ئێمە دەڵێین هیچ ژنت نەبینیوە؟ ئەویش دیسان دوبارەی کردەوە گوتی: دە بزانن هیچ گندۆرە گەییە لۆخۆتان لێ بکەنەوە ، جا ئەوانیش هیچیان دەست نەکەوت و گەڕانەوە وتیانە دایکی (میرهاوجان) هیچ ژنمان لەسەر ڕێ نەدی بەس پیرەمێردێکمان بینی لەسەر بیستانە گندۆرەکی، گۆتی: ئۆی ئەوە هەو بو هەر بەڵکە گندۆرەکتان بینابایە، ناچار پیاوەکان هەستان چونەوە کاتێك میرهاوجان پێی زانی، فاتمەی کردە کانیە ئاوێك گەورە و خۆش تاتە بەردێك لەسەر کانیەکە، کاتێك پیاوەکان هاتن دیتیان هیچ بیستان چ پیرەمێرد لەوێ نەماینە کانیەکیش لەوێ دروست بوە گەڕانەوە وتیانە دایکی میرهاوجان هیچ شتێ لەوێ نەمابوو کانیەکیشی لێ بو قەت نەماندیوە گوتی: ئەوە هەو بونە ئەو جارە خۆم لەگەڵتان دێم میرهاوجانیش فاتمەی کردە دارێکی ئەسپیینداری گەورە خۆشی کردە مارەکی گەورە و خۆی لە ڕەگەوە قەد قەد لێ ئاراند  دایکی میرهاوجان هات حەوت ڕۆژ و حەوت شەو لە دیاری دانیشت دەیگۆتە کوڕەکەی بەس جێ نینۆکەکم کەوە با بیگەیەنمە دارەکە، میرهاوجان کە لە شێوەی مار خۆی نیشان دەدا زیاتر خۆی قەد دەکرد لەسەر قەدی دارەکە ئینجا دایکەکە لە خۆشەویستی عاشقی ئەوا تێ گەی گۆتی قەیناکە کوڕم هەستا و ڕۆیشت . فاتمە و میرهاوجان دەستی یەکیان گرت و چونەوە قەسرەکەی خۆیان .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: دروستکردنی قەسری لە زیو و زێڕ و چوار غورفەی چوار وەرزی قسەکەرو ژن کردنە بێستان و خوکردنە پیرەمێردو فاتیمە کردنەکانی و خۆکردنە تانە بەردو فاتیمە کردنە دار و خۆکردنە مار.**

# ئەحمەدە تەمبەڵ

هەبوو نەبوو، پاشایەك هەبوو، ڕۆژێ لە ڕۆژان پرسیاری لە قازییەکەی کرد گۆتی : قازی بەڕای تۆ ژنت هەبێ لەپێش ماڵ یا ماڵت هەبێ لەپێش ژن .
قازیەکە گۆتی:. نەخێر گەورەم وا چاکە لە پێشدا ماڵت هەبێ ئەوجا ژن ، لەم سەین و بەینەدا بوون پاشا گوتی: با گرەوێك بکەین ئەگەر قسەی من دەرچوو ئەوا سەرت دەبڕم ئەگەر قسەی تۆ دەرچوو ئەوا سەرم ببڕە و لە جێم ببە بە پاشا .

جا پاشا بۆ بردنە سەری گرەوەکەی خۆی ئەمری کرد کە بچن تەمبەرخانە ئاگر تێ بەردەن و کام لە تەمبەرەکان لە هەموان تەمبەر ترە و لەجێی خۆی نابزوێ ئەوا ئەو بهێنن .

یەکێك لە تەمبەرەکان پشکۆی ئاگر بەسەر سنگی دەکەوت نەدەجولا وەڵا پاسەوانانی پاشا تەمبەڵیان هەڵگرت و هێنایان بۆ پاشا جا پاشا گۆتیە کچەکەی کچم من گرەوم کردوە لەگەڵ قازی وە دەمەوێ ئەو تەمبەرەم بۆ بکەیە پیاو، کچەکەش گۆتی: بابە چ قەیدیە ئەتو چ برێی ئەوها دەکەم .

کچە پاشا و تەمبەر ئەحمەدیان فڕێ دایە کەلاوە خانیەك و ڕزقی چل شەویان دانێ، کچە پاشاش دوای ئەوەی لەوێیان فڕێ دان هەستا بانگی منداڵێکی کرد و گۆتی: بڕۆ چل شوڕك چیلکە درێژی هەنارم بۆ ببڕە و بهێنە کە چل سوارکە هەنارەکەیان بۆ هێنا ئەویش سپی دەکات و لەبەر ئاوی دادەنێ ئینجا بە شوڕەك لە شوڕەکان کە لە ئاوی دانابوو دێنێ پێ لە تەمبەرە دەدات، وەڵا تەمبەرە ڕاست قیتە بێتەوە و دادەنیشێ، ئەمجارە سوارەکی تری لێ دەدا هەتا هەڵدەستێتەوە، ئینجا کچە پاشا کچێکی جوان و سپیە هەردەستێ خۆی ڕوت دەکاتەوە بەرامبەر دەرکە ڕادەوەستی، دەڵێ : تەمبەر ئەها ڕوتم برۆ ئەو دەرکەیە پێوەدە وەڵا ئەحمەد تەمبەر بەغار دەچێ دەرکەی پێوە دەدا دڵی: خانم ئەدی کو بێمەوە دەرێ؟ چۆن چویە لای دەرگا دەبێ ئاواش بێیەوە دەنا چۆن بە شوڕکی تەڕ لێم دای ئاوا لێت دەدەمەوە .

تەمبەر ئەحمەد ڕۆژەکیٚ دەریٚ:. فاتم بچمە بازاڕیٚ ئیشیٚ بکەم پێی گۆ:. دەبڕۆ، وەلاٚ دەچێت دەبینیٚ یەکێك وا خشت دەبڕیٚ و کۆمەڵە عەمەلەیەکی لەبن دەستە خانو دروست دەکەن، پێی گۆتن ڕام دەگرن، گۆتیان بەریٚ ڕات دەگرین. وەلاٚیی بە تەشتەکی بچوك قوڕیان دەکێشا، گۆتی:. ئەوە چیە من بەو تەشتە بچوکە ناکێشکەوە تەشتەکی گەورەم بۆ بێنن تەمبەر پیاوێکی قەرە و زرپە بوو تەشتەکی گەورەیان بۆ هێنا پڕی قوڕ دەکرد و لا دیوارێکی پیٚ قەپات دەکرد سیٚ چوار عەمەلەیان ئیزن دا گۆتی: ئەوە بەسە، چا کە لەئیشیٚ بو ئەوە چوارده ڕوپیەیان پێدا ، ئەویش پارەکەی هێنا و لە دەستی خانمێی کرد .

لۆ ڕۆژی پاشتریٚ چوە دەریٚ دیتی قافلەك دەچنە بازرگانی پێیان گۆت:. وەرە لە گەرمان لە زێڕ و پارەت دەدەنیٚ ئەویش گۆتی با پرسەکی بە خانمیٚ بکەم پرسی پیٚ کرد و ئەویش ئیزنی دا، قافلەکە بەڕیٚ کەوت لە ڕێگا لایان دا سەر بیرەکی گۆتیان: کیٚ بنێرینە خواریٚ لە بیرەکەی هەتا ئاوی بینی؟ کەس نەوێرا بچیٚ گۆتیان: با تەمبەر بچیٚ وەلاٚ تەمبەریان شۆڕ کردەوە خواریٚ ئاوی دەربێنیٚ لەویٚ ڕاست دێوەکی قولە لەبن ئاوەکەیە پێی دەگریٚ و ڕای دەکێشیٚ دەریٚ وەرە پرسیارەکت لیٚ دەکەم ئەوەی پرسیارم لیٚ کردوە نەیزانیوە ئەوا سەرم بڕیوە و چیایەکم لەسەری زەلامان دروست کردیە ئەگەر ئەتوش جواب نەدەیەوە سەری تۆش دەچێتە پالٚ سەری وان، جا پرسیارەکەی لیٚ دەکا دەلٚیٚ: چ جێگایەك لە هەمو جییەك خۆشترە؟ تەمبەر دەلٚیٚ:. لە کێندەر سەر و دلٚت ڕەحەت بیٚ ئەویٚ لە هەمو جیٚ خۆشترە، دێوەکە بۆقێك و گورگێکی دانابو پێی گۆت ئەدی ئەو بۆقە جوانە یان ئەو گورگە؟ تەمبەر ئەحمەدیش گۆتی :. ئەو بۆقە هەر چاوی ئەو گورگە دەینی، دێوەکە ئەو قسانەی زۆر بە دلٚ بو چونکە ئەو بن ئاوی پیٚ خۆش بو، دێوەکە گۆتی لەبەر ئەوەی جوابت دامەوە ها ئەوسیٚ هەنارەت دەمیٚ ، ئەویش سیٚ هەنارەکەی هێناو ئاوی لەگەر خۆی هێنا و بەسەر کەوتەوە و لە بیرەکە دەرهات گۆتی :. ئەوە ئاوم هێنا ها ئەو هەنارە کەس ناخوا ئەوانیش گۆتی:ان پێمان ناخوریٚ ناخۆین .

لەویٚ ڕێبوارێکی بینی دەچۆوە گۆتی: ها ئەو سیٚ هەنارە بدە بە ژنەکەم ڕێبوارەکەش سیٚ هەنارەکەی هێنا و دایە ژنەکە گۆتی ها ئەوە ئەحمەد تەمبەر لۆی ناردی، خانمیش هەر کە قەپ لە هەنارەکە دەدا دەبینی هەمو (دوڕ و مەرجانە)وەلاٚ هەردەستیٚ قەسرەکی دەکڕی هەموی لە زێڕ و مەسینە و دەست شۆریش لە زێڕ .

کاتەك قافلەی بازرگانەکە دەگەڕێتەوە ژنی ئەحمەد تەمبەر دەرێتە پاسەوانەکان برۆن بەرەو پیریەوە ، دەچن دەرێن:. کا ئەحمەد ئاغا ئەوانیش دەرێن ئەمە چ ئەحمەد ئاغامان لەگەر نیە بەس ئەحمەد تەمبەرمان لەگەرە ، دەیبەنەوە ماریٚ دەبینی ژنە قەسروماڵەکی هەیە دەریٚ ئەوە چییە خانم بەچت ئەو ماڵە کڕیە، دەریٚ:. ئەوەی ئەو هەنارانەی ناردوتەوە خۆ هەموی دوڕو یاقوت بون .

خانم دەریٚ:. بابابم دەعوەت کەین بەس ئەتو دەستی هەموان بشۆ ئی بابم مەشۆ ئەمن دێم دەشۆم، جا پاشایان دەعوەت کرد و دەست شۆریان دانا دەستیان بشۆن پاشاش دەستی خۆی حازر کرد بو کەس دەستی نەشوشت پاشا توڕە ب ، کچەکەش پێچەی کردبوو هات پێچەکەی لا برد گوتی بابە ئەمن دەستت دەشۆم، پاشا کچی خۆی ناسیەوە و گرەوەکەی بردەوە لەسەری قازیشی دا .

*ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: دێو و هەناری دەنك دوڕ و مەرجانە.

# سۆرێی چاوشین

**کۆکردنەوەی : شیلان عوسمان عەبدولڕەحمان**
**گـــێڕانــەوە: نـــافعـــــە ئیبراهیـــــــم**

خوشکەك و حەفت برا هەبوون، ڕۆژێك خوشکەکە کە ناوی (فاتمە)بوو لەخەو هەردەستێ دەبینی پشیلە میزی بە ئاگرەکەیان دا کردیە و کوژاندیتیەوە، لەهیچ جێ ئاگری بە دەست نەکەت، چووە سەربان دیتی لە دورەوە تروسکە ئاگرەك دیارە، بەرەو ڕووی ئاگرەکە ڕۆیی. وەکی دەچی دەبینی وا دێوەك درێژ بووە و بە سێ ژن ناوکی دێننەوە، لە کونی خانییەکە دەرێ : (قیچە ئاگرەکم دەنێ، ئاگرمان نەمایە). ژنەکان پێی دەرێن: (قوڕ بەسەر ئەوە چ دەکەی لێرە هەوکە لە خەوێ هەرستی ئەتوش داگیر دەکات وەکی کو ئەمەی داگیر کردیە). ئەوجا بە مقەسێك پارچە ئاگرەکی لۆ دەبڕن و دەیدەنێ دەرێن (زوو بڕۆ لێرە) .

فاتمە گلۆرە ئارموشەکی لەبەرکییە سەرەکی ئەو ئارموشە لەلای ماری دێوە لە بارکی دەردەچی ولە دڕك و دار دەئارێ تا دەگاتەوە مارێ ئارموشەکە بەدوای دادێ .

دێوەکە کە لەخەوێ هەردەستی دەرێ (بۆن دێ بۆنی بێگانان دێ لە دەور و مەکان دێ) سێ ژنەکەش دەرێن کەس نەهاتییە. دێوەکەش دێتە دەرێ لە دەوری خانییەکە دەگەڕێ هەتا سەری گلۆرە ئارموشەکە دەبینی هەری دەکاتەوە و تا دەگاتە بەردەرکەی ماری (فاتمە) ئەوجا دەچێتە حەوشە دەرێتە فاتمە: (برای گچکەت بکوژم یان قولینچکی گچکەت بمژم) (فاتمە)ش دەرێ: (وەرە قولینچکی گچکەم بمژە) .

هەموو ڕۆژێ کاتی حەوت برایەکە دەڕۆن دێوەکە دێ قولینچکی گچکەی (فاتمە) دەمژی هەتا ڕۆژەك براکان دەرێن ((فاتمە) ئەوە لۆ ئەوها زەرد و لاواز

بووی) (فاتمە): (هیچ نیە). ئەوانیش وازی لێ ناهێنن دەرێن دەبی پێمان برێی. ئەویش حار و مەسەلەکەیان لۆ دەگێڕێتەوە .
براکان هەردەستن چارەکی گەورە و قۆڵ هەڵدەکەنن و بەڕێیەکی لەسەر دادەنێن دەرێن ئەگەر بەیانی دێوەکە هات ئەوا برێ:. لێرە دانیشە دەستم بە هەویرە هەتا لێدەبمەوە ئێمەش خۆمان دەشارینەوە .

تێبینی:
ئەم چیرۆکە تەواو نەنووسراوەتەوە، ڕەگەزس ئەفسانەیی بوونی ـ دێو ـە .

# کەچەر

هەبوو نەبوو، کابرایەکی کەچەر هەبوو، ئەو کەچەرە زۆر زۆرزان بوو ماوەیەك لەلای خاری شوان بوو. هەمو ڕۆژێ خاری پێی دەگۆت : کەچەر بڕۆ ئەو بزنانە بلەوەڕێنە ، ئەویش هەمو ڕۆژێ دەچوو بزنەکی دەفرۆشت و دەیخوارد . تا بزنەکانی خلاس کرد . خاری لێی پرس ئەتو چ لەو بزنانە دەکەی لە وەرامی خاری دەیگۆت: بە گەنمم گۆڕینەتەوە .

وەختەك کە وەختی درونەی گەنمان هات خاری گۆتی: باشە کەچەر لۆ ناچی گەنمەکەی بینیەوە ؟ کەچەر گۆتی: خارە کەر و جوارم لۆ دانێ هەتا بچم. خاریشی هەستا کەر و جواری لۆ پەیا کرد. گۆتی: ئەوە کەر و جوار هەستە بڕۆ. کەچەر هەستا ڕۆیی هەتا هێوارێ بەسەردا هات لای دا گوندەکی لە ماری مەلای مێوان بوو . پاش ئەوەی نان ومان خورا مەلا گۆتی : کەچەر لۆ نایەی گرۆیەکی بکەین ئەگەر بردتەوە جوارت لە گەنمی عەمبارێ پڕ کەو ئەگەر دۆڕاندت کەر و جوارت بەجێ بێڵە کەچەر گۆتی: ئەمن ڕازیم.

وەڵڵا مەلا هەستا مەنجەرێکی (نیسکی)سور و چەور لێنا بە کەچەری گۆت دەبێ ئەو مەنجەرە نیسکە بخۆی ئەگەر شەوێ لەخۆت نەڕی(خۆ پیس نەکرد) ئەوە بردتەوە بەران ئەگەر خۆت پیس کرد ئەوە دۆڕاندت. کەچەر گۆتی: باشە دەستی بەنیسك خواردن کرد و لەپاشان لێی نوست شەوێ پێش بەیانیان کەچەر هەستاوە مەندیلی مەلای پڕ گو کرد و جوارەکانی لە عەمباری پڕ گەنم کرد و لێیدا ڕۆیشت و بەرەو شاری بەڕێ کەت. لەڕێیێ چاوی بە جو (جولەکە)یەکی کەت کە لەسەر دوکانی خۆی دانیشتبو گۆتی: هۆو کابرا دوکانەکەت ڕوخا کورە دوکانەکەت ڕوخا دەستی پێوە بگرە دەنا خۆت و مارت تێ دەچن .

جولەکەش خۆی دایە بەر دوکانێ ئاگای لەناو دوکانێ نەما کەچەر خۆی گەیاندێ چ کوتار و قوماش هەبو بردی لە کەرێی بار کرد و ڕۆیشت .

***ئەمەش یەکێکە لە حەکایەتەکانی کەچەڵ ـ کەچەر ـ بەڵام، وەکو دیارە تەواو نەبووە .**

# ڕاسته و خواره

**گێڕانەوەی : مەحەمەد حاجی جبرائیل بەکر**

ڕاسته و خواره پێکەوە برادەر دەبن، هەردووکیان بێ ئیش دەبن دەیانەوێ بچنە ئیشێ، یەك ونوردیە نان هەڵدەگرن لەڕێیە خوارە بە ڕاستەی دەڵێ: با نانی تۆ بخۆین هی من با بۆ دوایی بی، نانی ڕاستە دەخۆن نانی ڕاستەی تەواو دەبێ، ئەوجارە ڕاستە بە خوارەی وت: با نانەکەی تۆ بخۆین، خوارەش دەڵێ: وەڵڵاْ ئەمن نانت نادەمێ ڕاستە دەڵێ : کوڕە چۆن نانم نادەیێ ئەدی ئەمن و ئەتۆ برادەر نەبووین؟! ئەی نانم نەدایە تۆ!؟ چۆن نانم نادەیێ؟! خوارە ووتی: وەڵڵاْ کاکە ئەمن نات دەمێ، ڕاستەش ووتی : کەوایە من وا دەڕۆم خوا حافیز ڕاستە بەلایەکی دا ڕۆیشت و خوارەش بەلایەك ، ڕاستە ڕۆیی شەوی بەسەر داهات لە تەنیشت گردەکی پەنا کەندەڵانەکی پاڵی دایەوە شەوێ بەرەبەری بەیانی دیتی گورگێك و شێرێك و ڕێویەك هاتنە سەر گردەکە کە لەسەر گردەکە یاریان دەکرد ، شێرەکە ووتی: ها مام ڕێوی دەبینم بە کەیف دیاری خێرە؟ مام ڕێوی ووتی : ئەرێوەڵڵاْ خێرە مام شێر ئەدی چۆن بە کەیف نەبم، ئەمن لە فلاْنە شارە مێروستانە لە فلاْنە جێیە (کوپەڵە لیرەکم) هەیە ڕۆژانە دەریان دێنم هەندێ یاریان پێ دەکەم و دەیانخەمەوە جێی خۆی (ڕاستەش) وا گوێی لێیە .

ئەوجارە شێر بە مام گورگی وت: مام گورگ ها ئەتۆش کەیفت زۆر خۆشە؟! مام گورگ وتی: ئەرێ وەڵڵاْ مام شێر ئەدی چۆن کەیف خۆش نەبم ئەمنیش لەو گوندەی خوارێ (پیرەژنێك) هەیە (گۆلك و سەگێکی)هەیە گۆلکەکە مێشکەکەی لە کەللەی سەری (دوڕ)ەکی تێدایە سەگەکەش مێشکەکەی دەرمانە، وەسفی ئەوانەیان کردوو بەرە بەرە ڕۆژ هەلاْت و ئەوانیش ڕۆیشتن (ڕاستە)ش بەدوای تەعریفی ڕێوی چوە شارە مێروستانەکەی کوپە لیرەکەی هێنا لە پاشان چوە گوندەکەی لە کن پیرەژنێ وتی: پیرەژن ئەو گۆلکەی نافرۆشی؟ پیرەژن وتی: با وتی: بە چەندی ناو بە چەندی پێك هاتن، بە چەند لیرەیەکی لە پیرەژنێ کڕی ئەو جارە وتی: پیرەژن

بۆ نایەی سەگەکەشم پیٚ بفرۆشی، پیرەژن سەگەکەشی دایێ ئەویش نازانین بە چەند لیرەیەکی، ڕاستە گۆلك و سەگی بردوو گۆلکەکەی سەر بڕی و کردیە خێر و دوڕەکەی دەرهێنا و هەڵی گرت، سەگەکەشی تۆپاند و مێشکەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت، ڕۆیی چوە شارەکی لە شارەکەی بانگ ڕادێرا کچی پاشای سەری کەچەڵ بوە هەرچی چاکی بکاتەوە پێشکەشی دەکریٚ، بەلاٚم ئەگەر چاکی نەکاتەوە ئەوە پاشا لە سەری دەدات، ڕاستەش وتی: من چاکی دەکەمەوە ، پیاوەکان و دار و دەستەی پاشا ڕاستەیان بردە لای پاشای پاشا ووتی: ئەتۆ سەری ئەو کچەی من چاك دەکەیەوە؟! خۆ ئەگەر چاکی بکەیتەوە پێشکەشتی دەکەم، بەلاٚم ئەگەر چاکی نەکەیەوە لەسەرت دەدەم. ڕاستە ووتی: ئەگەر چاکم نەکردەوە لەسەرم بدە، وەڵلاٚ ڕاستە چوە (ژووری) کچی پاشا، لە پاشان لە مێشکی سەگەکەی قاتەکی وەك و خەنەی لەسەری نا ، حەفتەیەکی پیٚ نەچوو سەری چاك بۆوە، خزمەتکارەکانی پاشا خەبەریان دایە پاشای: گەورەم ئەو کابرایە سەری کچەکەتی چاککردەوە! پاشا وتی: چۆن وایە!؟ کەواتە حەلاٚلی کرد، پاشا کچەکەی خۆی دایێ و ڕاستە دەوڵەمەند بوو چونکە لیرە و دوڕی هەبوو، کچی پاشای گواستەوە و کۆشکەکی دروست کرد لە هی پاشای زۆر خۆشتر بوو. خەبەریان دایە پاشای: قوربان ئەو زاوایەی تۆ کۆشکەکی دروست کردوە لە هی تۆ زۆر خۆشترە پاشا لەگەڵ خزمەتکارەکانی چوو وەکی دیتی وتی: پاشایەتی هەر لایەقی تۆیە، وەڵلاٚ ڕاستە پاشایەتیشی گرتە دەست .

ڕۆژێك لە ڕۆژان سواڵکەرێك دەگەڕا هاتە ماڵی پاشا، سواڵکەرەکە خوارە بوو. خوارە دیتی ڕاستە بۆتە پاشا، پرسیاری کرد پاشام خۆشبیٚ ئەتۆ ڕاستە نی؟! پاشا وتی: بەڵیٚ من ڕاستەم ئەدی ئەتۆ خوارەنی؟! وتی: بەڵیٚ من خوارەم، خوارە وتی: باشە پێم بڵیٚ چۆن گەیشتییە ئەو پلە و پایەی کورە ڕاستە؟! ڕاستە وتی: خوارە با بۆت بگێڕمەوە بە بیرت دیٚ وەکی لێك دابڕاین نانت نەدامیٚ؟ خوارە وتی: چاکم لە بیرە، ڕاستە وتی: وەکی ڕۆیشتم لە فلاٚنە گردی ئەووم بەسەردا هات ئەمنیش لێم پاڵدایەوە بەرە بەری بەیانی دیتم شێرێك و ڕێویەك و گورگێك هاتن، ڕاستە هەموو بە سەرهاتەکەی بۆ خوارە

گێڕایەوە، لەدوای وتی: ئەمنیش بە مێشکی سەگەکەی، نەخۆشی کچی پاشام چارە کردوو بوومە پاشا. خوارەش وتی: کەواتە خوا حافیز، خوارە چوە کن گردەکەی کە ڕاستە وەسفی کردبوو لێی پاڵدایەوە بەرەبەری بەیانی دیتی شێرێك و گورگێك و ڕێویەك هاتن، شێرە وتی: ها مام ڕێوی دەبینم بیٚ کەیف دیاری؟ مام ڕێوی وتی: کورە چۆن بیٚ کەیف نەبم کوپە لیرەکەم بردراوە شێرە وتی: گورگە ئەی تۆ بۆ بیٚ کەیفی؟ مام گورگ وتی: وەڵلاٚ کاکە گۆلك و سەگەکەم نەماوە، شێرە وتی: کەندەلاٚن بە گوێیە گورگ و ڕێوی وتیان: کەندەلاٚن بە گوییە؟! بۆ چییە؟! وتی: بڕواننە پەنا کەندەلاٚنیٚ ..... وەکی ڕوانیان دیتیان وا زەلامێك پاڵی داوەتەوە وا گوێی خۆی ڕاگرتوە، وەڵلاٚ بە هەر سێکیان پڕیاندایەو کەل و پەلیان کرد. ئەوەش ئەنجامی خواری خۆی بوو .کراسم دڕا چیم پیٚ نەبڕا .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: گۆڵك مێشکی دوڕە و سەگیش مێشکی دەرمانە.**

# شابو خان

جاران وەها عادەت بو کچ و کاڵی گوندی خڕ دەبونەوە و دەچونە داران بەڵام (شابو خان)ماوەیەك بوو لەگەڵ کچان نەدەچوە داران، ئەویش لەبەر ئەوەی تەونی لەدار بو ، ڕۆژێکی بە کچانی گوندی وت: هۆ کچێ نە سبەینێ بە جێم مەهێڵن منیش دێمە داران لە گەڵتان تەونم (مافورم) لە دارێ بۆتەوە (تەواو بوە)کچ و کاڵ بۆ سبەینێ حازر بوون و شابۆ خانیش بە گەڵیان کەوت چونە داران و دار و باریان کۆ کردەوە، هەر کەسە پشیە داری خۆی دانا و وتیان: با جۆلانێ بکەین هەر کەسە گوریسی خۆی لە دارەکی بەست خەریکی جۆلانێ بوون هەندەی پێنەچوو دێوێکیان لێ پەیدابوو کچەکان کردیانە هەرا: دێو هات ..دێو هات. هەرکەسە گوریسی خۆی لێ کردەوە و ڕۆیشتن (شابو خان)نەبێ چەندی کردی گوریسی بۆ لێنەبۆوە ، کچەکان وتیان: (شابو خان)وەرە جێی بێڵە با بڕۆین وا دێومان گەیشتێ (شابو خان) وتی: وەڵڵا گوریسەکەم بەجێ ناهێڵم گوریسی من ئاوریشمە دایکم بۆی ڕستوومە کچەکان ڕۆیشتن دێو گەیشتە (شابو خانێ) و بردی بردیە ئەشکەوتەکی لەوێ لەگەڵی ژیا هەتا دوو منداڵی لە دێوەی بوو، ڕۆژێکیان دێوە لە ئەشکەوتێ نەبوو مێگەلی ماڵی بابی شابو خانێ هاتبوە نزیك ئەشکەوتێ، نێری ماڵی بابی شابو خانێ هات خۆی بەو تاشە بەردە خوراند کە دێو وەکی ڕۆیشت بە دەرگای ئەشکەوتێی وەدەنا، لەگەڵ خۆ پێ خوراندنێ تاشە بەرد لا چوو شابو خان چاوی بە نێری ماڵی بابی کەوت ناسییەوە و ووتی : هۆ نێری ماڵێ بابم ئەمن شابو خانم، شابو خان دەستی لە ملی نێری کردوو تێری بۆن کرد لەپاشان ملوانکە (قەنەفلەکە)ی خۆی لە ملی نێری کرد وتی: بڕۆ نێری بڕۆ هەتا کۆشی دایکم گیر نەبی، دایکیشی لە دوای بزر بوونی شابو خان کوێرایی داهاتبوو ، نیوەڕۆ وەکو شوانە مەڕێ هێناوە بێرێ، دایکی شابو خانێ وتی: هۆ کوڕینا ئەمن بۆنی شابو خانێ دەکەم، چاوم وا خەریکە لەگەڵ ئەو بۆنەی ڕوون دەبێتەوە .

**وەکی دیتیان وا ملوانکەی شابو خانێ بە ملی نێری وەیە، وتیان: هۆ شوانە ئەتو ئەورۆ مێگەلت لەکوێ لەوەڕاندوە؟ وتی: لە فلأنە پاوانی، هەستان ڕۆیشتن گەڕان هەتا ئەشکەوتەکەیان دیتەوە کە تاشە بەردەکی پێوە بوو لایەکی لا چوو بوو، شابو خانیان دیت، وەکی چوونە ئەشکەوتێ شابو خان دوو منداڵیشی هەبوو، وتیانە: منداڵەکان دایەتان دەوێ یان بابە وتیان: بابە هەردوکیان بە دیواری ئەشکەوتێدا دان و کردیاننە چڵمی دیواری شابو خانیش گەڕایەوە ماڵێ بابی .**

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە:دێو و منداڵ بوونی کچەیە لە دێو و کوێر بوونی دایکی کچە و چاك بوونەوەی بە بۆنی قەنەفەلەکەی.**

# گێله پیاو

**گێڕانەوەی : سابیر عەبدولکەریم کویخا عەلی بریندار**

دەگێڕنەوە پیاوێکی گێل هەبوو، ئەو پیاوە لەگەڵ ژنەکەی کۆك نەبوو هەموو دەمێ شەڕیان بوو، ژنە ئەی وت: زۆر ئەلێی ئەویش ئەی وت: زۆر ئەلێی، ڕۆژێکیان لێیان بوە شەر، ژنەکە وتی: با (قوڕ بە قەپانێ) بکەین گێلە وتی: باشە، وەڵلاَ ماوەیەکی زۆر پێکەوە لە ژورێ بوون و قسەیان نەکرد لەپاشی ژنە هەستا چووە ماڵێ بابی ماڵێ بابی بوکیان دەگواستەوە ، گێلەش هەر لەجێی خۆی دانیشتبوو هیچ قسەی نەدەکرد، ژنە کە وەختی نان خواردنێ هات بە منداڵەکی مەنجەڵی شیوەکی بۆ نارد منداڵەکەش مەنجەڵە شیوەکەی برد. بەلاَم، گێلە نەلێی وەرگرت نەقسەکی کرد هیچی نەووت پاشان منداڵەکە مەنجەڵە شیوەکەی هێنایەوە و هاتەوە ووتیە ژنەکەی پیاوەکە نەلێی وەرگرتم و نە قسەشی کرد ژنە وتی: بڕۆ بیبەوە ئەگەر ئەو جارە لێی وەرنەگرتی بەسەر سەری داکەو وەرەوە، منداڵەکە دیسان ڕۆیشتەوە، بەلاَم دیسان لێی وەرنەگرت و چ قسەشی نەکرد، منداڵەکەش مەنجەڵە شیوەکەی بەسەر سەریداکرد، شیوەکە شیوەکی چەور بوو پڕی کفتە و پشکە گۆشت بو ئەها پشکە گۆشتی ئەوەندە ئەوەندەی تێدابوو. پشکە گۆشت و کفتە بە گۆڕێ وەر بوون، مریشك و جوجکە دەوریان لێ دا دوقە دوقەکیان بوو لەسەر سەری ، بەلاَم ئەو قسەکی نەکرد و لەخۆشی پاس نەدەکردن چونکە قورقەپانێی کردبوو ، ئەو جارە سەگێك هات و پشکە گۆشت و کفتەکانی خوارد و گێلەشی لێستەوە گێلە هەستی لەخۆ بڕیبوو بلێی نوقەکی نەکرد، ئەوجا دەروێشێك هات سەری لە دەرگا دەرهێنا وتی: ئاوەدان ... ئاوەدان .. کەس جوابی نەدایەوە، ئەو جارەش ووتی : ئاوەدان ... ئاوەدان ... دیسان کەس جوابی نەدایەوە ، کابرای گێلەش لەوێ بوو جوابیشی نەدەدایەوە. کابرای دەروێشیش لە دڵی خۆی وتی: بۆ ماڵەکە بارنەکەم مادام هەر وەلاَم نادەنەوە دەروێش هات کەرێکی هێنا و ماڵەکەی بار کرد و لێیدا ڕۆی، ئێوارێ ژنە

گەڕایەوە دیتی هیچ ماڵی نەماوە وتی : کابرا ئەوە کوا ماڵەکەمان  گێلە وتی: وەڵلاّ تێت ڕاچوو .
ژنە وتی: کوڕە کوا ماڵەکەمان؟ ئەدی ئەتۆ لە ماڵێ نەبووی، گێلە وتی: دەروێشێك هات باری کرد و بردی وتی: ئەدی بۆ کوێ چوو .
وتی: ڕۆیشت، ژنە خۆی هەڵ کرد و بەدوای دەروێشیدا ڕۆیشت هەتا گەیشتە دەروێش لەدوری ئاوایی، ژنە وتی: هۆ دەروێش ئەوە بۆ کوێ دەچی؟ دەروێش وتی: ماڵم بارکردوە دەڕۆم ئەدی ئەتۆ چ دەکەی لێرە، ژنە وتی: ئەمنیش بێوەژنم دەڕۆم، دەروێش وتی: بۆ نایەی مێردم پێ بکەی، ژنە وتی پێت دەکەم، دەروێش وتی: ئێ باشە ئەدی ناوت چییە، ژنە ووتی ناوم (ڕێم)ە.
وەڵلاّ ڕۆیشتن گەیشتنە گوندەکی لایاندایە ماڵی مەلای، ئێوارێ نان و مان خورا، مەلا و مەلا ژن لە قولینچکەکی نووستن و ڕێم و دەروێشیش لە قولینچکەکی تر، پاشی بەینەکی ژنە هەستا هەندەکی لۆرکە لە ئارد و ئاو گرتەوە و مەندیل و عەبای تێوەردا و هەندێکی بە ژوورێ وەرکرد کەرەکی هێنا و ماڵەکەی بار کردەوە ولێیدا ڕۆیشت ، پاشان دەروێش هەستا و لەسەر خۆی بانگی ڕیمی کرد وایزانی هەروا لەوییە لەسەر خۆ وتی، ڕێم ڕێم، مەلاش بە خەبەر هات و وتیە مەلا ژن: هەستە هەستە بزانە ئەو پیاوە چی دەوێت لەخۆی ڕیوە، مەلا ژن جوابی نەدایەوە مەلاش نووستەوە، بەینەکی تری پێچوو دەروێش بانگی ڕیمی کرد ڕێم ڕێم دیسان مەلا بە خەبەر هات وتی: مەلا ژن ناوێرم هەستە ئەوە لەخۆی ڕیوە مەلا هەستا دەستی بۆ مەندیلەکەی برد هەستی کرد پیسە هاواری کرد هەی قەحپە باب سەگباب ئەوە لەخۆت ڕی وەڵلاّ دەروێشی بەبەر کوتکان داو بە دەری نا، ژنەش ماڵەکەی بردبۆوە و گەڕابۆوە ، گێلە وتی: ژنەکە با ماڵی خۆمان بکەین ئەمە ئەوها پێك نایێن ، ژنە وتی: باشە، گێلە وتی: من دوو سەلکە موو و کەرەکە و شوژنەك و بەڕەیەکم دەوێ، ژنە وتی: باشە گێلە کەر و بەڕەو شوژن و سەلکە موەکانی برد و ڕۆیشت کە گەیشتە ئاوەکی قیڕە قیڕی بۆقێ دەهات گێلە وتی: جۆلاّ جۆلاّ ئەو دوو سەلکە موەم بۆ ناکەیە بەڕە، دیسان بۆقەکە دەستی بە قیڕە قێر کرد گێلەش دوو سەلکە موەکەی هاویشتە ناو ئاوەکەی، ئاوەکە سەلکە موەکانی

**برد، گێله پیاو هاواری کرد: کوڕه جۆلآ جۆلآ ئەو سەلکە موانە بگرەوە  ئاوەکە بردی چ دەنگ نەبوو شوژنەکەی هاویشت کەوتە ناو ئاوێ، گێلەش خۆی ڕووت کردەوە و خۆی هاویشتە ناو ئاوێ لەدوای شوژنێ بگەڕێ. هەتا هاتە دەرێ دیتی گورگ کەرەکەی خواردووە و شتەکان و بارەکەشی بردراوە. گێلە لە ئاوێ هاتە دەرێ زۆری برسی بوو هەندەکی فەریکە جۆ هێنا و لەسەر کۆشی هەڵی وەران ، لەناکاو بایەکی لێ بەربوو ووتی : هەی هۆ ئەمن هێشتا نەمکوتاوە ئەو بەبای دەکات. وەڵلآ پەلەکی لە قونی خۆی ڕا کرد دەستی بە گوو بوو پەنجەی خۆی لە ئاسمانی ڕاگرت و وتی: وەڵلآ هەتا بارانی پەڵەی نەبارێ ناتشۆم (کەچی بەهاریش بوو ئەو کات) زەنگەسۆرەیەك هات گزی گزەکی کرد و لەسەر پەنجەی نیشتەوە و پێی وەدا ، گێلە وتی: و و و پەنجەی لە دەمی خۆی نا .**

**ئەمنیش لەو لای ڕا هاتمەو کلاشم دڕا و هیچم پێ نەبڕا .**

***ئەم حەکایەتە حەکایەتی کۆمیدییەو دوو کەسایەتی لێك جیا واتە گێڵ و فێڵباز دەوری تێدا دەگێڕن.**

# کەچەڵ

هەبوو نەبوو، کابرایەکی کەچەڵ هەبوو، ئەو کەچەڵە زۆر زۆرزان بوو ماوەیەك لەلای خاڵی شوان بوو، هەموو ڕۆژێ خاڵی پێی دەوت کەچەڵ بڕۆ ئەو بزنانە بلەوەڕێنە، ئەویش هەموو ڕۆژێ دەچوو بزنەکی دەفرۆشت و دەیخوارد، هەتا بزنەکانی خلاس کرد، خاڵی لێی پرسی ئەتۆ چ لەو بزنانە دەکەی؟ لە وەڵامی خاڵی ئەی وت: بە گەنمم گۆڕیونەتەوە، وەختێك کە وەختی دروێنەی گەنمان هات خاڵی وتی: باشە کەچەڵ پێ ناچێ گەنمەکەی بێنیەوە؟ کەچەڵ وتی: خاڵە کەر و جەواڵم بۆ دانێ هەتا بچم. خاڵیشی هەستا کەر و جەواڵی بۆ پەیدا کرد وتی: ئەوا کەر و جەواڵ هەستە بڕۆ .

کەچەڵ هەستا ڕۆی تا ئێوارەی بەسەر دا هات لای دایە گوندێك لە ماڵی مەلا میوان بوو، پاش ئەوەی نان و مان خورا مەلا وتی: کەچەڵ بۆ نایەی گرۆیەکی بکەین ئەگەر بردتەوە جەواڵت لە گەنمی عەمبارێ پڕ بکە ئەگەر دۆڕاندت کەر و جەواڵت بەجێ بهێڵە .

کەچەڵ وتی: من ڕازیم، وەڵڵا مەلا هەستا مەنجەڵەکی (نیسکی) سوێر و چەور لێنا بە کەچەڵی وت: دەبێ ئەو مەنجەڵە نیسکە بخۆی ئەگەر شەوێ لەخۆت نەڕی (خۆت پیس نەکرد) ئەوە بردتەوە، بەڵام ئەگەر خۆت پیس کرد ئەوە دۆڕاندت، کەچەڵ ووتی : باشە .

دەستی بە نیسك خواردنێ کرد و لە پاشان لێی نووست شەوێ پێش بەیانی کەچەڵ هەستایەوە مەندیلی مەلای پڕ گوو کردبوو جەواڵەکانی لە عەمبارێ پڕ گەنم کرد و لێی دا ڕۆیشت بەرە و شاری بەڕێ کەوت لەڕێیێ چاوی بە جولەکەکی کەوت کە لەسەر دوکانی خۆی دانیشتبوو وتی: هۆو کابرا دوکانەکەت ڕوخا کوڕە دوکانەکەت ڕوخا دەستی پێوە بگرە دەنا خۆت و ماڵت تێ دەچن، جولەکەش خۆی دایە بەر دوکانێ ئاگای لەناو دوکانێ نەما. کەچەڵ خۆی گەیاندێ چی کوتاڵ و قوماش هەبوو بردی لە کەرێی بار کرد و ڕۆیشت. لە پاشان گەیشتە شوانەکی لەبەر مێگەلەکی زۆر بوو وتی: هۆو هۆو شوانە هێڕە ئاگات لەو لای نییە گورگ مەڕەکانی قڕ کرد زوو بە بیگەیێ. وەڵڵا

شوانە ڕۆیشت هەتا گورگی پاس کات کەچەڵیش (30 ـ 40) سەر مەڕی ا بڕی و لێیدا ڕۆیشتەوە لای خاڵی .

ئەوجا با بگەڕێینەوە لای مەلا بزانین لە چ حاڵەکی دایە .. مەلا سبەینێ هەستا دیتی شوانە نەماوە خێرا خێرا هەستا خۆی حازر بکات دیتی مەندیلەکەی پیس کردوە، هەتا مەندیلی خاوێن کردەوە درەنگ تر دا هات، بە پەلە پەل و هەلە هەل ڕۆیشت تا گەیشتە شاری چاوی بە دوکاندارەکی کەوت خۆی بە دوکانی هەڵپەساردبوو وتی: ئەرێ کابرا هیچ کەست نەدیوە بێرە دا تێپەڕێت کەرێك و جەواڵێکی پێ بوون. جوە وتی: بەرێوەڵلاّ خوا خێری بنووسێ لەبەر ئەو نەبوایە دوکانەکەم بەسەردا دەڕوخا ، مەلا ووتی کورە ئەوە لەتۆشی بردوە ئەتۆشی وەکو من لێکردووە ، کوڕە بەری دە ناکەوێ ئەوە هەڵی خەڵەتاندووی جوە وتی: کوڕە بەسەرم دا دەکەوێ مەلا وتی: ئەگەر کەوت لە ملی من، وەڵلاّ جوە خۆی لا دا دوکانیش چ نەکەوت وەکو چاوی گێڕا چ کوتاڵ و قوماشی نەماوە، ئەویش لەگەڵ مەلا ڕۆیشت. لە ڕێیێ تووشی شوانەکی بوون مەڕەکی زۆری پێ بوو، وتیان: ئەرێ شوانە هیچ کەست نەدیوە کەرەك و جەواڵ و کوتاڵی پێ بێ بێرەدا ڕەت بووبێ؟ ئەویش وتی: بەرێوەڵلاّ خوا خێری بنووسێ لەبەر وی نەبایە گورگ مەڕەکانی قڕ دەکردم. وتیان ئەهۆو بەخوای ئەتووشی تراند، شوانە وتی: ئێ لەبەر چی؟ ووتیان دەمەڕەکانت دەور کەوە بزانە چەندن . شوانە مەڕەکانی دەور کردەوە (30 ـ 40) سەری نوقسانە ئەویش بەگەڵیان کەوت ڕۆیشتن هاتنە گوندی ماڵی خاڵی کەچەڵی. هاتن دانیشت و وتیان: کوڕە کەچەڵ هەی خوا بتگرێ ئەوە بۆ وات کرد کوا ماڵەکانمان بێنە با بیبەینەوە بماندەوە، کەچەڵ ڕووی قسانی لە مەلای کرد وتی: مەلا ئەتۆ لە شەرعان دەزانی من شەرعی بەتۆ دەکەم ، مەلا وتی باشە.

کەچەڵ وتی: ئەتۆ بە تەنێ مەنجەڵێکت نیسک دەرخواردی من دا ئەمن مەنجەڵە نیسکەکی دەرخواردی هەر سێکتان دەدەم ئەگەر شەوێ لەخۆتان ڕین خۆتان پیس کرد ئەوا ماڵەکەتان حەلاّڵی منە ئەگەرنا هەر کەسەو ماڵی خۆی بباتەوە ووتیان: ڕازین کەچەڵ هەستا مەنجەڵە نیسکەکی لێنا ئەوەندەی دەهاویشتە ناوێ، وەڵلاّ نیسك حازر بوو هەر سێکیان لێیان خوارد و نووستن چ

تەنگاویش نەبوون ، شەویٚ کەچەڵ هەستا قیاسەکی ئارد و ئاو گرتەوە و هەندێکی برد لەبن پێی مەلا ڕۆ کرد هەندەکی لەبن ڕانی شوانە ڕۆ کرد جوەش شەرواڵی لەبەر دابوو پارچە چاوپانەکی بە درێژی بڕی و لە لۆرکەکەی وەردا و سەرەکی لە دۆخینی پشتەوەی جوە بەستەوە هەندیٚ لۆرکەشی لەبن ڕۆ کرد کەچەڵ بانگی مەلای کرد وتی: مەلا هەستە، مەلا ووتی ئێی بۆ هەستم؟ کەچەڵ وتی: ئیٚ دەهەستە بزانە خۆت پیس نەکردووە ئەگەر خۆت پیس نەکردووە گەنمەکەت ببە و بڕۆ، مەلاش هەستا وتی: خۆم پیس نەکردووە بەلاّم ژوورەکە تاریك بوو وەکی دەستی خۆی گێڕا لە مەندیلەکەی دەستی لە لۆرکەی ڕوو بوو وتی: ئەها بەخوای بەخۆم دا کردووە، کەچەڵیش هەتا گرتی کوتەکێکی لە لا قونی دا مەلا دەرپێی دا کەند و دەرپەڕی لە دووری مالاّن چاوەڕوانی شوانە و جوەی بوو، ئەوجارە کەچەڵ وتی: شوانە هەستە ئەویش وتی: جاریٚ زووە بۆ هەستم؟ وتی: دە هەستە ئەگەر خۆت پیس نەکردووە مەڕەکانت باژۆ و بڕۆ، شوانەش چ شکی بەخۆ نەدەهات خۆی پیس کردبیٚ بەلاّم دەستی لە لۆرکەی گیر بوو، وتی: کوڕە بە قورئان خۆم پیس کردووە کەچەڵیش هەتا گرتی کوتەکێکی لەلا ڕانیدا شوانە هەتا پێی تێدا بوو دەرپەڕی. کەچەڵ ئەو جارە چوو کژ جووی وتی: جوە هەستە درەنگە ماڵەکەت ببەوە ئەگەر خۆت پیس نەکردووە جوە قیت بۆە دەستی لۆ پشتەوە برد دەستی لە لۆرکەی گیر بوو کەچەڵ کوتەکی لێدا جوە ڕاپەڕی پارچە جاویان لە پیٚ ئالاّ و بەربۆوە وتی: کوڕە کەچەڵ بە قوربانت بم چم لیٚ دەکەی ڕیخەڵۆکەشم هاتۆتە دەریٚ، کەچەڵ کوتەکێکی کەی لێدا و دەرپەڕی چوە لای مەلا و شوانەی لێیان پرسی ها چ بووە؟ووتی: چ بوو قوڕم بەسەری بوو هەناوم بەر بۆتەو ڕیخەڵۆکەشم هاتۆتە دەریٚ، بەو حاڵەی کەچەڵ گرەوی بردەوە، منیش هاتمەوە هیچم پیٚ نەبڕا و کلاشم دڕا .

# فەقێی سیمرخ

**کۆکردنەوە: عوزەیفا لەتیف**

هەبوو نەبوو، چ لەخودی و پێغەمبەر مەزنتر نەبوو، فەقێیەکی نێچری ڤان هەبوو، لەشکەفتیەکێ بوو، یێ ئەشقی بوو ڕوژەکی چو ڕاڤا حەیوانا حەیوانەکی کوشت و هاتەڤە، گوشتی برژا وت، گوشتێ و حازر بوو گوتی ب وەی خودی کەس نییە دگەلێ من بخوت تەیرەك، مروڤەك؟ زۆرێ سەخری بوو مام ڕوڤییەکی گۆتی: ئەزێ لێرەمە ئەگەر من نەکوژی .

فەقێ گۆتیێ: دێ وەرە، دێ وەرە تۆ گەلەك بخێرهاتی سەر سەرێ من هاتی.

چوونە دەستێ یەك، فەقێی گۆتە مام ڕۆڤی تۆ لێرە بە ئەز دێ چمە ڕاڤ و نێچیرا، وەختێ چو ڕاڤ و نێچیرا ڕوڤی ل شکەفتێ بوو. زستانە بەفرە، لێراما گورگەك وێ ڕا هات یێ پرسی گۆتی:. هۆ گورگۆ توو بۆ هۆ یێ شل و کول و دامایی؟.

گۆتی:. ما تۆ نابینی زستانە سەرمایە چ نیە ئەز بخۆم بەلێ تۆ لێرە چ دکەی؟

گۆتی:. هەی ئەز و فەقێ هەر گۆشتێ برژاو تی تخوین .

گۆت :. ئەزیش بهێم چ نادەنە من ؟ گۆتی :. بەرێ و ئەڵلاّ وەرە ، چو هەر سەر و پێی خواردن . ڕوڤی گۆتێ گوشت بخۆ .

گۆتی:. من بکەنە شریکێ خۆ باشە. ڕوڤی گۆتیێ:. باشە فەقێ مرۆڤەکی زۆرێ باشە دێ وەبێمێ، گورگ چوبن پەردەی هێڤارێ فەقێ هاتەڤە کەلەکەشەکی حەیوانی پەوێری دادا. مام ڕوڤی گۆتی:. فەقێ ئەڤرۆ گورگەك لێرە بوو گەلەکی حەز دکرد بیتە شریکێ مە. فەقێ گۆتی:. تۆ بۆ نەگۆتێ لێرە بە ماڵاّتە گورگیش یێ بێ سەبرە مام ڕوڤی گۆتێ یێ لێرە ئەگەر گاز بکەمێ دێ هێتەڤە گۆتی گاز بکەیێ گۆتی هۆ گورگ و هۆ گورگ و وەرە .

وەختێ هات چوونە دەستێ یێك فەقێی بخێر ئینا ڕوژا پاشتر دیسان فەقێ چوڤە ڕاڤێ، گورگ و ڕوڤی ل وێرێ بوون مام ڕوڤی لێ ڕاما کو پڵنگەکێ ڤ وێرێ دا تێتە خوارێ زستانە سەرمایە، گاز کرێ هۆ پلنگ و تۆ بۆچی هندەیێ شل و کولی؟ گۆتی ما تۆ نابینی زستانە سەرمایە چ نییە بخۆم، ئەڤە چەندە من

چ نەخواردییە، گوت تۆ لەوێرێ چ دکەی؟ مام ڕوڤی تۆ چ دخۆی؟ مام ڕوڤی گۆتیێ:. ئەز و فەقیێ و گورگ هەر گۆشت تخوین .

گۆتی:. ئەزیش بهێمە وێرێ چ نادەنە من! منیش ناکەنە شریکی خۆ؟ مام ڕوڤی گۆت:. زۆر باشە ئێڤاری کو فەقیێ هاتەڤە دێ وەبێمێ فەقیێ هاتەڤە کەلەشەکی بەوێری دادا. مام ڕوڤی گۆتیێ:. فەقیێ ئەڤرۆ پلنگەك لێرە بوو گەلەکی حەز دکرد ببێتە شریکێ مە، فەقێی گوتیێ:. گاز بکەییێ دا بێتەڤە، مام ڕوڤی گۆتی ها پلنگ و ها پلنگ و وەر، پلنگ هات دیسان ڕوژا پاشتر فەقی چوڤە ڕاڤێ، مام ڕوڤی دیت هرچەکا هات یا یێ سەر و بەر یا برسی کاس و کرێ هو هرچێ تۆ بوو هوو یا یێ سەر و بەری؟ گۆت ما تۆ نابینی بەفرە چ نیە بخۆم. گۆتی تۆ ل وێرێ چ دکەی تۆ چ دخۆی؟ مام ڕوڤی گۆتی ئەز و فەقیێ هەر گۆشتت خۆین، هرچیش هات مام ڕوڤی تێر گۆشت دایێ، هرچێ گۆتی ئەز زۆر حەز دکەم ببمە شریکی ئەنگو. مام ڕوڤی گۆتیێ کو فەقیێ هێڤارێ هاتەڤە دێ وەبێمێ مرۆڤەکی زۆرێ باشە. فەقیێ هێڤارێ هاتەڤە دیسا حەیوانەك کوشت بوو، مام ڕوڤی گۆتی:. ئەڤرۆ هرچیش لێرە بوو زۆری حەز دکر ببتە شریکا مە. فەقێی گۆتیێ:. گاز بکەییێ دا بهێتەڤە گاز کرێ های هرچێ وەرەڤە ئەویش هات بووە شریك دیسا ڕۆژەکێ فەقیێ چوڤە ڕاڤ و نێچیرا چوو دەڤ بیشەکی لێراما جیرە جیرەکانیش دیت کو چوچکێت سیمرخێ پێ ل سەر چنارەکێ ئەژدیهایەك یێ بێڤەدی خۆت فەقیێ چو ئەژدیها کوشت .

سیمرخ لێراما کو چیر ، چیرا چوچکێت دێ یا ڤێت ، چو پەرەکی زۆرێ مەزن دانا سەر بەرێ خۆ کۆ وا ل فەقێی دەت جوجکا گاز کرێ نەکەی ئەوە ئەم یت خلاس کر. وەختی هات لێراما کو فەقێی ئەژدیهایەك یێ کوشت گۆتی:. فەقیێ تۆ چاکیەکا گەلەك باش یا دگەل من کر ئەڤ پەرەی ببە هەر وەختەکی تۆ ئیحتاج هەبوی من ڤان دوو پەرا لێك بدە دێ ئەز یێ حازر بم. وەبو نەروژەکێ نەدوو ڕوژا مرتەب فەقیێ هەردا چیتە ڕاڤ و نێچیرا ئەوان هەمیا گوشت ل بەر دەستێ فەقێی دخوارد (ڕوڤی ، گورگ ، پلنگ ، هرچ) مام ڕوڤی روژەکێ گۆتە شریکێت خۆ فەقێی چاکیەکا گەلەك باش یادگەل مە کر ڤێ

زستانێ لازمە ئەمیش چاکیا وی ڕاست بکەینەڤە وانیش هەمیا گۆتی زۆر باشە .

مام ڕوڤی گۆتی:. فەقیٚ مسافرە لازمە ژنەکیٚ بۆ بهێنین گۆتیان کو هێڤاریٚ فەقیٚ هاتەڤە دی وەبینیٚ کانۆ کی ژن دڤێت دا بۆ تۆ بینین وەختیٚ فەقیٚ هاتەڤە گوتیٚ فەقیٚ ئەم شەرمەزاری توینە تۆ چاکیەکا گەلەك باش یا دگەل مە کر دا بۆ تۆ ژنەکیٚ بینین ، فەقیٚ گۆتیٚ :. ئەز یێ ئەشقی مە ئەو نابیت گۆتیان نەخێر هەر بهێنین کا بێژە تۆ کیٚ دڤێت . فەقیٚ گۆت :. کیژا فلان حاکم و باژیرە بەس گۆت ل ژۆر نا هێتەدەر نە ب شەڤ نە ب ڕوژ .

مام ڕوڤی گۆتیٚ:. خما من ئەز بهێنمە دەریٚ پەرێت سیمرخیٚ لێك دان سیمرخ حازر بوو. سیمرخ گۆت بەس بهێنە دەری ئەز دی ئینم مام ڕوڤی گۆتی وەرن بچین (گورگ و پلنگ و هرچ) .ڕوڤی هەستا چ کر گورگ و هرچ دا بەستن پلنگ لیٚ خورین لە نزیك زەڤیەکا باژێرە لە جیاتی گایا ، بو قیر، قیرا گوندر گۆتیان ئەڤە چییە بو پێکەنین و قیامەت ل باژێرە تشتیٚ وە تەعەجوب نەدیب بوو! .

کیژا حاکمە ناڤیٚ وی (گولزار)بو خورامەکا خۆ هەنارده دەریٚ گۆتی هەر بزانە ئەڤە چ کەنی و هەلایە . ئەو چو نەهاتەڤە یەکا دی هەنارد هەر ب ویٚ میسالیٚ هەر نەهاتەڤە ب خۆ هاتە سەر تاقیٚ قەسریٚ لێراما کو دابەلوکەك ییٚ جوتت کەت تشتەکیٚ زۆر پیٚ سەیر بو .سیمرخ تیٚ رو بو داتا سەر پەریٚ خۆ ئو بر بر ل شکەفتیٚ دانا وەختیٚ (پلنگ و گورگ و هرچ)پیٚ زانی سیمرخی کیژ بر چوتیٚ خۆیان بە تالٚ کر ، گوتیان فەقیٚ دیٚ چین مەلایەکیش ئینین چونە دوو مەلای مامزەك بۆ مەلای بر وەختیٚ چونە کولانا مەلای بچوکێت مەلای زۆر ترسیان گورگیٚ گۆتی نەترسێن مام فەقیٚ نەترسین ئەم ییٚ هاتینە ڤە بیچەکا شولیٚ یا ب ماموستایی هەی گۆتی :. ماموستا بهیٚ بۆ مە ژنەکیٚ مارە بکەی فلان شکەفتیٚ گۆتی:. سەر چاڤا .

مەلای مارە کر گورگ و پلنگ و هرچ شاهید بون سبیانیٚ هەستانەڤە چەند خێری دەڤ ڕوبارا چەند موو ییٚ ل پشتا کارا چەند پەلکێت دار و بارا هندە چادر و خیفەتە ییٚ ل دەوری وان هەلدایەڤە ل عەسکەرا فەقێی گۆتیٚ وی شەر

کەفتە سەر ملێ من مام ڕوڤی گۆتێ ناوە ئەللا ئەم دێ شەر کەین تۆ دێ لێ ڕامینی فەقێی گۆتی :. نەخێر ئەڤ شەر ب هنگو ناهێتە کرن ئەڤە شەرێ هەسپ و شەری شیر و تیرایە .

مام ڕوڤی گۆتی:. هرچێ تۆ ل عەشیرەتا خۆ هرچا چەند هزار هەینە گۆتی:. (100 000).

گۆتی:. گورگ و تۆ چەند هزار هەی گۆتی :. (000 200)عەشیرەتا گورگا.

گۆتیێ:. پلنگ تۆ چەند هزار هەیی گۆت (000 150)

مام ڕوڤی گۆتیێ:. ئەزیش ل عەشیرەتا ڕوڤیا (000 100)ین .

جوابیان دا سیمرخێ ئەویش حازر بوو، مام ڕوڤی جواب دا عەسکەر مە ئەڤرۆ شەڕ نییە هەتا سبەی مام ڕوڤی گۆتێ پلنگ و تۆ هەڕە سەر چیایی و مەسەلەن (شیرین)گۆتی:. گورگ و تۆش هەڕە سەر چیایێ (کەیروکی)هندی گورگێت دنیایی بینە خرا .

گۆتی:. هرچی، تۆش هەڕە سەر چیایی (برادوست)ە هندی هرچی دنیا دگەلٚ خۆ بینە. مام ڕوڤیش چوە سەر چیایی (بیرس). هەر یەك چونە سەر چیایەکی هەر یەکی هندی عەشیرەتا خۆ هەمی دگەل خۆ ئینان .

هرچێ پیێ خۆ ئینان دانە ڕەڤەکی گورگی یت خۆ دانە ڕەڤەکی پلنگیش هەر هەروەکو ڤی . مام ڕوڤیش هەروەها .

مام ڕوڤی گۆت:. کو شەڤ ڕاشکا هەر تشتەکێ قایش یێ دی ئەز ئینم هەر ل بێلاڤا ڕەفتەی عەسکەری هەمی شەلینم وەختی من ئەو ئینان پەرێ سێپرێ بلێ گورگ وانان دە وارا بکەڤیت و هەمیا بپەقینیت و دەوارا لێ ئەڤرەقە بکەت کو نڤێژ بو پەرێ سپیدە ڕون بوو بلێ هرچ و گورگیش ژ نان عەسکەر بکەڤت بپقنین. سیمرخیش بلێ کەرکە چیایت مەزن دا بنێتە سەر پەرێ خۆ ئو یێ داوەت. هەرکێ مەگرت قایل بو کە فەقێ حاکم یێ بلێ بچت ئەتۆ دێ کوژین تەوارەکا خۆ دروست کر وەختێ ڕوڤی چو ئەو نیشت هەمی لێ ئینان پەرێ سپێدێ گورگ راناڤ دەوارا کەتن هەمیان پەقاندن ، پەرێ سبێدێ هرچ و پلنگ راناڤ عەسکەر کەتن نیڤەك بریندار بون هندەکا خۆدشان دا هافێت هندەك ئێخسیر بون تەدێت ئێخسیر بون گاز کری گۆت وەرن فەقێ حاکمێ هنگۆیە

هنگ ت عفونه هەميا گۆتیٚ زۆر باشه فەقیٚ لیٚره دانا سەر جهیٚ حاکمیٚ و هجوم برد بۆ باژێره ، فەقیٚ کره حاکمیٚ وی باژێره .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە:. قسەکردنی درِەندە، سیمرخ و ئەژدیهایە.**

# پیاوێك و سێ كچ

**كۆكردنەوە: ڤیان عەبدولخالق حەمە**

**گێڕانەوە : مـــــام عــەزیز**

هەبوو نەبوو، کەس لەخوای گەورە تر نەبوو، یەکێ بوو یەکێ نەبوو، ماڵێك هەبوو لەگوندێکی قەد پاڵ شاخێکی سەخت نزیك دارستانێك كە پیاوێك و ژنێك سێ کچیان هەبوو. دایکی کچەکان زۆر نەخۆش بوو، ماوەیەك بەو نەخۆشییە ناڵاندی پاشان ئەمری خوای بەجێ هێنا. کچەکانی بەو شێوەیە بەجێ هێشت ، باوکی کچەکان زۆر دڵ تەنگ و خەفەت بار بوو زۆر بەزەیی بە کچەکان دەهاتەوە بە تایبەتی کچە بچوکەکەیان، کە دایکی زۆر زۆری خۆش دەویست .

پاش ماوەیەك باوکی کچەکان وای بە چاك زانی بڕوا سەردانێکی ماڵی خوا بکات، بۆ ئەوەی غەم و ناخۆشی و دڵ تەنگیەکەی بڕەوێتەوە و لەبیری بکات هەر چەندە دڵی زۆر لەلای کچەکان بوو هەموو پێویستیەکی بۆ دابین کردن و پێی وتن: لەماڵ نەچنە دەرەوە. لێیدا ڕۆیی، لەگەڵ قافلەیەك بەڕێ کەوت ڕۆژ هات و ڕۆژ ڕۆیی کچەکان لە ماڵەوە بە تەنیا بوون هەر چەندە زۆر بێ تاقەت بوون لە تەنیایی، بەڵام ڕۆژێکیان ئاگریان لێ بڕا ناچار بوون لە دووی ئاگر بگەڕێن و قسەی باوکیان بشکێنن خوشکە بچوکەکە ڕۆیشتە دەرەوە پاش ماوەیەك ڕۆیشتن بە مەبەستی گەڕان بۆ ئاگر كە تەماشای کرد وا لەناو دارستانەکە (دوو کەڵەك) بەرز دەبێتەوە ڕۆیی تا گەیشتە ئەوێ، دیتی وا دێوێك پاڵی داوەتەوە لە بیری هاتەوە ئەگەر شیری مەمکی بخۆی ئەوا زیانت لێ نادات، بۆیە ئەویش وای کرد. دێوەکە کە خەبەری بۆوە دیتی وا کچێکی بچوك لە پێشی ڕاوەستایە پێی وت : ئەوە چی دەکەی لێرە؟

کچەکە وتی: ئێمە سێ خوشکین لە ماڵەوە تەنیاین جا بەسەرهاتەکەی لەسەرەتاوە تاکو ئەو کاتە هەموو بۆ گێڕایەوە .

دێوەکە وتی: دەت دەمێ بەڵام بە مەرجێ پەنجەیەکت لێ دەکەمەوە .

کچەکە وتی : قایل دەبم کچەکە ئاگری وەرگرت و بە تکە تکە خێنی دەستی دەهاتە خوارەوە گەڕایەوە چۆلەکەیەکیش بە مەبەستی دێوەکەی زانی لە دوای کچەکە دەڕۆیشت و شوێنی خێنەکەی دەسڕیەوە و بزری دەکرد. کچەکە لێی تورە بوو لە دوای خۆی دەری کرد. دێوەکە هەر کە شەو داهات لە شوێنی خوێنەکە ڕۆیی و تا گەیشتە ماڵەکەیان بۆ ئەوەی پیلانە گلاّوەکانی جێ بەجێ بکات ، هەر کە گەیشتە ئەوێ سەگی ماڵەکە هاتە پێشی و وتی: من سەگی ئەو ماڵەم نایەڵم زیان بەو کچانە بگەیەنی، دێوەکە زراوی ڕژا لە ترسان بە پەلە هەلاّت ، وە کچەکان ڕۆژ بە ڕۆژ بێ تاقەت تر دەبوون لە تەنیایدا تەنیایی لە گەڕانەوەی باوکیان بۆ ماوەیەکی زۆر. دێوەکەش کە بەبێ تاقەتی و نەگەڕانەوەی باوکی کچەکانی زانی خۆی کرد بە پیرێژنێك و چووەوە لایان ئەوانیش داوایان لێ کرد حیکایەتیان بۆ بگێڕێتەوە، هەموو شەوێك لە دەرگایانی دەدا دوای ماوەیەك ڕۆژێك لە ڕۆژان چووە بەر دەرگای ماڵەکەیان و بە مەبەستی ئەوە هاتووە کە سەردانیان بکات. کچە بچوکەکە زانی ئەوە دێوەکەیە بە خوشکەکانی گوت ئەمە پیرێژن نییە بەڵکو دێوە دەیەوێ زیانمان پێ بگەیەنێ خوشکەکانی باوەڕیان بە قسەی خوشکە بچوکەکەیان نەکرد بەلاّم دێوەکە وتی: تا ئەو سەگە نەکوژن من نایەمە ژورێ دێوەکە ڕۆیی کچەکان لەدوای ڕۆیشتنی دێوەکە سەگەکەیان کوشت ڕۆژی دوایی هاتەوە دێوەکە دیتی وا سەگەکە لەوێ کەوتووە بە مردوویی بەلاّم دەنگی لێ بەرز بووەوە وەکو جاران وتی: من سەگی ئەو ماڵەم نایەڵم کەس زیانیان پێ بگەیەنێت دێوەکە زۆر ترسا بە کچەکانی وت: ئەگەر ئەو لاشەیەی سەگەکە نەسوتێنن ئەوا من نایەمە ژورەوە کچەکانیش سوتاندیان . کچە بچوکەکە لە ترسان خۆی شاردەوە بەلاّم خوشکەکانی کاتێ دەرگای ژوریان لەدێوەکە کردەوە ئەویش هاتە ژورەوە دەستی لە کچەکان وەشاند و زۆر گەڕا بەدوای کچە بچوکەکە بەلاّم ئەو خۆی لە کونێکی خانوەکە شاردبوەوە، زۆر لەخوا پاڕایەوە تاکو فریادی خوای گەیشتێ چەند ساڵێکی پێ چوو کچەکە شوی کرد بە کوڕێك ژیانێکی خۆشیان دابین کرد ئەم خێزانە پاش ساڵێك کوڕێکی چاو گەشیان بوو دایکی و باوکی زۆریان خۆش دەویست پیاوەکە خەریکی

دار بڕین بوو داری دەبڕی دەیبرد دەی فرۆشت، ڕۆژێك لە دورەوە بینی وا ئەسپێکی زۆر جوان دێت پیاوەکە ئەسپەکەی گرتەوە زۆر دڵی پێ خۆش بوو تاکو کاری پێ بکات. بەڵام ژنەکە زۆر لێی دەترسا کە تەماشای چاوی دەکرد بە چاوێکی شەڕاوی سەیری ژنەکەی دەکرد لەبەر هەندێ بە پیاوەکەی وت: با ئەم ئەسپە بکوژین نەوەك زیانێکمان پێ بگەیەنێ. پیاوەکە زۆر هەوڵی لەگەڵ ژنەکەدا بەڵام ژنەکە لەسەر قسەی خۆی سوڕ بوو پیاوەکە ناچار بوو ئەسپەکە لەناو بەرێ هەر بەوەش نەوەستا بەڵکو لاشەکەشی سوتاند و لەناوی برد بەڵام زۆری نەخایاند لە شوێنی سوتاندنی ئەسپەکە دارێکی بەردار ڕوا ڕۆژ بەڕۆژ زوتر گەشەی دەکرد ژنەکە زۆر لای سەیر بوو! بەڵام وای کرد کە کەس لە خێزانەکەیان بەری ئەو دارە نەخۆن چونکە نەوەکو زیانیان پێ بگەیەنێ .

ڕۆژێ دایکەکە لە ماڵەوە نەبوو منداڵەکەیان کە تەمەنی(6)ساڵان بوو ئەو کاتە  بە هەڵی زانی چوو بەشێ لەبەری ئەو دارەی لێ کردەوە و خواردی هەر کە لە قوڕگی چووە خوار هەردوو چاوی کوێر بوو نەی دەزانی چی بەسەر هاتووە کاتێك دایکی گەیشتەوە ماڵێ کۆڕپەکەی بەو شێوەیە دیت زانی ئەو دارە یەکێکە لە کارە شەڕەکانی دێوەکە بۆیە کاتێك باوکی کوڕە گەڕایەوە ماڵەوە داوای لێ کرد ئەو دارە ببڕێ و ڕەگەکەشی بسوتێنێ تاوەکو لە شەڕی ئەو دێوە هەتا هەتایە یەکجارەکی دوور کەونەوە پیاوەکەش هەستا بە ئەنجامدانی ئەم کارە بەم جۆرە ئەم خێزانە ژیانێکی ئاسودە و خۆشیان بە درێژایی ژیانیان بەسەر برد .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: دێوەکەیە کە خۆی دەکاتە پیرەژن و ئەسپ و داری بەردار.**

# سوڵتان مەحمود

هەبوو نەبوو، کەس لەخوای گەورە تر نەبوو، سوڵتان مەحمود هەبوو ئەو سوڵتان مەحمودە ژنێکی هەبوو کە منالی نەدەبوو، هەموو ڕۆژێ سوڵتان مەحمود لەگەڵ هەیاس دەچێتە ڕاو، ڕۆژێك لە نزیك شاری سوڵتان مەحمود دەچێتە سەربانی کۆشکەکە بەدوربین تەماشای شار دەکات . لە دورەوە دەبینێ ڕەشماڵێك هەڵ دراوە، ئەویش بەیانی لەگەڵ هەیاس دەچنە لای ئەو ڕەشماڵە خاوەن ڕەشماڵەکە سێ کچی هەیە ، سوڵتان مەحمود پێیان دەڵێ : کەس ناتوانێ بە سەری شاری من دا بڕوات چۆن ئێوە هاتوونە ڕەشماڵتان هەڵ داوە. سوڵتان مەحمود گوێ لە قسەی سێ کچەکە دەبێ کچی گەورە دەڵێ: (ئەگەر بێت و سوڵتان مەحمود من بخوازێ من لە دوو مەنجەڵە شیو (100)مێوان بەڕێ دەکەم) کچی ناوەندی دەڵێ: (ئەگەر بێت و سوڵتان مەحمود من بخوازێ من لە دوو خوری دوو مافور دروست دەکەم) کچی بچووکی دەڵێ: (ئەگەر بێت و سوڵتان مەحمود من بخوازێ دوو منداڵی پەرچەم زێڕێن، دان مرواری زێڕینم دەبێ) سوڵتان مەحمود دەڵێ: دەبێ هەر سێکیان تاقی بکەمەوە، هەڵدەستێ دەڵێتە باوکی کچە من دەمەوێ دەعوەتێك بکەم لە چەند مەنجەڵ شیو دەتوانم میوان بەڕێوە بەم  باوکی کچە دەڵێ: با کچی گەورەکەم بێنم کچی گەورە دەڵێ: لە دوو مەنجەڵە شیو (100)میوان بەڕێ دەکەم، سوڵتان مەحمود چوار مەنجەڵ شیو دەکات بەشی نیوەیانیش ناکات ئەوەی تاقی کردەوە، کچی دوەمی تاقی کردەوە وتی: لە چەند خوری دەتوانی چەند مافورت بۆ دروست بکات کچە وتی: لە دوو خوری دوو مافور دروست دەکەم. سوڵتان مەحمود سێ خوری هێنا کەچی بەشی هیچی نەکرد. سوڵتان مەحمود کچی بچوکی تاقی کردەوە هەستا کچی بچوکی مارە کرد سوڵتان مەحمود لەگەڵ هەیاس دەچێتە ڕاو. ژنەکەی سوڵتان مەحمود بە مامانەکەی دەڵێت دەبێ بچیە سەر بانی بۆ ئەوەی منالی بێ، ژنی بچوکی دوو منالی دەبێ، ژنی سوڵتان مەحمود ئەگەر بێتو سوڵتان مەحمود بزانێ منالی بووە ئەوا ئێمە فڕێ دەداتە دەرەوە هەڵدەستن هەردوو منداڵەکە لەناو

سندوقێكی قیڕ كراو دادەنێن بە ئاوی دا دەڕۆن دوو منالّەكە. كاتێك سولّتان مەحمود لە ڕاوی دێتەوە دەبینێ ژنەكەی دوو فەرخە گوجیلە سەگیان بۆ داناوە . سولّتان مەحمود دێتەوە دەلّێ : سولّتان مەحمود هەلّدەستی ژنەكەی دەخاتە ناو بەرگی گاو دەیكاتە پردێك خەلّك بەسەری دا بڕوات . دوو منالّەكە بە ئاودا دەڕۆن دەگەنە لای ئاشەوانێك ئاشەوانەكە دوو سندوقەكە هەلّ دەگرێ و دەیباتەوە مالّەوە . سندوقەكە دەكەنەوە دەبینن دوو منالّی هەندە جوانی تیایە . ئەو دوو منالّە بەخێو دەكەن . ئەو دوو منالّە گەورە دەبن ڕۆژێكیان دوو منالّەكە دەلّێن دەی ئێمە منالّی ئەم ژن و پیاوە نین ئێمە ئەوەندە جوانین ڕۆژێكیان براكەی دەلّێتە دایكی و باوكی ئێمە منالّی ئێوەین ئەویش دەلّێ: ئەی ئێوە منالّی كێن . چەند جارێك بەو دایك و باوكە دەلّێن لە دوایی دا ژن و پیاوەكە ڕاستیەكەیان پێ دەلّێن سندوقەكە دەهێنێ دەلّێ : ئێوەم لەناو ئەو سندوقە هەلّگرتووە. ئەگەر ئێوە بەمن ڕازینە زۆر باشە ئەگەرنا من تەنها شێرێك و ئەسپەكم هەیە ، ئەوانیش دەلّێن ئێمە دەڕۆین هەتا دایكمان ببینینەوە .

ئەو خوشك و برایە دەڕۆن هەتا دەگەنە شاری سولّتان مەحمود دیسان سولّتان مەحمود بەمەی زانی دەچێتە لایان دەبینێ دوو منالّن ئەوەندە جوانن خۆشیانی دەوێ . دەلّێتە برای كچەكە هەموو ڕۆژێ بێیتە دیوەخانێ . ئەویش دەلّێ باشە . مامانەكە بە ژنی سولّتان مەحمود دەلّێ : دوو منالّەكە ماون ئێمە چی بكەین باشە ئەگەر بێتو سولّتان مەحمود بزانێ ئێمە دەكوژێ ژنەكە دەلّێتە مامانەكەی بە فێلّی دار خڕ كردنەوە بچۆ لای كچەكە پێی بلّێ بۆ ناچی كراسی زارێی بۆ بێنی. ئینجا پیرێژنەكە دەچێتە لای كچەكە پێی دەلّێ ئەویش كە برای هاتەوە بۆی دەگێڕێتەوە براكەی دەلّێ : بەسەر چاو براكەی دەلّێتە ئەسپەكە ئالیك بخۆ سەفەرمان لە پێشە .

ئەسپەكە دەلّێ: بۆ كوێ؟ دەلّێ : دەچم كراسی زارێ بۆ خوشكم دەهێنم ، دەلّێ: هەڕو ڕێگایەكی زۆر خەتەرە بەلاّم كوڕەكە بەهەر شێوەیەك دەچێت كراسی زارێ دەهێنێ . پیرەژنەكە دیسان بە فێلّی دار خڕ كردنەوە دێتە لای كچەكە پێی دەلّێ: بزانە چەند پێی جوانە ئەی بۆ برات ناچێ ساحێب ئەم

کراسە بهێنیّ. ئەویش کە برای هاتەوە پێی دەڵیّ: بۆ ناچی ساحێبی کراسی زاریّ بهێنی هەم دەبێتە براژنم و هەم دەبێتە هاورێیەکم دیسان براکەی بە ئەسپ دەڵیّ: ئالیك بخۆ سەفەرمان لە پێشە ئەویش دەڵیّ: بۆ کویّ، دەڵیّ: دەچم ساحێب کراسی زاریّ دەهێنم دەڵیّ: کورە مەڕۆ ڕێگایەکی زۆر خەتەرە چەند کەس چوو بێتە ئەویّ دەبێتە بەرد دەڵیّ: هەر دەچم دەڵیّ: باشە بەهەر شێوەیەك دەچیّ ساحێب کراسی زاریّ لەگەڵ (100)سواری لەگەڵ خۆی دەهێنی .

سوڵتان مەحمود بەمە دەزانی دەڵیّ : ئەوە یەك تاکە کەس بوو بەڵام ئێستا (100)سواری لەگەڵ دایە . سوڵتان دەڵیّ : چ بکەم باشە ژنی سوڵتان مەحمود دەڵیّ : بڕۆ دەعوەتیان بکە ژەهری بۆ دانیّ ڕۆژێك دادیّ تۆی لەناو دەبات سوڵتان دەچیّ بۆ لای کوڕەکە دەڵێتە کوڕەکە بەیانی دەعوەتی منن بەڵام خێزان (ساحێب کراسی زاریّ)و کوڕەکە دەڵیّ : نا ئێمە تۆ دەعوەت دەکەین ئینجا تۆ ئێمە دەعوەت بکە . بەیانی سوڵتان مەحمود لەگەڵ (100)سوار دەچنە دەعوەتی کوڕەکە ژنی کوڕەکە نانی دەداتە هەموویان بەس سوڵتان مەحمود دەمێنێتەوە لە دوایدا ژنی کوڕەکە دەچی (قاپێك ئێسك دەهێنیّ)سەری بەزێڕ داپۆشیوە . سوڵتان مەحمود سەری قاپەکە هەڵ دەداتەوە دەبینیّ بەس ئێسکە دەڵیّ : بۆ من سەگم ئێسکم دەدەنیّ ئەویش دەڵیّ : ئەگەر سەگ نەبی چۆن فەرخە گوجیلەت دەبی . بە سوڵتان مەحمود دەڵیّ : ئەوە هەردوو منالّی تو نینە ئەویش دەزانیّ لەگەڵ دوو منالّەکە شاد دەبێتەوە ، دەچیّ دایکی دوو منالّەکە پاك دەکاتەوە هەمویان بەیەك شاد دەبن و مامانەکە و ژنەکەی دەکوژیّ . ئیتر هەمویان پێکەوە دەژین .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: مندالّی پەرچەم زێڕین و ددان مرواری و قسەکردنی.**

# حاجی لەق لەق و مام ڕێوی

**کۆکردنەوە: قانع عەبدولڕەحمان**

ڕۆژێکیان مام ڕێوی و حاجی لەق لەق توشی یەکتر دەبن و دەکەونە ئەحواڵ پرسینی یەکتر، پاشان حاجی لەق لەق دەڵێ مام ڕێوی بەیانی دەعوەتی منی ، ئەمیش دەڵێ باشە .

بەیانی مام ڕێوی بە دەم دەعوەتەکەی حاجی لەق لەقەوە دەچێت ، سەیر دەکات حاجی لەق لەق شیوی (نۆکی)بۆ لێناوە ، بەڵام لەناو گۆزەیەکی کردووە، کە مام ڕێوی دەمی پیا ناچێت شیوەکە بخوات بۆیە حاجی لەق لەق بە کەیفی خۆی بەهۆی مل و دەنوکە درێژەکەیەوە تێر نۆکاو دەخوات ، مام ڕێویش ئەمڕۆژە بە سکی برسی دەمێنێتەوە. بۆیە مام ڕێوی لە دڵی خۆیدا دەڵێ دەردت لە گیانم، دەبێ تۆڵەت لێ بکەمەوە ئەویش بە حاجی لەقە لەق دەڵێ بەیانی دەعوەتی منی .

بەیانی دادێ حاجی لەق لەق، بەدەم دەعوەتەکەی مام ڕێوی دەچێ سەیر دەکات، مام ڕێوی شیوی (نیسکی)لێناوە ، وە لەسەر سێنیش ڕووی کردوە بۆیە مامی ڕێوی بە کەیفی خۆی زمان بە نیسکەکە دادێنێ وە حاجی لەق لەقیش ، دەنوك لە سێنی دەدات ، تەقەی لێوە دێت ، هیچی نایەتە ناو دەم .
ئەویش ئەم ڕۆژ بە سکی برسی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ ، وە ئاخ و ئۆف دەکات بۆ تۆڵە سەندنەوە لە مام ڕێوی .

بۆیە حاجی لەق لەق بەیانی دێتە لای مام ڕێوی پێی دەڵێ ... ئەگەر حەزت لێیە جیهانی سەروو دار و دارستان و ناوچەکانی تری ئەم دارستانە ببینی لەسەر باڵەکانی خۆمت دادەنێم بەرزت دەکەمەوە بۆ ئاسمان. ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ، زۆر باشە زۆر حەز دەکەم ، بۆیە مام ڕێوی دەچێتە سەر پشتی حاجی لەق لەق و لەق لەق دەفڕێ بۆ ئاسمان، پاش هەندێ گەڕان و سوڕان و ڕۆیشتن ، لەق لەق بە مام ڕێوی دەڵێ، بە قەدر چەند زەویت لێ دیارە، ئەویش

دەڵێ: بەقەدر جێگای خانوێك پاشان هەندێکی تر بەرزی دەکاتەوە ولێی دەپرسێ بەقەد چەند زەویت لێ دیارە، ئەویش دەڵێ بەقەد بەرماڵێك پاشان دیسان لێی دەپرسێ، ئەویش دەڵێ بەقەد بێژینگێك، بۆیە لەق لەق، بە ڕێوی دەڵێ ئێستا کاتی ئەوە هاتوە تۆڵەی لێ بکەمەوە، ڕێوی تۆڵەی چ ، بابت چاك دایکت چاك حاجی لەق لەق ئەوەی من کردم تۆ نەیکەی، ئەم قسانە ئیستیفادەی نەبوو یەکسەر لەق لەق مام ڕێوی بەرداوە ، لەسەر باڵەکانی مام ڕێویش : دەستی کرد بە هاوار هاوار دەیگوت (ئەڵڵا وڕمان لە جێی نەرمان .....)هەتا کەوتە سەر کەسێك کە لە زەوی نوێژی دەکرد کەوتە سەر ئەو کەسە، بۆیە مرۆڤەکە لە ترسان ڕاپەریوو(دوو گوردەکەی)بەجێ هێشت، مام ڕێوی بەساغ و سەلامەتی نەجاتی بوو، وە (دوو گوردەکەی)بەسەر شانی خۆی داداو ڕۆیشت، ئەمجارەیان مام ڕێوی توشی (مام گورگ)بوو .

مام گورگ پێی وت: ها ئەوە لەکوێ دێی، ئەم دووگوردەت لە کوێ بوو یەکێکی ئەوهاش بۆ من پەیدا ناکەی، مام ڕێوی وتی: ئەمە خۆم دروستم کردوە، بۆیە ئەگەر چەند مەڕ و بزنێکم بۆ دێنی ئەوا لە خوری و موەکانیان ، بۆت دروست دەکەم، وە گۆشتەکەشیان بۆ خۆم دەخۆم، مام گورگ وتی بەسەر چا ، چوو چەند مەڕ و بزنێکی بۆ هێنا ، وە مەوعیدێکیان دانا بۆ کاتی تەواو بون ، پاش ماوەیەکی زۆر مام ڕێوی بزربوو ... وە کاتی مەوعیدەکەش تەواو بووە ، گورگ چاوەڕێتی، بەڵام مام ڕێوی فێڵ باز ..... چوە خۆی لەناو ئەشکەوتێك ناوە، وە دەرگای لەسەر خۆی داخستوە، نایەتە دەرەوە بەهیچ شێوەیەك ، وە بەمام گورگیشی وت من ئاو و گۆشت ، بۆ چەند ڕۆژێك هەیە .... پاش تێپەڕ بوونی چەند ڕۆژێك مام ڕێوی خۆراکی نەما ناچار بوو بێتە دەرێ . بەڵام زۆر دەترسا ... بۆیە هاتە دەرەوە ناچار بوو .... پاش چەند ڕۆژێك ... ڕۆژێکیان مام گورگ ... لەناو دارستان توشی بو گرتی ، وتی مام ڕێوی ئێستا لە دەستم نەجات نابی ، ئەم جارە بە ئەنجامی خۆت دەگەی، مام ڕێوی فێڵ با ، زۆر فێڵ و مەکر و حیلەی کردوە لە ژیاندا بەڵام ئەمجارەش دەبێ دەربچێ؟

بۆیه مام گورگ توند به دەمەکانی مام ڕێوی گرتبوو، مام ڕێوی پێی وت من عەشیرەتم فلان عەشیرەتە مام گورگ، ئەدی تۆ عەشیرەتت چییە؟ مام گورگیش لە وەلامدا وتی: من عەشیرەتم (بلباس)ە، یەکسەر بەم دەم جولانە مام ڕێوی لە دەم بەربو وە ڕێوی فێڵ باز ڕزگاری بو ئەمجارەش .... مام ڕێوی لە فێڵەکەی دا سەر کەوتو بو ، کراشم دڕا هیچم پێ نەبڕا .

*ئەم چیرۆکە چیرۆکی گیاندارانە و قسەکردنی گیاندارەکان ڕەگەزێکی ئەفسانەییە.

# قاز و کەڵەشێر و عەلە شیش و پەپۆ سلێمان و مام ڕێوی ....

هەبوو نەبوو، قازێك و کەڵە شێرێك و عەلەشیشێك و پەپۆ سلێمانەیەك هەبوون، بڕیاریاندا کە ئەم ساڵی دابێ بچنە حەج. بۆیە ساڵ هات و ڕۆیشت دەستیان بە ڕۆیشتن کرد بۆ حەجکردن، پاش بڕینی ماوەیەکی زۆر لە ڕێگادا ، مام ڕێوی فێڵ باز توشیان بوو ، پێی وتن مەترسن ناتان خۆم منیش تۆبەم کردوە وە لەگەڵ ئێوە دێم بۆ حەج هیچ کە کاری خراپ ناکەم ... ئەوانیش باوەڕیان پێ کرد و وتیان باشە لەگەڵمان وەرە ، ئەوە بو بە درێژی ئەو ڕۆژە ڕۆیشتن لە ڕێگادا شەویان بەسەر داهات ، بۆیە مام ڕێوی پێی وتن ئەوا ئەشکەوتێك لەسەر ئەم ڕێگایەدا هەیە ، بڕۆ با بچین بۆ ئەوێ من حەرەستان دەبم و ئێوەش بنون ئەوانیش وتیان باشە . ئەوەبو چونە شوێنەکە شەو درەنگ دا هات مام ڕێوی هەر لە فکری خواردن دایە ، سکی خوڕەی دێ لە برسان یەکسەر بەڵێنی دا کە دەبێ کارێك بکات ئەگەر نا لەبرسان دەمرێ بۆیە کەوتە ئەم فێڵە .

ـ یەکەم جار: بانگی عەلەشیشی کرد، پێی وت باشە ئەتو بۆ کە بەچکەت (جوجکەت) دەبێ ... ڕاوی منالآن دەنێی لە منداڵ دەدەی ... یەکسەر گرتی و خواردی .

ـ دووەم جار : بانگی کەڵەبابی کرد و پێی وت ئەی کەڵەباب دەزانی ئەتو زۆر ئازاری خەڵکی دەدەی لە کاتی بەیانیان ، ئەویش وتی بۆ ؟ ڕێویش پێی وت چونکە خەڵك زوو لەخەو هەڵدەستێنی وە خەڵك ئیزعاج دەکەی، نایەڵی تێرخەو بن بۆیە یەکسەر ئەویشی گرت خواردی . پاش ماوەیەکی تر ئەمجارە بانگی قازی کرد ، وە پێی وت باشە بۆ لەکاتێ کە فەرخەت هەیە پەلاماری مندالآن دەدەیت و دەیان گەزی .

یەکسەر ئەویشی خوارد. لە کۆتاییدا تەنها پۆپە سلێمانە ماوە، ئەویشی بانگ کرد، بەلآم پەپۆ سلێمانە پێی وت: من بۆ دەخۆی هیچ گۆشتم نییە ئەوانت خوارد بەلآم من مەخۆ مام ڕێوی پێی وت بڕۆ ئەوە تۆم ئازاد کرد .

پاشان مام ڕێوی خەوێکی خۆشی لێ کەوت ، تێره ... بەڵام پۆپە سلێمانە وتی دەبێ هەر تۆڵەی هاوڕێکانم لێت بکەمەوە ... بۆیە لەو دەور و بەرەدا کابرایەکی ڕاوکەر هەبو ناوی (مام حەیدەر)بوو ... لەو ناوچەیە دەگەڕا بۆ ڕاو کردن ، پۆپە سلێمانە کە ئەوی بینی یەکسەر چوە بەردەم تانجیەکانی مام حەیدەر نیشت ، تا تانجیەکانیش غاریان دایێ ئەویش فڕی چوە جێگایەکی تر نیشت لەبەر دەم تانجیەکان چەند جارێك ئەمەی دوبارە کردەوە .... تا تانجیەکانی بردە بەردەم کونی مام ڕێوی ، ئەمجا پۆپە سلێمانی بە مام حەیدەری وت (مام حەیدەرێ لە تیشی تێی بەردە تانجی و تاری گوێ بە ڕیشی ، چەند جارێك دوبارەی کردەوە ...) ئەوە بوو تانجیەکانی مام ڕێویان گرت و لە خرتۆریان وەردا و لێك و پێکیان کردوە و ئەوەی خواردبوی لێیان هێناوە .... لە ئەنجامدا مام حەیدەر ڕێویەکەی گرت و وە پەپۆ سلێمانەش زۆر دڵی خۆش بو .

ئێمەش لە کۆتاییدا دەڵێین هەر کەسێ زوڵم بکات وەك مام ڕێوی بەسەر دێت بەڵام نازانم دەبێ (سەدام) بە منداڵی گوێی لەم جۆرە چیرۆکانە نەبوبێ.

لەکۆتایی دا کراسم بڕا هیچم پێ نەبڕا .

***ئەم چیرۆکەش چیرۆکی گیاندارانە.**

# مریشكە ڕەشە

هەبوو نەبوو، ماڵێك هەبوو لەبنگەی بوون، مەڕو ماڵاتیان بەخێو دەكرد پاش ئەوەی وەرزی بەهار بەسەر چوو. ماڵەكە ڕۆیشتن و چوونەوە گوندەكەیان بەڵام لەدوای خۆیان (مریشكێكیان) لەبیر كرد ئەویش مریشكە ڕەشە بوو مریشكە ڕەشە پاش ماوەیەك لە هێلكە كردن كورك بوو. ئەوە بوو پاش ماوەیەك فەرخەی هەڵهێنا هەموو ڕۆژێك فەرخەكانی دەبرد بۆ ناو دەشت و دەر چینەی بۆ دەكردن و بەخێوی دەكردن .

پاش ماوەیەك جوجەكانی گەورە ببوون .... بەڵام ڕێویەك پێی فێر ببو ناوە ناوە جوجكەیەكی لێ دەخوارد ئەویش فكری كردەوە، وتی من كاریێ ناكەم ڕۆژێك دادیێ منیش دەخوا بۆیە هەتا زووە بچمە لای (مام حەیدەری لاتشیێ) چووە لای مام حەیدەری ڕاو چی وە پێی وت: ئەوە ڕێویەك پێمان فێر بووە ناوە ناوە دیێ جوجكەیەكم لێ دەخوات ، ئەگەر چارەیەكی لێ نەكەی ئەوە ڕۆژێك دادیێ منیش دەخوا، ئەویش وتی باشە. مام مریشك تۆ فێڵێكی بۆ دانێیەوە كە بەئاسانی بیگرین . مریشكە ڕەشەش بە مام حەیدەری وت، من ئەوڕۆ دەعوەتی دەكەم پاش ئەوەی كە مام ڕێوی هات من هاوار دەكەم مام حەیدەری لەتیشی تێبەردە و تاژی و تولەی گویێ بە ڕیشی، تۆش یەكسەر كە لەناو قەمیشەلأنەكە وەرە دەرەوە تاژی و تولەی تیێ بەردا مام حەیدەر وتی زۆر باشە مریشكە ڕەشە .

بەیانی داهات مام مریشك وتی: مام ڕێوی دەعوەتی بەیانی لای منی ئەویش وتی باشە ، پاش ئەوەی مام ڕێوی هات بە دەم دەعوەتەكەی مریشكە ڕەشە، پاش نان خواردن مریشكە ڕەشە بە ڕێوی وت: دەبا لەگەڵ جوجەڵەكانم پێكەوە پێچە شاییەك بكەین ئەویش وتی: باشە بۆیە دەستیان كرد بە شایی مام ڕێوی دەیوت: مریشكە ڕەشە ئای گۆشتی جوجكەكانت چەند خۆشە مریشكە ڕەشەش بە دەم ئاوازەوە وەڵامی مام ڕێوی دەدایەوە دەی وت: مام حەیدەری لەتیشی تێی بەردە تاژی و تولەی گویێ بەڕیشی، چەند جارێك

ئەمەی دوو بارە کردەوە ... مام حەیدەر تێی بەردا تاژی و تولەی گوێ بەریشی لە ئەنجامدا مام ڕێویان گرت و مریشکە ڕەشەش ڕزگاری بوو پاش ساڵێکی تر کە ماڵەکە هاتنەوە بنگەی مریشکە ڕەشە بەخۆی و بەچکەکانی شاد بوویەوە بە ماڵەکە و لە کۆتایی دا ژیانێکی خۆشی بردە سەر . منیش دەڵێم خۆزگە هەموو ستەم کارێك بە ئەنجامی خۆی بگات و وە خەڵکیش وەکو مریشکە ڕەشە بەخۆشی ژیان بەرنە سەر لە کۆتایی دا کراشم دڕا هیچم پێ نەبڕا .

*چیرۆکی گیاندارانە.

# چیرۆکی مام ڕێوی و مام ورچ و مام گورگ و مام پرینگ

هەبوو نەبوو، لە دارستانێکدا کۆمەڵێك گیانەوەر پێکەوە دەژیان بۆیە وەرزی پایز بەسەر پایز چوو ، دونیا بەرە و سارد و سەرماچوون دەچوو بۆیە لە وەرزی زستاندا ساردە و خۆراك کەم دەبێت . بۆیە (ڕێوی و ورچ و گورگ و پرینگ) پێکەوە کۆ بوونەوە بۆ ئەوەی کارێك بە کۆمەڵەی هەرەوەزی بکەن کە خۆیان لەم زستانە ساردە ڕزگار بکەن ، ئەوە بوو لە ئەشکەوتێك دانیشتن و دەستیان بە گفت و گۆو ڕا گۆڕینەوە کرد. پاش ئەوەی هەموویان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن کە چەند گیانەوەرێك ڕاو بکەن وە گۆشتەکەیان بکوڵێنن و لەناو چەند مەنجەڵێکی گەورەی بکەن لەسەر ئەشکەوتەکەی خۆیان دا بنێن ،کە ئەو ئەشکەوتەی بۆ زستان گەرمیان کردبوو تێی دا بحەوێنەوە .

پاش ئەوەی کارەکەیان ئەنجامدا پێکەوە چەند ڕۆژێك ژیانیان بە خۆشی بەسەر دەبرد ، ڕۆژێ هەندێك گۆشتیان دەهێناو دەیانخوارد ، پاش چەند ڕۆژێك بەم شێوەیە ژیانیان دەبردە سەر ، بەڵام لێرەدا مام ڕێوی (منافق) دیسان کەوتە فێڵ و تەڵەکە بازی ئەوە بوو هەوڵی دا کە فێڵێك بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی گۆشتەکە هەموو بخوا بەبێ ئەوەی کەسێك بزانێ ئەوە بوو شەوێك هەر لەخۆڕا مام ڕێوی هەڵستاوە لەخەو وتی (ها ها ئەوە کییە گاز دەکات) یەکسەر چوە دەرەوەی ئەشکەوتەکە ، وتیان ها مام ڕێوی ئەوە چ بوو ، ئەویش لە وەڵامدا وتی : ئەوە هاتینە دەڵێنماڵی مام شێر منداڵیان دەبێت بۆیە هاتونەتە دوای من کە ناویان بۆ مناڵەکە لێ بنێم ، ئەوانیش وتیان فەرمو بڕۆ مام ڕێوی.... پاش چەند ساتێك مام ڕێوی هاتەوە و وتیان مام ڕێوی ناوی چت لێ ناوە لە مناڵەکە وتی : ناوم لێ ناوە (سەرلێس) ئەوانیش وتیان ئەو ناوە تازەت لەکوێ هێناوە مام ڕێوی .بۆیە کاتی بەیانی بوەوە وتیان مام ورچ ئەوڕۆ سرەی توە بڕۆ گۆشتمان بۆ بێنە سەیر دەکات گۆشتەکە بەشی سەرەوەی مەنجەڵێك هەمووی خوراوە یەکسەر بە پەلە پەل هاتەوە ، وتی : گۆشت دزراوە ئەولا ئەولایان کرد نەیانزانی کێ خواردویەتی بۆیە وازیان هێنا نەیانزانی کێ خواردویەتی ، پاش چەند ڕۆژێك مام ڕێوی شەوێکی تر دیسان هەڵستاوە

وتی ها ها ئەوە کییە گاز دەکات؟ وتیان ئەوە ماڵی فلاَن شێرە مناڵیان بووە هاتوونە ناوی لێ نێ ، بۆیە دیسان مام ڕێوی چوو بۆ ناو لێنانی ئەو مناڵە پاشان گەڕایەوە ، وتیان ها ئەوجا چ ناوێکت لێ نا وتی ناوم لێ نا (بنلێس) وتیان ناوێکی چەند تازەیە ئەم ناوە پاشان بەیانی داهات بە مام گورگیان وت بڕۆ گۆشت بێنە پاش ئەوەی مام گورگ چوو سەیری مەنجەڵەکەی کرد دەبینێ مەنجەڵەکە بەتاڵ بووە هەموو گۆشتەکە خوراوە بۆیە یەکسەر بە پەلە هاتەوە ، وتی دیسان گۆشت دزراوە ، ئەوانیش وتیان ئێمە دەبێت کارێك بکەین بۆ ئاشکرا کردنی ئەم دزیە ....

دەبێت ئەم دزیە هەر لەناو خۆمان بێت ئەگەرنا کەسێکی تر ناتوانێ زەفەر بە ئێمە ببات . وە هەتا ئێستاش کە سێکمان نەگرتووە لەو دزی کردنەدا بۆیە یەکسەر هەموویان کۆ بوونەوە وە مام ورچ برا گەورەیان بوو کە بڕیاری دا ، دەبێت ئاگرێك بکەینەوە هەر ئێستا لەبەر ئەوەی هەر کەسێك لە ئێمە ئەگەر گۆشتەکەی خواردبێ ئەوا (ڕۆن و دۆنی) لێ دەچۆڕێتەوە لەلەشی بۆیە مام ڕێوی کەوتە ترسەوە بەلاَم چاری بێ چار بوو ، هیچی پێ نەکرا ، بۆیە ئاگریان کردەوە سەیریان دەکرد وا دۆن و چەوری لە لەشی ڕێوی دا دێتە خوارێ ، ڕێوی فێڵ باز خۆی لەخۆر وەردەدات هەتا چەوری پێوە نەمێنێت ، بۆیە ئەمەش فایدەی نیە لە ئەنجامدا ئاشکرا دەبێ کە مام ڕێوی خواردویەتی گۆشتەکە ، بۆیە بە مام ڕێویان وت جاری یەکەم چوی ناوی منداڵەکەت نا (سەرلێس) ئەم ناوە تەعبیری لە چی دەکرد وتی تەعبیری لەوە دەکرد کە سەری گۆشتەکەم خوارد . وە جاری دووەمیش کە ناوی منداڵەکەم نا (بنلێس) کە بنی مەنجەڵەکەم ساف کرد لە گۆشتەکە هەموم خوارد .

بۆیە لە ئەنجامدا مام ڕێوی دزی گەورە ئاشکرا بوو ، بۆیە بە سزای خۆی گەیی وە مام ورچ و مام گورگ و مام پرینگ ژیانێکی خۆشیان بەسەر برد وە زستانی سارديان بە تێر و خۆشی بەسەر برد ، وە ڕێویش لەخۆی تێکدا و دەر بەدەر بوو لەکۆتایی دا دەڵێم هەر کەسێك نیفاقی بکات وەکو مام ڕێوی بەسەر دێت توشی دەر بەدەری و ئازار دەبێ منیش ئەوە ماوە بڵێم کراشم دڕا هیچم پێ نەبڕا ...

# چیرۆکی (کابرایەکی ڕێبوار)

کابرایەکی ڕێبوار، ڕێگا دەبڕێت بۆ ئەوەی بگاتەماڵەوە بگاتەوە گوندەکەی بەڵام لە ڕێگادا درەنگی بەسەر دا دێت. بەرە بەری خۆر ئاوا بوون دەبیٚ بەڵام هێشتا ئەو شوێنە ئاوەدانیەی دەیەویٚ بیگاتیٚ زۆری ماوە .

بۆیە سەیرێکی دواوەی خۆی دەکات ، دەبینیٚ شتێکی ڕەش لە دواوەی وەکو گولە دیٚ زۆر بەخێرایی پیاوەکە ڕا دەکات و سەیر دەکات کاولە گوندێکی چۆڵ هەیە لە پێشی بۆیە ناچار دەبێت بۆ ئەم کاولە گوندە ڕا بکات کە زیندەوەرێکی لیٚ نیە کەسی لیٚ نیە چۆڵ و هۆڵە ، بۆیە ناچار دەبێت بچێت بۆ ناو ژورێك لەم ژورانەی کاولە گوندەکە وە دەرگاکە بە خشت جوان دەگرێت و سەیر دەکات لەبەر دیواری خانوەکەدا (تاخن چکە) هەیە کە پێشتر خەڵك شت و مەکی دەهاویشتە سەری لەبەر دیواری خانوو دەیان کوتی ، بۆیە کابرایەکە یەکسەر دەچێتە سەر ئەم (تاخن چکەیە) بەڵام شتە ڕەشەکە (گورگ دەردەچیٚ) وە دێتن بۆ ژوورەکە ، دەرگاکە دەکاتەوە ، بەڵام کاتێك دێتە ژوورەوە کابرای پیٚ ناخورێت هەر چەند پەلاماری دەدات نایگات پێی بۆیە (گورگ)ەکە کە بەسەر خانوەکە دەکەویٚ لەسەرەوە شوێن ڕاستی پیاوەکە بە پێیەکانی هەڵی دەکۆڵیٚ وە کونی دەکات شوێنەکە بۆیە لە کاتی کون کردن دا پێیەکانی ڕاست دەکەوێتە ناو چاڵەکە ، دوو لە پێیەکانی شۆڕ دەبێتەوە بۆ سەر کابرایەکە کابراکەش تەنها (قەرەن برێکی)پیٚ دەبێت بۆیە دۆخینی شەرواڵەکەی لیٚ دەکاتەوە لە پێی گورگەکە دەبەستیٚ و (لە کاریتەی) خانوەکەی دەبەستێتەوە. بۆیە گورگەکە هیچی پیٚ ناکریٚ لە ئەنجام دا کابرای ڕێبوار ڕزگاری دەبێت بەڵام چ ڕزگار بونێك بۆیە دەڵێن پاش ئەوەی دەگات بە ئاوەدانی ، پاش چەند ڕۆژێك لە ترسان گیانی دەردەچێت و دەمرێت.

منیش دەڵێم پیاوێکی ئازا و نەبەرد بوە، بەڵام ئاخیریش هەر بەهۆی ئەم ڕوداوەوە مردوە .... وە لەکاتی خۆی ئەم چیرۆکەیان لە تەمەنی منداڵی بۆ من دەگێڕایەوە، من نەدەوێرام بە تەواوی گویٚ بۆ هەرماڵم ، چونکە ئەم جۆرە

چیرۆکانە پڕیەتی لە ترس وە باش نییە بۆ منداڵان بگێڕدرێتەوە بەڵام من ناچار بووم ئێستا بۆ خۆم بیگێڕمەوە ، گەورە بوومە و ڕۆژانی منداڵی خۆم بەبیر خۆم بێنمەوە . لە کۆتاییدا هەگبەم دڕا هیچم پێ نەبڕا.

*ئەم حەکایەتە وەك ڕووداوێکی ڕاستەقینە وایە .

# پیرەداك بە کچی جاحێل

هەبوو نەبوو، کابرایەك هەبوو، پیر دایکێکی هەبوو، لە یەکێك لە گوندەکاندا ژیانی بەسەر دەبرد، ئەم کابرایە خێزانی نەبوو، بەس تەنهاپیرە داکێکی هەبوو لەگەڵی ژیانی دەبردە سەر هەتا ڕۆژێك دایکی مرد، بۆیە خەڵکی گوندەکە داوایان لێ کرد کە دایکی بشۆن و بشارنەوە بەلاّم ئەو قەبووڵی نەکرد، بەڵکو هەستا دایکی لە سواری (گوێ درێژێك)بەستایەوە، خۆشی سواری سەرپشتی (گوێ درێژەکە)بوو، دایکی لە پشتی خۆیەوە بەستەوە، پاشان ڕۆیشتن گوندەکەی خۆیان بەجێ هێشت، ڕۆیشتن هەتا گەیشتە گوندێکی تر، پێش ئەوەی بگاتە گوندەکە گوێ درێژەکەی بەرەلاّ کردە سەر جۆخینی گەنم و جۆ کە خەڵکی گوندەکە گەنم جۆیەکانیان لێ ڕووکردبوو. وەخۆشی لە شوێنێکی پەنا دا شاردەوە لە نزیك جۆخینەکە، بۆ ئەوەی کەس نەبینێ پاشان کە گوێ درێژەکە چووە سەر جۆخینەکە، کە چەند برسییە دەستی کرد بە لەوەڕین لە جۆ، پیرە داکیشی هەر لەسەر پشتیتی، ئۆها! بۆ خاوەن دەغڵ چاوی پێ ناکەوێ شێت دەبێ. بۆیە هەر بە غاردان دەڕوات (کوڕە هۆ کوڕە هۆ کابرا)کابرای چی پیرێژن حەیاتی لێ براوە، چەند ڕۆژێکە مردووە هەر جواب نەبوو بۆ چەند ماوەیەك پاشان کابرای خاوەن دەغڵ تووڕە بوو هەتا (کوتەك)هەبوو لە پشتی پیرێژنی دا ، یەکسەر کەوتە خوارەوە گیانی لەلەشی نەما ، کابرای خاوەن دەغڵ زۆر پەشیمان بووەوە بەم کارە بەلاّم چار نییە تازە تووش بووە ، پاش ماوەیەك کابرای خاوەن گوێ درێژ بە هاوار و وا وەیلان هات دایکمیان کوشت ، دایکمیان کوشت پاشان خەڵکێکی زۆری گوندە خڕ بوونەوە . سەیریان کرد ، وا پیرێژن مردووە ، پاشان پیرێژنەکەیان شاردەوە ، پاشان خاوەن دەغڵ و کابرایان هێنا بۆ ئەوەی مەسرەتی بکەن ، پێك هاتن بەوەی کە کچێکی (14 – 15)ساڵانیان دایە پاشان کابرا ووردە ووردە گەڕایەوە بۆ ماڵ لەگەڵ خانمێ خەڵکی گوند سەریان سوڕمابوو ئەو پیاوە دایکی مردووی برد ئەو ئافرەتە جحێڵە چییە لەگەریتی .

**پاشان کابرا کە گەیشتە جێ خەڵك ئێوارە هەموو چوونە لای . پێیان وت ئەو ئافرەتە چییە ئەویش ووتی خێزانمە ، میوانەکان سەریان سوڕما . کابراش لە وەڵامدا وتی (پیردایکی مردوو ئاگری دەکاتەوە لە گوندانی سەرەوە بە کچی 14 -15 ساڵان)خەڵکی گوند بڕوایان کرد پاشان هەریەکە و دەستیان کرد بە کوشتنی پیرداکەکانی خۆیان جا بەهەر فێڵ و فرێك بێت دەیان کوشت ، وە لە گوێ درێژیان دەبەستەوە بە گوندان دا دەگەڕان (یاڵڵا پیرە داك بە کچی جاحێڵ) خەڵکی گوندەکانیش پێیان دەوت ئێوە شێتن لە ئەنجامی ئەوەدا بە دەست بەتاڵی هاتنەوە وتیان کابرا کوا ئەو شتەی وتت ڕاست دەر نەچوو ، ئەویش هەر دەیووت (پیرێژنی پیری مردوو ئاگری دەکاتەوە و بە کچی جاحێڵ) .**

# بەد بەختێکی بەختەوەر

**کۆکردنەوە: گەلاوێژ حوسێن**

**هەبوو نەبوو، توجارێك هەبوو، ژنێکی زۆر جوانی هەبوو و دوو کوڕیشی هەبوو ، ڕۆژێکیان توجارەکە دەڕوات بۆ ئیش. ڕۆژێکیان توجارێکی تر دێت بۆ ئەم شارە و چاوی بە ژنی توجارەکە دەکەوێت و عەشقی دەبیٚ و داوا لە پیاوەکانی دەکات کە بەهەر شێوەیەك بێت ئەم ژنەی بۆ بهێنن و لە دەرگای ماڵە توجارەکەیان داو ژنەکەیان برد. بۆ ماوەیەك توجارەکە گەڕایەوە و بینی منداڵەکانی بە گریان پێشوازیان لە باوکیان کرد و مەسەلەکەیان بۆ باوکیان گێڕایەوە و کە دایکیان بردوە .**

**توجارەکە بە ناچاری شارەکەی بەجیٚ هێشت و ڕووی لە شارێکی تر کرد و ڕێگایان بڕی و تووشی ڕووبارێك بوون ڕووبارەکە پردێکی تەسکی کۆن بوو توجارەکە ناچار بوو کە یەك یەك بیان باتە ئەو دیوی ڕووبارەکە یەکەم جار کوڕە بچووکەکەی پەڕاندەوە لە دەستی کەوتە خوارەوە بە ڕووباری دا ڕۆیشت تا باوکی گەڕایەوە کوڕەکەی تری گورگ بردی. پیاوەکە زۆر غەمبارو پەردەی خەمی بەسەردا پۆشی ژنەکەی و دوو کوڕەکەی لە دەست چوو بە ناچاری ڕێگای غەمباری گرتە بەر .**

**لە دوورەوە چاوی بە خەڵك کەوت کە کۆ بوبونەوە وە نزیك بوەوە پرسیاری لە پیاوێك کرد کە بۆچی ئەم خەڵکە کۆ بوونەتەوە ، ووتی پاشامان مردوە ئەمڕۆ پاشای نویٚ دەست نیشان دەکەین لە ناکاو بازێکیان هەڵدا ئاسمان بازەکە لەسەر شانی توجارەکە نیشت ، دیارە دەستوری ئەم شارە وابوو کە باز هەڵدەن و لەسەر کیٚ نیشت ئەو دەبێتە پاشای ئەم شارە بازەکە لەسەر شانی توجارەکە نیشت خەڵکەکە تەماشای توجارەکەیان کرد و کە پیاوێکی جل و بەرگی پیس و ماندوو دیار بوو باوەڕیان نەهێنا بۆ جاری دووەم بازەکەیان هەڵدا ئاسمان، دوو بارە بە هەمان شێوە لەسەر شانی نیشت**

و جاری سێیەم بە هەمان شێوە ئینجا کردیان بە پاشای شار ، وە پاشایەکی زۆر عادل و یەکسان بوو لە نێو خەڵك دا بەباش باس دەکرا .

ئا بەم شێوەیە چەند ساڵێك بەردەوام بوو لەسەر فەرمان ڕەوایی ڕۆژێکیان توجارەکە کە ژنی توجارەکەی فڕاندبوو چوە لای پاشاکە داوای دوو پۆلیسی لێ کرد بۆ پاسەوانی ژنەکەی و بۆ گەشت دەچێت تا دەگەڕێتەوە . پاشاش دوو پاسەوانی نارد ، پاسەوانەکان لە بەردەم ڕەشماڵ ئاگریان کردەوە دانشت بوون باسی ژیانی یەکتریان دەکرد پاسەوانی یەکەم باسی خۆی کرد کە باوکی توجار بوو و دایکیان بردووە لەو کاتەی باوکم ویستویەتی لە پردەکە دەربازم بکات کەوتمە ناو ئاو، بەلاّم لە خوا بەزیاد بێت ڕاوچیەك منی ڕزگار کرد. پاسەوانی دووەم دەستی کرد بە گریان و وتی تۆی برای منی و ئەویش باسی خۆی بۆ کرد وتی لەو کاتەی کە باوکم تۆ ڕزگار دەکرد گورگ منی برد بەلاّم پیاوێك داری دەبڕی منی لە گورگەکە سەندەوە و دەستیان لە ملی یەکتری کرد و ژنەکەش لە ناو ڕەشماڵەکە گوێی لە قسەیان گرت بوو یەکسەر لە پرمەی گریانی داو پێی ووتن ئێوە کوڕی منن و ئەمشەوە لە نێو ناز و سۆزی دایکیان خەویان لێ کەوت بەیانی کە پاشا گەڕایەوە چاوی بە ژنەکەی کەوت و یەکسەر چووە لای پاشا و دیمەنەکەی بۆ پاشای گێڕایەوە و پاشا ناردیە دوای پاسەوانەکان و ژنەکەش هات ، دوو پاسەوانەکە باسی ڕووداوی خۆیان کرد و ووتیان ئەمەش دایکمانە پاشا دەستی بە گریان کرد و ووتی ئێوە خێزانی منن دەك نەفرەت لە ڕۆژگاری بەد بەخت و بە ڕوو سۆری ژنەکە و دوو کوڕەکە لە ئامێزی گرتەوە ، پاشا فرمانی لە سێدارەدانی توجارەکەی دا ئەمانیش بەشادی و خۆشی ژیانیان بەسەر برد .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: نیشتنەوەی بازە لەسەرشانی توجاڕ.**

## ئۆف

**کۆکردنەوەی : گەلاوێژ حوسێن**
**گێڕانەوەی : بەهــرام عەولاّ**

هەبوو نەبوو، توجارەك هەبوو سێ کچی هەبوو، باوکیان پێش ئەوەی بڕوات بۆ گەشتەکەی داوای لە کچەکانی کرد کە چیان بۆ بهێنێ. هەر یەك داوای خۆی هەبوو، کچە بچوکەکەی داوای کراسێکی جوانی کرد لە باوکی، بەلاّم کچەکە بە باوکی ووت ئەگەر داواکەی منت لەبیر کرد ئەوا ئینشائەڵلاّ کەشتیەکەت بسوتێ. باوکی بەڕێ کەوت چەند ڕۆژێکی پێ چوو سواری کەشتی بوو بەڕێ کەوتن لە نیوەی دەریا بوون باوکی بەبیری هاتەوە کە شتێك سوتا باوکی یەکسەر ووتی ئۆف ئەو خوای کچەکەم کەشتیەکە سوتا .

هەر لەگەڵ دەرچوونی ووشەی (ئۆف) پیاوێك بە دیار کەوت و وتی من (ئوف)م هەر داوایەکت هەیە من بۆت جێ بەجێ بکەم، وتی من کچە بچوکەکەم داوای کراسێکی زۆر جوانی کردیە، بەلاّم من لەبیرم چوو و (ئۆف)یش ووتی داواکەت سەرچاوم گەورەم بەلاّم دەبێ کچەکەت بدەیە من باوکی ووتی باشە. باوکی گەڕایەوە و کچەکان زۆر دڵخۆش بوون و بە تایبەتی کچە بچوکەکەی زۆر دڵخۆش بو بە دیتنی کراسەکەی، بەلاّم باوکی هەندێك خەمناك بوو کچەکە بە باوکی ووت کە چی ڕوویداوە؟ باوکی ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە و پێی ووت دەبێ لەگەڵ (ئۆف)ی بڕۆی و کچەکەش ڕازی بوو بە مەرجەکەی و لەگەڵ (ئۆف)ی ڕۆیشت (7)چیاو حەوت شار و حەوت دارستانیان بڕی تا گەیشتنە کۆشکێك کە زۆر خۆش و دڵکراوە بوو دار و گوڵی وای لێ چاندرابوو کە جێی سەر سوڕمانی کچەکەی بوو .

ئینجا چوونە ناو کۆشکەکە کە هیچ شتێك وەسفی ناو کۆشکەکەی بۆ ناکرێت، ئینجا ئۆف بردیە ژورێك قاوەیەکی بۆ هێناو خواردیەوە یەکسەر نوست ئینجا بەیانی لەخەو هەڵسا خواردنی خوارد دیسان بە هەمان شێوە

قاوەیان بۆ هێنا یەکسەر خەوی لێ کەوت. بەم شێوەیە چەند ڕۆژێك ئەم کچە ڕۆژەکانی بەسەر برد. بەڵام ڕۆژێکیان کچەکە قاوەکەی نەخواردەوە و بینی کوڕێکی زۆر جوان لە تەنیشتی درێژ بووە کچەکە بە دیتنی زۆر پێی سەیر بوو و (ئۆف)یش نەبوو بەڵکو شازادە بوو. بەڵام سکی کوڕەکە (کلیل)ی پێوە بوو کچەکە کلیلەکەی کردەوە یەکسەر چوە ناو سکی کە شار بوو چەندەها دوکان و مرۆڤی تێدا بوو. دوکانەکان شتی زۆر جوانی هەبوو کچەکە دەیپرسی کە بکڕێت بەڵام خاوەنەکانیان دەیانگوت چەند ڕۆژێکە بۆ کوڕی پاشا شت دروست دەکەین نابیٚ شت بۆ کەس دروست بکەین .

هەر لەگەڵ بیستنی ئەم قسەیە کچەکە زانی کە سکی لە کوڕی پاشا هەیە یەکسەر لە سکی شازادە هاتە دەریٚ و لەکاتی کلیلەکەی داخست دەنگی لێوە هات و کوڕی پاشا لەخەو هەستا ووتی دەبیٚ تۆ بکوژن و داوای لە (ئۆف)ی کرد کە کچەکەی بباتە دارستان بیکوژێت و دوو پەرداخ خوێنی بۆ بهێنێتەوە . (ئۆف)یش کچەکەی بردە دارستان بەڵام دەستی نەچوو بیکوژێت و دوو کۆتری هێناو سەری بڕین خوێنەکەی بردەوە بۆ شازادە و کچەکەش لە دارستان بەڕیٚ کەوت و زۆر ماندوو بوو، خانویەکی دیت و لە دەرگای داو ژنەك دەرگای کردەوە و دێوێکی هەبوو بە چوونە ژوورەوە کچەکە دێوەکەی دیت هاواری کرد و ووتی بۆن دیٚ بۆنی بێگانان دێت و کچەکەیان دەرکردە دەرەوە .

کچەکە ڕۆیشت و ماوەیەك بەهەمان شێوە تووشی خانوێك بوو بە هەمان شێوە دێوی لێ بوو ، ناچار بوو ڕۆیشت ڕێگای گرتە بەرو تووشی خانوێکی تر بوو کە ژنێکی لیٚ بوو لە دەرگای داو زۆر بە ڕێزەوە پێشوازی لیٚ کرد و بردیە ژووریٚ و زۆر برسی و ماندوو دیار بوو ژنەکە خواردنی بۆ ئامادە کرد و ئیسراحەتی کرد و پێی ووت کە لێرە بمێنەوە تا منداڵت دەبێت کچەکە زۆر دڵخۆش بوو پاش ماوەیەك کچەکە منداڵی بوو .

کوڕێکی بوو کە زۆر جوان بوو، کوڕەکەش بە باوکی دەچوو کلیلی بە سکیەوە بوو هەر کە ژنەکە چاوی بە منداڵەکە کەوت یەکسەر بە کچەکەی ووت ئەمە هی برامە چونکە ئێمە سکمان بە کلیلە و خوشکی کوڕ پاشا ناردیە دوای برای و

**شازادە هات چاوی بە کچەکە کەوت زۆر دڵخۆش بوو. ڕووی کردە (ئۆف)ی ووتی بەخوا شتەکی چاکت کرد کە نەتکوشتوە و بەیەکەوە هاتنەوە کۆشکەکە و ڕۆژێکیان کچەکە بە شازادەی ووت کە بیری باوك و خوشکەکانی دەکات و شازادە پێی ووت کە یەك شەو لەلای ماڵی باوکت دەمێنیەوە .**

**شازادە و کچە توجارەکە بە شادومانی ژیانیان بەسەر برد .**

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: ـ ئۆف ـ و ـ سکی کلیلدارو دێوە.**

# کەس لە کاری خوا تێناگا ؟!

**کۆکردنەوە: گزنگ حەمە ڕەشید**
**گێڕانەوەی: بەهرام کەریم عەولا**

دەگێڕنەوە: کە توجارێك هەبوو، دوو منداڵ و ژنێکی هەبوو. توجارەکە بەدوای کار دەگەڕا پەنای بۆ شارێکی تر برد ، دوو کوڕەکە و ژنەکەی بەجێ هێشت دوای دوو سێ ڕۆژ توجارێکی تر هاتە ئەو شارە شت و مەکی هێنابوو چاوی بەژنەکە کەوت داوای لە پیاوەکانی کرد کە دەبێ ئەو ژنەی بۆ بێنن ، ژنەکەیان فڕاند و لەشارەکە نەمان دوو منداڵەکەش بەدەم گریان هیچی تریان چارە نەبوو ، کاتێك توجارەکە گەڕایەوە بینی کە ژنەکە نەماوە دوو منداڵەکەی بە تەنیا مابوونەوە ، پیاوەکەش بڕیاری دا کە ئەو شارە بەجێ بهێڵن ، لە ڕێگا دا تووشی پردێکی تەسك و باریك بوون کە ئاوێکی زۆر بە خوڕ دەڕۆیشت پیاوەکە بیری کردەوە کە دەبێ بە تەنیا منداڵەکان بپەڕێنێتەوە . یەکەم جار کوڕە بچوکەکەی برد لەناوەندی پردەکە لە دەستی بەر بوەوە و منداڵەکەی تری گورگ بردی و پیاوەکە بەبێ کەسی ڕێگای گرتە بەر و ڕێگایەکی زۆری بڕی ، بینی کە خەڵکێکی زۆر لە ناوچەکە کۆ ببوونەوە کە چوە ناو خەڵکەکە و پرسیاری کرد کەچی ڕووی داوە لە باسەکانیاندا کە پاشای شارەکە مردوە و دەستوری ناوچەکە وایە کە هەر پاشای شارەکە بمرێت ئەوا بازێك هەڵدەدەنە ئاسمانێ لەسەر شانی هەریەکێك بنیشێت دەبێتە پاشای شارەکە . ئینجا بازەکە لە ئاسمان سوڕا سوڕا لەسەر شانی پیاوەکە نیشت خەڵکەکە دەبینێت کە پیاوێکی شڕ و پیسە باوەڕیان نەکرد دیسان بۆ جاری دووەم بە هەمان شێوە و جاری سێیەم بە هەمان شێوە. ئینجا بڕیاریاندا کە دان بە پاشایەتی توجارەکە بنێن . توجارەکە فەرمانڕەوایی شارەکەی گرتە دەست ڕۆژگار سوڕا و چەند ساڵێك هات و ڕۆیشت توجارەکە کە ژنەکەی فڕاندبوو هاتنە ئەو شارەی کە مێردەکەی فەرمانڕەوایی دەکرد توجارەکە داوای لە پاشا کرد کە

دوو سەرباز بۆ پاراستنی ژنەکەی بکەن بۆ ئەوەی کە ڕۆیشت بۆ ئیش بۆ شارێکی تر ڕۆیشت بەڵام کەس لە ڕۆژگاری مرۆڤ تێناگات چی بەسەر دێت . لە هەمان کات دوو کوڕەکەی توجارەکە پاسەوانی باوکیانن ، پاشا دوو سەرباز دەنێرێت بۆ ئەوەی پاسەوانی ژنەکەی بکەن ، دوو پاسەوانەکە لە پێش ڕەشماڵەکەی دانیشت بوون لە دیار ئاگری دوو سەربازەکە بۆ بەسەر بردنی شەو باسی خۆیان دەکرد ، کوڕە بچووکەکە باسی خۆی دەکرد کە کاتی خۆی توجارێك دایکیانی فڕاندووە باوکی بۆ ئەوەی ڕزگاری بکات لە ڕوبار من کەوتمە خوارەوە. بەڵام، ڕاوچی ماسی منیان ڕزگار کردووە منیان بەخێو کردوە و بوومە سەربازی پاشا . کوڕە گەورەکە بە هەمان شێوە ڕووداوی دایکی گێڕایەوە و ووتی : کاتێ باوکم دەیویست برا بچوکەکەم بپەڕێنێتەوە گورگ منی برد بەڵام پیاوێك داربڕ بوو لە دارستان منی لە دەمی گورگ ڕزگار کرد ، دوو کوڕەکە دەستیان لە ملی یەکتری کرد و دەستیان کرد بە گریان وتیان ئێمە برای یەکترین .

ژنەکە گوێی لە باسەکە گرتبوو ئەویش لەناو ڕەشماڵەکە دەستی بە گریان کرد بە دوو پاسەوانەکەی وت: ئێوە کوڕی منن منیش دایکی ئێوەم پیاوەکەی کە منی فڕاندووە ئێستاکە بە ئیش ڕۆیشتووە بەیانی دەگەڕێتەوە ئەو شەوی هەردوو کوڕەکە لە باوەشی دایکیان نووستن باوەشی پڕ لە سۆز و خۆشەویستی دایکیان ، بەیانی کاتی خۆر هەڵاتن توجارەکە گەڕایەوە کە بینی ژنەکە لە نێوان دوو پاسەوانەکە نووستوە ، توجارەکە بە پەلە چووە لای پاشا بەسەر هاتەکەی گێڕایەوە و پاشا داوای لە دوو پاسەوانەکەی کرد پێش ئەوەی لە سێدارەیان بدا باسەکەی بۆ بگێڕنەوە ، دوو کوڕەکە بەسەرهاتەکەیان گێڕایەوە و پاشا دەستی بە گریان کرد و پێی ووتن : ئێوە کوڕی منن و ئەم ژنەش دایکی ئێوەیەو ژنی منە ، پاشا بڕیاری لە سێدارەدانی توجارەکەی دەرکرد و ژیانێکی پڕ لە سۆز و خۆشەویستیان بەسەر برد .

***حەکایەتێکە پشت بە ڕێکەوت و چارەنووس دەبەستێ.**

# پاشا سوڵتان موزەفەر

هەبوو نەبوو، کەس لەخوای گەورە تر نەبوو دەڵێن پاشایەك هەبوو لە شاری هەولێری ناوی سوڵتان موزەفەر بوو دەڵێ ساڵێکیان بەهار هات وەزیرێکی لەجێی خۆی دانا و بۆ کوێستان چوو وتی : هەوایەك بەدل دەکەم، دەڵێ بار و بارخانەی عەسکەری تەباخ و هەموو شتی خۆیان بردوو هەروەها وەزیر و پیاوی ئیختیار (پیاو ماقول) لە کوێستان لەو دۆڵ بۆ ئەو دۆڵ ڕۆیشتن گەیشتنە سەر حدود تەماشای کرد ڕەشماڵێك هەڵیداوە ڕەشماڵەکە حەوت ئەستوند بڵند بوو و دیتی پەنجا سوار دەهات پەنجا سوار دەڕۆیشتن سەرۆکی عوربانەکە کە پیاوێکی باش بوو ناوی مام خواجە بوو، پاشا وەزیری نارد وتی: بڕۆ بزانە ئەو پیاوە خانەدانە کێیە؟ تا بچین میوانی بین تا بزانین چ جۆرە پیاوێکە، دەڵێن چوون چاویان دایە عوربانەکە پاشا چووە ناو عوربانەکە و کەس نەیزانی پاشایە دوای بەگەرمی بەخێر هاتنیان کرد ڕێزیان لێنا پاشا بە پیاوەکانی وت: کەس بانگم نەکات بە پاشا، پیاوێك هات لەسەروی دیوەخان دانیشتبوو ئەمری کرد کە خواردن بێت یەك جۆر خواردن لەپێش هەموان دانرا بەبێ جیاوازی کە نانیان خوارد خوا حافیزیان کرد .

(شێخ)یش بە پاشای وت: چ خزمەتێکت نیە بۆت جێ بەجێ بکەین وتی: ناوەڵڵا ، وەزیر بە پاشای ووت : ئەو شێخە بۆیە وا دەوڵەمەند بوو قەت نانی بەکەمی نەخواردوە و یارمەتی خەڵکی داوە لە ڕێگای خودا ، بواری خۆیان کرد و گەڕانەوە شاری هەولێرێ ، پاش ئەوەی دە ساڵی بەسەر چوو ساڵێکیان بەفر و باران گەلێك زر بوو زستانێکی سەخت بوو ، ئەوەی مەڕ و ماڵات بوو هەموو مردو ڕۆیی ئەوەی ماوە و نەماوە تەنهیا (شتێکی کەم) ماوە لەگەڵ ماڵ و منداڵ بۆ ئەشکەوت ڕۆیشتن وای لێ هات ئەوان سواڵ بکەن ... مام خواجە ویستی بێتە شاری هەولێرێ بۆ سواڵ کردن بۆ ئەوەی شتێك پەیدا بکات بۆ ماڵ و منداڵی بباتەوە ، لەشاری هەولێرێ قاوەخانە بە قاوەخانە گەڕەك بە گەڕەك دەگەڕا ، پاشای شاری لەگەڵ وەزیرەکانی دەگەڕا ئەو ڕۆژە دیتیان عەینی پیاویان دیت مەبەستی (شێخ)کە بوو بەپاشا بە وەزیرەکانی

وت: ئەی ئەو پیاوە نەبوو کە دەوڵەمەند بوو میوان بووین لەلای؟ ووتیان: بەرێ وەڵلاً ، پاشا ئەمری کرد پاسەوانەکان بڕۆن بیهێنن بۆ جێیەکی پاك و خاوێن نانەکی گەرمی بدەنێ بزانن مەسەلە چییە ، ئەگەر نەهات ئەوا بە تۆبزی بیهێنن ، دوایی بیبەنە سەرتاشخانە سەری بتراشن و دوایی پێی بڵێن: بچین بۆ لای پاشا ، هێنایانە میوانخانەی نان و هەموو شتی خوارد و سەریان تاشی و قاتێکی نوێیان بۆ دانا ، کابرای شێخ ووتی : من ئەو قاتە لەبەرناکەم ئەگەر لەبەری بکەم کەس خێرم پیێ ناکات ، ووتیان ئەوە ئەمری پاشایە پاشا دێتە دیدەنیت ، کابرای شێخ وتی: هەبێ و نەبێ ئەو پاشایە ئیلا منی بە دەوڵەمەندی دیوە ، ئەوجا خەبەری پاشایان داو ووتیان : ئەوە سەرمان تاشی وە و پاك و خاوێنە ، پاشا وتی: نەوەك بەو حاڵەی کەپیس و پەڵۆخ بوو بی بینم زگی بەخۆی بسوتێ .

پاشا چوو بۆ لای تۆقەی لەگەڵ کرد ، پاش گفتوو گۆ قسە کردنێکی زۆر پاشا لێی پرسی: ئەوەی من تۆم دیتبێ تۆ پیاوێکی دەوڵەمەند بووی . بۆ وات لێ هاتووە ؟ سەر و سەربردەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە مام خواجە ووتی : دەبێ سبەی زوو بگەڕێمەوە شتەکیان بۆ ببەم تا نەمردوونە لە برسان ، پاشا وتی: سبەی ناچییەوە بەڵکو لێرە دەمێنیەوە تاکو حەفتەیەکی ئینجا شتت بۆ حازر دەکەم و پێکەوە دەڕۆین ، پاشا ئەمری لەسەر پیاوی خۆی کرد کە سێ سەد هێستری بکرن و زەخیرەی لێ بارکەن ، پاشی سێ ڕۆژان وتی: یەڵلاً مام خواجە خۆت حازر کەو بڕۆین ، دەڵێ ڕۆیشتن هەموو شتیان برد قۆناغ بە قۆناغ: ڕۆیشتن تا گەیشتنە کوێستانێ ، دەڵێ دیتیان ڕەشماڵێکی حەوت ستوون هەڵ دراوە عەینەن وەکی جاران پەنجا سوار دێ و پەنجا سوار دەڕوات پاشا ووتی : مام خواجە ئەوە هەروەك جارانە ، مام خواجە وتی: چ بڵێم ئەوە کاری خودایە کە من بەجێم هێشت ئەوها نەبوو ، دەڵێ چوونە ناو عوربانێ بە گەرم و گوڕی بەخێر هاتنی مام خواجەیان کرد و ناسیانەوە بە کەیف و خۆشی و دڵ گەرمی وە پاش نان خواردن و حەسانەوە ژنی مام خواجە خەبەری نارد کە دوایی بێن بۆ ماڵی مام خواجە ، دەڵێن چوون بۆ ماڵی مام خواجە ژنەکەی ئەمری کردە دوو پیاوان کە (کوپەزێڕ) هێنا لەناو دانیشتوان لەپێش پاشایان

داناو خڕەی لێوە خات ژنەکە وتی: پاشا لەوانەیە ئێستا تۆ بڵێی مام خواجە درۆی بکات کە بەتۆی وتوە: من لێم قەوماوە لەوانەیە بپرسی چۆن ئەو ماڵە ئەوهای لێ هاتووە ، ژنەکە وتی: پاش ئەوەی مام خواجە چوو بۆ شار بۆ سواڵ کردن و ئێمەی بەجێ هێشت لەناو ئەشکەوت ، من لەدوای ئەو هەستام دەسم کرد بە قوڕ شێلان بۆ ئەوەی تەندورەکی دروست بکەم نانی بکەم تاکو لەبرسان نەمرین هەر کە دەستم دایە خاکەناسی لە ئەرزم چەقاند خاکەناس لە شتێك گیر بوو منیش سەرم هەڵدایەوە دیتم کوپەڵەیەکی گەورەی لێ بوو پڕ بوو لەزێڕ منیش هەستام پیاوم نارد و دەستم کرد بە شت کڕین مەڕ و ماڵاتم کڕی و عوربانمان دامەزراندەوە ، ئەوەیە بەسەر هاتی ئێمە پاشا پاش ئەوەی ماوەیەك لەلایان مایەوە دوایی هاتەوە بۆ شاری هەولێر .

***ئەم حەکایەتە باس لەچاوتێری و نیەت پاکی دەکات.**

# مریشکە قوڵە

**کۆکردنەوە: گولاڵە توفیق عەباس**

**هەبوو نەبوو، مریشکە قوڵەیەك هەبوو ڕۆژێك مریشکە قوڵە چاوی ڕشت و جوتێ کەوشی لەپێ کرد و چارۆکەیەك پیازی لەکۆڵ بەست و عەبایەکی بەخۆی داداو ڕۆیشت لە ڕێگا تووشی جوتیارێ بوو.**

**ـ جوتیارەکە ووتی:**

**مریشکە قوڵە بۆ کوێ دەچی ؟**

**ـ مریشکە قوڵە ووتی: دەرد و سندانی مریشکە قوڵەی .**

**ـ جوتیارەکە ووتی:**

**ئەی پێت بڵێم چی ؟**

**ـ مریشکە قوڵە ووتی: پێم بڵێ:**

**نازێ نازێ چارۆکە پیازێ**

**بۆ کوێ دەچی بە تەقە تەقی کەوشان**

**سۆلی بنە و شان بەرەی چاو ڕەشان**

**جوتیارەکەش ووتی :**

**نازێ نازێ چارۆکە پیازێ**

**بۆ کوێ دەچی بە تەقە تەقی کەوشان**

**سۆلی بنە و شان بەرەی چاو ڕەشان**

**ـ مریشکە قوڵە ووتی:**

**دەچم بۆ شاری شوو کردن .**

**ـ جوتیارەکە وتی:**

**شوو بە من ناکەی ؟**

**ـ مریشکە قوڵە وتی:**

**بەچی بەخێوم دەکەی ؟**

ـ جوتیارەکە وتی: بە گەنمە سورەی سەر خەرمانی .

ـ مریشکە قوڵە وتی: ئەی بەچی لێم دەدەی ؟

جوتیارەکە وتی :

بەم نەقیزەی دەستم .

ـ مریشکە قوڵە وتی: شووت پیێ ناکەم .

مریشکە قوڵە جوتیارەکەی بەجیێ هێشت و ڕۆیشت گەیشتە شوانێکی , ـ

شوانەکە وتی: مریشکە قوڵە بۆ کویێ دەچی ؟

ـ مریشکە قوڵە وتی:

دەرد و سندانی مریشکە قوڵەی .

شوانەکە وتی: ئەی پێت بڵێم چی ؟

ـ مریشکە قوڵە وتی: پێم بڵیێ:

نازیێ نازیێ چارۆکە پیازیێ

بۆ کویێ دەچی بە تەقە تەقی کەوشان

سۆلی بنە و شان بەرەی چاو ڕەشان

ـ شوانەکە وتی:

نازیێ نازیێ چارۆکە پیازیێ

بۆ کویێ دەچی بە تەقە تەقی کەوشان

سۆلی بنە و شان بەرەی چاو ڕەشان

ـ مریشکە قوڵە وتی:

دەچم بۆ شاری شوو کردن .

شوانەکە ووتی : شوو بەمن ناکەی ؟

مریشکە قوڵە ووتی :

بەچی بەخێوم دەکەی ؟

ـ شوانەکە وتی: بە نانە ڕەقی شوانی .

ـ مریشکە قوڵە وتی : ئەی بەچی لێم دەدەی ؟

ـ شوانەکە وتی:

بەم گۆچانەی دەستم .

مریشکە قوڵە وتی ـ:
شووت پیٚ ناکەم .
مریشکە قوڵە شوانەکەی بەجیٚ هیٚشت و ڕۆیشت گەیشتە لای مشکیٚك . ـ
مشکەکە وتی:
مریشکە قوڵە بۆ کویٚ دەچی ؟
ـ مریشکە قوڵە وتی: دەرد و سندانی مریشکە قوڵەی .
ـ مشکەکە وتی: ئەی پیٚت بڵیٚم چی ؟
ـ مریشکە قوڵە وتی : پیٚم بڵیٚ:
نازیٚ نازیٚ چارۆکە پیازیٚ
بۆ کویٚ دەچی بە تەقە تەقی کەوشان
سۆلی بنە و شان بەرەی چاو ڕەشان
ـ مشکەکەش وتی:
نازیٚ نازیٚ چارۆکە پیازیٚ
بۆ کویٚ دەچی بە تەقە تەقی کەوشان
سۆلی بنە و شان بەرەی چاو ڕەشان
ـ مریشکە قوڵە وتی:
دەچم بۆ شاری شوو کردن .
ـ مشکەکە وتی: ئەی شوو بەمن ناکەی ؟
ـ مریشکە قوڵە وتی: بەچی بەخیٚوم دەکەی ؟
ـ مشکەکە وتی:
بە دەنکە گەنمی پەنا کەندوان .
ـ مریشکە قوڵە وتی: ئەی بەچی لیٚم دەدەی ؟
ـ مشکەکە وتی: بە کلکی خۆم لیٚت دەدەم .
ـ مریشکە قوڵە وتی: شووت پیٚ دەکەم .
مریشکە قوڵە شووی بە مشکەکە کرد و پاشان مریشکە قوڵە و مشکەکە چونە ماڵەوە . ئیتر لەو ڕۆژەوە مشکەکە بە مریشکە قوڵەی دەوت نازیٚ .

دوای دوو ڕۆژ مشکەکە ڕبەیەك گەنم دەبات و دەچێتە ئاشی , نازێ دەڵێ مشکەکە چۆتە ئاشی هەتا دێتەوە با چێشتی نۆکی بۆ لێ بنێم .
نازێ نۆکەکە دەکاتە ناو مەنجەڵێکەوە و دەیخاتە سەر ئاگر . پاش کەمێك نازێ دەچێ کەوچك بهێنێ چێشتەکەی پێ تێك وەربدات بەڵام کەوچك نادۆزێتەوە دەڵێ:
دەنوکی خۆم خۆش بێ کەوچکم بۆ چییە، کاتێك سەری مەنجەڵەکە هەڵدەداتەوە نازێ دەکەوێتە ناو مەنجەڵەکە. وەخێك مشکەکە لە ئاشی دەگەڕێتەوە ئەم لا دەکا نازێ نییە ئەولا دەکا نازێ نییە پرسیار لە دراوسێکانی دەکا دەڵێ نازێتان نەدیووە ئەوانیش دەڵێن نامان بینیوە. مشکەکە دەڵێ هەتا نازێ دێتەوە با من بچم نانی خۆم بخۆم . مشکەکە سەری مەنجەڵەکە هەڵدەداتەوە دەبینێ نازێ وا لەناو مەنجەڵەکەدا کوڵاوە و پەل پەل بووە .
مشکەکە مەنجەلەکە هەڵدەگرێ و دەیبا لەسەر زبڵدان هەڵی دەڕێژێ و دەست دەکات بە گریان و هێندە زبڵ بەخۆیدا دەکا هەتا سەری دەشکێ , زبڵدانیش لەتاو نازێ لایەکی ئاگری تێ بەرئەبێ و ئەسووتێ .
قەلێك دێت لەولاوە دەڵێت : زبڵدان بۆ وا سوتاوی زبڵدان دەڵێ : زبڵدان لا سوتاو
مشکەی سەر شکاو
نازێی پەل پەل کراو
پاشان قەلەکە پەك پەڕ چییە بەخۆیەوە ناهێڵێ و دەچێتە سەر دارێك , دارەکە دەڵێ :
قەلە بۆ وا پەڕت پێوە نەماوە ؟ قەلەکەش دەڵێ :
قەلەی هەڵاشە
زبڵدان لا سوتاو
مشکەی سەر شکاو
نازێ پەل پەل کراو
پاشان دارەکەش یەك گەڵای بەخۆیەوە ناهێڵێ .

**جۆگایەك دێت و دەڵێ :**

**دارە بۆ گەڵات پێوە نەماوە ؟ دارەش دەڵێ :**

**دارەی ڕووت و قووت**

**قەلەی هەڵاشە**

**زبڵدان لا سووتاو**

**مشكەی سەر شكاو**

**نازێی پەل پەل كراو**

**جۆگاكەش خۆی لێڵ و وێڵ دەكا**

**باخەوانێك دێت دەڵێ : جۆگا بۆ وا لێڵ و وێڵی ؟**

**جۆگاكەش دەڵێ :**

**جۆگای لێڵ و وێڵ**

**دارەی ڕووت و قووت**

**قەلەی هەڵاشە**

**زبڵدان لا سووتاو**

**مشكەی سەر شكاو**

**نازێی پەل پەل كراو**

**پاشان باخەوانەكە بێڵێك بەشانی خۆیدا دەدا و شانی خۆی دەشكێنێ .**

**پاشان كچی باخەوانەكە دێت و جامێ ماستی پێیە دەڵێ :**

**باوكە بۆچی شانت شكاوە ؟ باوكی كچەكەش دەڵێ :**

**باوكەی شان شكاو**

**جۆگای لێڵ و وێڵ**

**دارەی ڕووت و قووت**

**قەلەی هەڵاشە**

**زبڵدان لا سووتاو**

**مشكەی سەر شكاو**

**نازێی پەل پەل كراو**

**کچەکەش جامە ماستەکەی بە سەری خۆیدا دەکا و دەچێتەوە بۆماڵەوە دایکی کچەکە نان دەکات بەساج دەڵێ : کچم بۆ وات بەسەر هاتووە , کچەکە دەڵێ :**

**کچەی سەر بە ماست**

**باوکەی شان شکاو**

**جۆگای لێڵ و وێڵ**

**دارەی ڕووت و قووت**

**قەلەی هەڵاشە**

**زبڵدان لا سووتاو**

**مشکەی سەر شکاو**

**نازێی پەل پەل کراو**

**دایکی کچەکەش دەستی خۆی بەساجەکە دەسوتێنێ و بۆنی دەڕوا بۆ دەوروبەری , کلاش چنێك دێت لەولاوە سوژنی پێیە دەڵێ : ئەو بۆنە چییە؟**

**دایکی کچەکەش دەڵێ :**

**دایکی دەست سوتاو**

**کچەی سەر بە ماست**

**باوکەی سەر شکاو**

**جۆگای لێڵ و وێڵ**

**دارەی ڕووت و قووت**

**قەلەی هەڵاشە**

**زبڵدان لا سووتاو**

**مشکەی سەر شکاو**

**نازێی پەل پەل کراو**

**کلاش چنەکەش سوژنێك بە چاوی خۆیدا دەکا و چاوێکی خۆی کوێر دەکات.**

**ئەمانە هەموویان شین بۆ نازێ دەکەن کە پەل پەل بووە لەناو مەنجەڵەکەدا .**

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: قسەکردنی مریشك و قەڵ و زبڵدان.**

# پیرێژنی شیر خوراو

هەبوو نەبوو، پیرێژنێك هەبوو، هەموو ڕۆژێك شیری هەوێن دەکرد و شیرەکەی دەخورا بەڵام نەیدەزانی کێ شیرەکەی دەخوا ڕۆژێك پیرێژن تەورداسێکی بچوك تیژ دەکات و خۆی لە پەنا دەرگا مات دەکات . پیرێژن دەبینێ ڕێویەکە کە هەموو ڕۆژێك دێت شیرەکەی دەخوات .

کاتێك ڕێویەکە دەمی دەخاتە ناو مەنجەڵە شیرەکە پیرێژنیش بە تەورداسەکە کلکی ڕێویەکە دەقرتێنێ . ڕێوی زۆر لەبەر پیرێژن دەپاڕێتەوە و دەڵێ :

توخودا کلکم بدەرەوە با بێ کلك نەبم لەناو هاوڕێکانم . پیرێژن دەڵێ : کلکت نادەمەوە هەتا نەچی شیرەکەم بۆ نەهێنیتەوە . ڕێویش دەچێ بۆ لای بزن دەڵێ :

بزن شیر بدە بە داپیرە

داپیرەش کلکە قوڵەم وێدە

بزنیش دەڵێ :

بڕۆ گەڵام بۆ بێنە منیش شیرت دەدەمێ . ڕێویەکەش دەچێ بۆ لای دار و پێی دەڵێ :

دار گەڵا بدا بە بزن

بزن شیر بدا بە داپیرە

داپیرەش کلکە قوڵەم وێدە .

دارەکەش دەڵێ :

بڕۆ ئاوم بۆ بهێنە منیش گەڵات دەدەمێ .

ڕێویەکەش دەچێ بۆ لای کانی و پێی دەڵێ :

کانی ئاو بدا بە دار

دار گەڵا بدا بە بزن

بزن شیر بدا بە داپیرە

داپیرەش کلکە قوڵەم وێدە .

کانیش دەڵێ : بڕۆ کچان بهێنە بۆ سەر کانی و لەسەر کانی چۆپێ ببەستن منیش ئاوت دەدەمێ بیبەی بۆ دار . ڕێویەکەش دەچێ بۆ لای کچان و :

کچان لەسەر کانی چۆخێ ببەستن
کانی ئاو بدا بە دار
دار گەڵا بدا بە بزن
بزن شیر بدا بە داپیرە
داپیرەش کلکە قوڵەم وێدە .

کچانیش دەڵێن : بڕۆ کەوشمان بۆ بهێنە ئێمەش دێین لەسەر کانی چۆپێ دەبەستین . ڕێویەکەش دەچێ بۆ لای وەستا دەڵێ :

وەستا کەوش دروست بکە بۆ کچان
کچان لەسەر کانی چۆپێ ببەستن
کانی ئاو بدا بە دار
دار گەڵا بدا بە بزن
بزن شیر بدا بە داپیرە
داپیرەش کلکە قوڵەم وێدە .

وەستاش دەڵێ : بڕۆ هێلکەم بۆ بهێنە منیش کەوش بۆ کچان دروست دەکەم .
ڕێویەکەش دەچێ بۆ لای مریشك و پێی دەڵێ :

مریشك هێلکە بکە بۆ وەستا
وەستا کەوش دروست بکات بۆ کچان
کچان وەرن لەسەر کانی چۆپێ ببەستن
کانی ئاو بدا بە دار
دار گەڵا بدا بە بزن
بزن شیر بدا بە داپیرە
داپیرەش کلکە قوڵەم وێدە .

مریشکیش دەڵێ : بڕۆ گەنمم بۆ بهێنە منیش هێلکەت دەدەمێ . ڕێویەکەش دەچێ بۆ لای جوتیار بۆ سەر خەرمان دەڵێ :

جوتیار گەنم بدە بە مریشك

مریشك هێلكە بكات بۆ وەستا

وەستا كەوش دروست بكات بۆ كچان

كچان وەرن لەسەر كانی چۆپیێ ببەستن

كانی ئاو بدا بە دار

دار گەلاٌ بدا بە بزن

بزن شیر بدا بە داپیرە

داپیرەش كلكە قوڵەم وێدە .

جوتیارەكەش دەڵیٚ : وەرە خەرمانم لەگەڵ سور بكە منیش گەنمت دەدەمیٚ .

ڕێویەكەش خەرمانی لەگەڵ جوتیارەكە سور دەكا و جوتیارەكەش گەنم دەدات بە ڕێوی .

ڕێویش گەنم دەدا بۆ مریشك , مریشكیش هێلكە دەدا بۆ وەستا , وەستاش كەوش بۆ كچان دروست دەكا , كچانیش لەسەر كانی چۆپیێ دەبەستن , كانیش ئاو دەدا بە دار , داریش گەلاٌ دەدا بە بزن , بزیش شیر دەدا بە داپیرە , داپیرەش بە قیڕ و بنێشت كلكەكەی بۆ پێوە دەنێتەوە .

پاشان دەڕوات و دەچێتەوە بۆ ناو هاوڕێكانی , هاوڕێكانی دەڵێن بڕۆ بۆن قیڕت لیٚ دیٚ .

ڕێویەكەش زۆر بەخۆی دا دەشكێتەوە . دەڕوا و دەچێتە سەر ڕێگەیەك دەبینیٚ بوكێك دێت بە ڕێگادا , ڕێویەكەش خۆی دەمرێنیٚ جەماعەتی گەڵ بوكیٚ هەڵی دەگرنەوە .

ڕێویەكەش پاش كەمێك لە ڕۆیشتن جلی بوكیٚ دەدزیٚ و خۆی فڕیٚ دەداتە خوارەوە , جلەكانی لەبەر دەكات و دەچێتەوە بۆ ناو هاوڕێكانی , هاوڕێكانیشی دەڵێن :

ئەو جلە جوانانەت لەكویٚ هێناوە . ڕێویەكەش دەڵیٚ : لەناو بیرێك دەرم هێناون , ئەوانیش دەڵێن : پیشانمان نادەی دەڵیٚ : با پیشانتان دەدەم .

ڕێویەكەش هاوڕێكانی دەبات بۆ سەر بیرەكە , كە ڕێویەكە لەسەر بیرەكە ڕادەوەستیٚ وێنەی ڕێویەكە لە ئاوی بیرەكە دەردەچێت , ئەوانیش لەخۆشی

**جلی جوان یەك یەك خۆیان دەخەنە ناو بیرەکە , یەکەمیان کەخۆی فڕێ دەدات , کاتێك دەخنکێ قوڵپە قوڵپی دێ هاوڕێکانی تری دەڵێن ئەوە دەڵێ چی ؟**
**ڕێویەکەش دەڵێ :**
**ئەوە دەڵێ : جلی جوانی زۆر لێیە ئێوەش وەرن . بەم جۆرە هەموو هاوڕێکانی بە خنکاندن دەدا ڕێویەکەش خۆی دەمێنێتەوە .**

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: قسەکردنی مریشك و مشك و قەل و کانی و بە مرۆڤ بوونی شتەکانە.**

# کلکی ڕێوی

**کۆکردنەوە: مەحەمد فوئاد شەریف**

**گێڕانەوەی: ئەحمەد قادر عـــەلی**

هەبوو نەبوو، پیرێژنێکی فەقیر هەبوو، بزنۆکەیەکی هەبوو، هەموو ڕۆژێك ئەیدۆشیێ بەڵام گەلەك جار شیرەکەی لێ ئەخورا هێندەی ئەکرد نەیئەزانی ئەوە کێیە لێی ئەخوا جارەك فکری کردەوە چوو کۆتکە دارەك و تەور داسەکی هێنا شیریشی هێنا لە پشت سەری خۆی داناو مام ڕێوی هات لەسەر خۆ شیری بخوات و کلکی کەتە سەر کۆلکی پیرێژنیش لەسەرەخۆ تەورداسی لە کلکی دا قوتی کرد مام ڕێوی ڕۆیی چوو بۆ ناو ڕێویان مام ڕێویان تەماشا کرد ووتیان مام ڕێوی قرتۆ قرتۆ بڕۆ شەرمم بەتۆ مام ڕێویش چووە لای داپیرەی گۆتی داپیرە کلکم وێوەدە داپیرەش وەگۆ هەروو شیرم بۆ بێنەوە ئەوجا کلکت وێ دەدەمەوە مام ڕێویش چووە کن بزنێ وەی گۆ شیرم بدێ بۆ داپیرێ تا کلکم پیێ بداتەوە بزنیش پێی وت بڕۆ گیام بۆ بێنە ئەوجا شیرت دەدەمێ، مام ڕێوی چووە کن گیا پێی گۆت: گیا شین بە تا بزن بێت بتخوات تا شیری بدات. گیا پێی گوت: هەرو ئاوم لەکانی بۆ بێنە ئەوجا شین دەبم مام ڕێوی چوە کن کانی وتی: ئاوم بدێ بۆ گیا تا شین بێ. کانی پێی وت: بڕۆ هەندەك کیژ و کاڵم بۆ بێنە سەرێ هەندەك شایم لەسەر بکەن ئەوجا ئاوت دەدەمێ مام ڕێوی چوە کن کیژو کاڵان وتی: وەرن شایی بکەن لەسەر کانی تا ئاوم بداتێ. کیژ و کاڵان وتیان: سۆلن ئادڕا هەروو سۆلانن بۆ چابکەوە ئەوجا دێین مام ڕێوی چوە کن پینە دۆزی تا سۆران چا بکاتەوە پینە دۆزیش وەی گۆ: هەروو هێلکەم بۆ بێنە ئەوجا سۆلانت بۆ چا ئەکەمەوە مام ڕێوی چوە کن مریشك پێی وت: هەروو هەندەك دانم بۆ بێنە ئەوجا هێلکەت دەدەمێ. مام ڕێوی چوە کن جوتیارێ پێی وت: هەندەك دانم بدێ جوتیاری هەندەك گەنمی دامێ. ئەوجا مام ڕێوی دان بۆ مریشکی هێناو مریشك هێلکەی دا مام ڕێوی و مام ڕێوی

هێلکەی بۆ پینەدۆزی برد و پینەدۆز سۆلانی بۆ مام ڕێوی چاك کرد و مام ڕێوی سۆلی بۆ کیژ و کالان برد، ئەوجا کیژ و کالٚ هاتن شاییان کرد لەسەر کانی، ئەوجا کانی ئاوی دا مام ڕێوی ئاوی بۆ گیا برد تا شین بیٚ، ئەوجا بزن هات گیای خوارد و شیری دا مام ڕێوی ئەوجا مام ڕێوی شیری بۆ داپیرەی هێنا، ئەوجا داپیرەی کلك وە مام ڕێوی داوە و زەنگوڵەی وەسەری کلکی، ئەوجا مام ڕێوی چوە کن مام ڕێویەکانی تر و پێیان وت ئەوە چییە مام ڕێوی ئەو زەنگۆڵە مام ڕێوی وتی: وەرن ئەمن ئەو زەنگۆڵەم لەناو ئەو کانیەی هێناوە مام ڕێوی هەموو هاتن بۆ سەر کانی و وتیان: ئەوجا چ بکەین؟ مام ڕێوی وتی خۆ هەر دەن لەناو ئەو کانییە دایە یەکێك خۆی فڕێدا ناو کانی یەکە دەستی بە قوڵپە قوڵپی کرد و وتیان: ئەوە چییە وتی: ئاوەرن هەمووتان خۆتان فڕیٚ دەنە ناو کانیەکەو هەموویان خۆیان فڕیٚ دان خنکان بەم شێوەیە مام ڕێوی هەموویانی خنکاند.

***ئەمەش چیرۆکی گیاندارانە و لەگەڵ حەکایەتی پشیلە قوتە یەك چیرۆکن بەڵام، لەویٚ ـ یەکمجارە من ببێنم ـ پشیلە کلکی قوت ببیٚ، کەچی لێرە ڕێوی یە.**

# ڕێوی

هەبوو نەبوو، مام گورگ و مام ورچ و ڕێویەك هەبوون، مام گورگ و مام ورچ لەمێژ بوو یەکتریان نەدیت بوو، ڕۆژێك لە ڕۆژان مام ورچ وەگۆ ئەوڕۆ سەرەکی لە مام گورگ ئەدەم. مام ورچ وەڕێ کەوت بۆ کن مام گورگ، لەڕێ بەیەك گەیشتن مام گورگ و ورچ چاك وخۆشیەکی گەرمیان لەیەك کرد هەنگینیێ مام گورگ وەگۆ : مام ورچ ئەوە کێوە دەچی؟ مام ورچیش وەگۆ: وەڵا ئەوە بەتەمابوم بێمە کنە تۆ. مام گورگ ئەویش ئەتوی لێرە دیتی مام گورگیش وەگۆ: ئێواریێ دەعوەتت دەکەم دوو مریشکم سۆر کردینەوە ڕێویش خۆ مات کردبوو گوێی لەو قسانە بوو کە مام ورچ و مام گورگ باسیان دەکرد، مام ورچ وەگۆ سەرەکی بچمەوە ماڵێ ئەوجا هەنگینیێ دێمەوە، ڕێوی فێڵبازیش خۆی گەیاندە ماڵی مام گورگ ، مریشکی لەنێو مەنجەڵێ دەرهێنا دەریێ و بردی و چوو لەدەریێ خواردی هەنگینێش چۆوە سەر ڕێی مام ورچی کە وەڕێ کەوتبوو بۆ ماڵی مام گورگ ئەچوو هەندەك هەنگوینیشی پێ بوو ڕێویش بە هاوار هاوار هاتە سەر ڕێی و گوێی خۆی گرتبوو هەر وەی گۆ ئەی گوییە ئەویش مام ورچ وەی گۆ ها ئەوە چییە ڕێویش لێی پۆشی و هەنگوینی لێ وەرگرت وەی گۆ چ تازە لەمنە پێچیەوە مام گورگ ئەمنی دەعوەت کردبوو ئەویش کە چووم یەکسەر غاری دامێ بە چەقۆی هەتا گوێم ببڕی ئەمنیش بە سەد حاڵ هەتا خۆم لەبەر دەستان هێنا دەریێ، ئەوجا ئەتوش مەچۆ با گوێت نەبڕی مام ورچیش پێی باوەڕ کرد و وەی گۆ: چۆن گوێم ئەبڕی ئەمن دەزانم چی لێ دەکەم .

ڕۆژێك نایەنم هەنگینیێ مام ورچ گەڕایەوە ماڵێ و خۆی و ڕێویش دەستی بە هەنگوین خواردن کرد وەی گۆ هەنگوینیش لەدوو گۆشتی چەند زەریفە . هەنگینێش چۆ ماڵی مام گورگ وەی گۆ مام گورگ وا مریشکی ئەبوو لێ نابوون تازە و مام ورچی بون و بردنی ئەویش وەی گۆ ڕێوی یان گەمان یا گاڵتەم پێ ئەکەی مام ورچم ئەوا دەعوەت کردیە کو دێ مریشکان ببا ڕێویش وەی گۆ ئەگەر پێم باوەڕ ناکەی بۆ خۆت تەماشای مەنجەڵێ بکە داخوا چ

مریشکی تێدا مای مام گورگیش بڵند بوو هەستا چوو تەماشای مەنجەڵی کرد چی تێدا نەمابوو، وەی گۆ ڕێوی ئەوا بەڕاستیش وەڵا چی تێدا نەمایە ئەدی کێوە چوو، ئەوا دزە داخوا چی لێ ئەکەم وەی گۆ چ تازە ڕۆییە و بەو نەوعەی ڕێوی بەینی مام گورگ و مام ورچی تێکدا .

*ئەم حەکایەتەش چیرۆکی گیاندارانە.

# ئەحلام

**کۆکردنەوە: مەلا ئەحمەد حاجی سعد**

چیرۆکەکە لێرەوە دەست پێ دەکات، کە ماڵی کاك ئەحمەد لەلایەکی دوور لەشار بوو کە فەقیر و دەست کورت بوو، ناچار بو واز لە لادێی خۆی بینی و بچێتە شار، لەوێ نیشتەجێ ببێت . کاك ئەحمەد لەشار مایەوە ئەویش تەنیا کچێکی هەبوو ناوی ئەحلام بوو ، هەر لەم شارە کاك ئەحمەد کچی خۆی ناردە قوتابخانە کە فێری خوێندن و نوسین ببێ . پاش خوێندنی سەرەتایی قۆناغەکانی تریشی بڕی دایکی مرد و کە دوای چەند ساڵێك باوکیشی بە نەخۆشی مرد و بو بە قوتابی لە کۆلیژی پزیشکی لەوێ حەزی لە کوڕێکی هاو پۆلی کرد، کە ناوی بەهمەن بو هەردوکیان یەکتریان خۆش دەویست .

کە خوێندنی ئەحلام تەواو بوو ناچار بو کە بگەڕێتەوە بۆ لادێ لای کەس و کاری و بە بەهمەن ڕای گەیاند کە دەگەڕێتەوە بەهمەنیش پێی گوت : کە من بە دوایی تۆ دادیم و لەکەس و کارت خوازبینیت دەکەم . بەلآم مامی بەهمەن پێی گوت : نابی ئەم ئیشە بکەی چونکە کەس و کاری ئەحلام زۆر بە توندی داب و نەریتی خۆیان پاراستووە و ڕێگات نادەن کە داخوازی کچیان بکەی بەلآم بەهمەن کە ئەحلامی زۆر خۆش دەویست گوێی پێ نەدا .

بەپێی داب و نەریتی عەشایری ئەوان دەبوایە کچ بۆ ئامۆزای خۆی بێ ئەحلام بە بەهمەنی گوتبوو کە بۆ لای کەس و کارم ئەگەر بێ دەبێ زۆر ئاگاداری خۆت بی و هەروەها پێی گوت کە ئامۆزام ناوی فەرحانە کە ئەویش زۆر توندە ئەگەر بزانێ یەکێ حەز لە کچێکیان دەکا ئەوا کارەساتی گەورە دەقەومێنێ، ئەحلام گەڕایەوە چوە لای پوری ئەویش پێی گوت : دەبی بەپێی داب و نەریت بۆ فەرحان بی ، فەرحان چوە لای کە لەگەڵی قسە بکات بەلآم ئەحلام پێی گوت : تۆم خۆش ناوێ و یەکێکی ترم خۆش دەوێ فەرحان پێی گوت : ئەگەر تو دەرست خوێندوە بەلآم ئێمەش کەر نین غیرەتمان هەیە ولەسەر ناموسمان دێینە جواب .

ئەحلام کە گەڕایەوە لای پوری لە ژورێکدا زیندانی کرا کە بەڵی لە قسەی خۆی پەشیمان ببیتەوە کە پور و فەرحانی دەدیت پێیان دەگوت : بۆ ئێوە بیر لە داهاتو ناکەنەوە؟ لە لای ترەوە بەهمەن ویستی بە دوای ئەحلام دابێ، بەلاّم مامی دوبارە ئاگاداری کردەوە، بەهمەن سواری سەیارەکەی بوو بەرەو لادێیەکە کەوتە ڕێ چوە لای ڕیش سپییەکانی عەشیرەت ئەوانیش پێیان گوت: ئەمە هەرگیز نابێ واز لەم مەسەلەیە بێنی بەهمەن ویستی بەهەر شێوەیەك بێ ڕازیان بکات لەسەر قسەی خۆیان بوون. کە گەڕایەوە دیتی سەیارەکەی پەنچەر بووە ویستی چاکی بکاتەوە، بەلاّم زەڕبەیەکی لە دواوە پێ کەوت کە گەڕایەوە زیاتری پێ کەوت پاشان فەرحان پێی گوت : من و تۆ هەردوو گەنجین ئەحلام لەگەڵ تۆ ناگونجی ، بەلاّم فەرحان ئەم قسانەی پەسەند نەکرد و گوتی : ئەگەر دەتەوێت توشی کارەساتی تر نەبی ئەم ڕێگایە بگرە و بڕۆ و گەر نا خۆت دەزانی چیت بەسەر دادێ .

بەهمەن پێی گوت: زۆر سوپاس کە منت نەکوشت بەو عەقڵەتەوە کە گەڕایەوە مامی دیت کە دەم و چاوی بریندار بووە مامی پێی گوت بەتوم وتبوو کە ئەوان زۆر بە توندی داب و نەریتی خۆیان پاراستووە ، ئەوان ڕێگا نادەن کە کچەکەیان شو بە کەسێکی تر بکات . هەر لەم کاتەدا لە دادگا تاوانبارێك بە کوشتنی خوشکی تاوانبار کرا بو مەحکەمەیان هەبوو یەکی لە کەسانی ئەم جۆرە کەسانە کە داب و نەریتیان پاراستووە بۆچی خوشکی کوشتووە ؟ تاوانبارەکە گوتی کە غیرەتم هەبوو ناموسیشم هەبوو . پێیان گوت : بۆ چی ئەم ئیشەت کرد ؟ ئەویش وتی کە خەڵك لەپشت سەری ئێمە قسەیان دەکرد و لەگەڵ باوکیشم قسەیان نەدەکرد و ناچار بوم کە ئەم ئیشە بکەم .

لێرە مامی بەهمەن پێی گوت : بینیت کە ئەم شتانە و کارەساتانە لە نێویاندا هێشتا باوە و واز لەم کچە بینە .

ئەحلام هێشتا لای ماڵی پوری فەرحان زیندانی بوو. جارێ لەگەڵ پوری دانیشتبو پێی گوت: بۆچی مناڵت نیە ؟ پوری وتی : کە ئەمە چ سودێکی بۆ تۆ هەیە ؟ جارێکی تری لێ پرسی . ئەم جارە وتی شوم بە ئامۆزام کرد بە دڵم نەبو ناچار بووم بەپێ داب و نەریت هەڵسوکەوت بکەم ئامۆزام نە مێرد بوو

چەند ساڵ دوایی مرد و ئێستاش زۆر حەزم دەکرد مناڵم لە باوەشم دا بوایە .
پوری ئەحلام زۆری گوێ لە قسەکانی ئەحلامی دەگرت. شەوێ پورەکە لە جیاتی ئەحلام چوە لای فەرحان پێی گوت: فەرحان ئەم کچە لەگەڵ تو ناگونجێ وازی لێ بینە . فەرحانیش گوت: کە ئەمە دەزانم بەڵام بە مەرجێ ڕازیم یا بۆ برا بچوکەکەم یا نابێ لەم عەشیرەتە بچێتە دەر. ئەحلام هیچ ڕێگای تری نەبوو ناچار بوو کە شو بە فەرحان بکات. ڕۆژی دوایی کە پوری دەیویست بچێتە شار نامەیەك بۆ بەهمەن نوسی دوایی پێی گوت کە ئەمە دواین فرسەتە ئەگەر بۆ یەکتر بین.

بەهمەن بە مامی گوت کەوا ڕۆژی دوایی نیازی وایە لەگەڵ ئەحلام ڕا بکات و دوایی وڵات بەجێ بێڵن بەڵام مامی پێی گوت کە ئەمە ئیشێکی گرانە .
نابێ ئەمە بکەی . ڕۆژی دوایی چو بۆ شوێنی دیاری کراو ئەحلامیش لەگەڵ پوری دا بۆ شت کڕین هاتبوە ناو شار لەوێ جل و بەرگی بوکێنی بکڕی پوری پێی گوت : ڕا بکە ، ئەویش ڕای کرد و هاواریان کرد لەناو شاردا ئەحلام لەگەڵ بەهمەن ڕایان کرد . بەڵام هەر زوو گیران .

لە ڕێگادا بەهمەن بەدوای ئەحلام دا هات بەڵام ئەمجارە تووشی پێکدادانی سەیارەکەی بوو گیانی لە دەست دا و لە ڕێگای خۆشەویستی خۆی گیانی فیدا کرد و لای ترەوە ئەحلام و فەرحان شەوی بوك گواستنەوەیان بو ئەحلام لە ژورەکەدا پێش ئەوەی فەرحان بێتە ژورەوە فانۆسەکەی هێنایە خوار و نەوتی بەسەر خۆی دا کرد و هەموو ژوری بە نەوت کرد و لە لایەکی ترەوە فەرحان کە ویستی بێتە ژورەوە پوری بە چەقۆ لەسەر دڵی دا و یەکسەر کەوت پوری پێی گوت کە خۆت گوتبووت بمکوژە و ئەحلامیش لە لایەکی ترەوە ئاگری لەخۆی بەردا و هیچ کامیان نە بون بۆ یەکتر و ئەحلام و فەرحان و بەهمەن هەمو بونە قوربانی داب و نەریتی عەشیرەت کە داب و نەریتی خۆیان پاراستبوو .

*ئەم حەکایەتە کە ئێستاش لە نێو کۆمەڵ روو دەدەن .

# حەسەنە دز

**کۆکردنەوە: مەلا ئەحمەد حاجی مەلا ئەحمەد**

هەبوو نەبوو، کەس لەخودێ مەزنتر نەبوو حاکمێك هەبوو ناڤێ وی مەحەمەد پاشا بوو لەشاری مەحەمەد پاشای دا دزێك هەبو ناڤێ وی دزی حەسەن بوو کو خورتەکی(1) پێ کریایی بوو. حەسەن ڕۆژەکی چوو لە دەرگەهێکی دا , پیرەژنەکی درەگەبوڤەکر , حەسەنی گوتی : پیرێ تو میڤانا ناحەوینی ؟ پیری گوتی : بەخێرهاتی کەرەم کە وەرە ژوور . حەسەن فیری دزیا حاکمی ببو وە هەموو ڕۆژێ دچو بۆ دزیا مەحەمەد پاشای . مەحەمەد پاشای گوت : چالەکێ بکۆلن دا دزێ خۆ بگرین ؟ زیریت مە تەمام بوون دزێ مە ئەشکرا نەبو !؟ حەسەنی گووتە پیری : ئەز و کورێ تە دێچینە دزیا حاکمی . پاشا ڤ رێ کەڤتن . حەسەنی گوتە کورێ پیرێ : تو برای مەزنتری کو لەپێش من هەرە کوری پیرێ کەڤتە ناڤ چالێ دا کۆپا پڕ قیر بوو وە حەسەنی پێ لەملێ وی دانا چو دزیا حاکمی و لە گەرانەڤێ دا سەرێ کورێ پیرێ لێ ڤەکر . پاشای بانگ راهێلا مە دزێ خۆیی گرتی بەلێ یی بێ سەرە ! حاکمی دەستوردا لە جێیەکی دانین , هەر کەسێك پێ هاتە دەروی زێریت مەێت دزی. وەختی حەسەن ڤەگەریا مالا پیری , پیری گوتە حەسەنی : کا کورێ من ؟ حەسەنی گووتی : کورێ تە دگەل من نەهاتبوو ! بەلێ ئەز دێ چم لە دو گەرێم ئەگەر کەرێ تە هاتەڤە دێ بەیە ژورێ حەسەن دگەل کورێ پیری چو دەرێ گەریا , گەریا لە جمەکی دیت کۆ مەیتی کوری پیرێ لە دەڤ خولامێت پاشای پەیت زیرەڤانیا(2) مەیتی دکەن. خولامیت دیت کۆ حەسەن یی لاڤژا دبیژیت خولاما گازی حەسەنی کر , گووتی : وەرە ئێرە لا ڤژا ببیژە ؟ حەسەنی گووتی: ئەز ناهێم مەیتی وەدێ کەرێ من دزیت ! خولامێت پاشای گوتا حەسەنی : مەیت چاوادی کە ری دزیت ! حەسەن چو دەڤ وان و دەست کر بە لاڤژە گوتن هەتا خەو بە چاڤێن وان کەفت ئو نڤستن . وەحەسەن هەستا مەیت

لەسەر کەرێ دانا و بەرێ کەرێ دا لای مالێ , کەر چو مالێ وە پیری کەر ب مەیتەڤە بر ژوور . پاشان حەسەنی خۆ لە خەوی دا . پاشان خولام هەستانەڤە گۆتە یەك و دی : مەیتی مە کەرێ حەسەنی یێ دزی ؟ حەسەنیش هەستاڤە گۆتە وان ئەز دێ چمە دەڤ حاکمی دێ شکایەتی لەوە کەم ؟ خولاما گۆتا حەسەنی : تو نەچا ئەم دێ بیست زێرا دینیتە , بەلێ حەسەنی گۆتە وان ئەز دێچم. حاکمی گۆتە وان : قەت وە نییە هەوا مەیتی فروتی ؟ خولامێت خۆ زیندانی کرن .

حاکمی گوت : نەها(3) چ بکەین ؟ هەستان حوشترەك لە زێرا بار کرد هاژوتە ناڤ باژێری دا وەگوت : هەر کەسەك بچتە دەڤ حوشتری ئەو دزی مەیە . حەسەن بێ ئەوەی کەسەك بزانی حوشتر بەبارڤە برە مالا پیرێ . حاکمی گوت : نەها چ بکەین ؟ گوت پیرەکا جولەکە یا هەی بلا بچیتە ناڤ باژێری لەهەر مالەکی گۆشتی حوشتری دایێ بلا دەستی خۆ ل سەرە دەرکێ بدەت , سەرێ دەرگە دێ شین بیت . پیرە جولەکە چو ناڤ باژێرێ لە دەرگە پیرێ دا وە پیرێ گۆشتێ حوشتری دایێ . پیرا جولەکە دەستی خۆ لەسەرە دەرکێ دا حەسەن هەستا چو دەڤ کابرایەکی جولەکە کۆ دەستی وی ژی شین دبو ڤەدیت گوتە وی : چ گاڤا(4) من گوتا تە تو دەستی خۆ بکێشە بزانە ئەڤ بزنە ئەز تینم یا قەلەوە یا نەتو دەستی خۆ بکێشە کابرای جولەکە گوتی : بلا حەسەن چو پاشا گوتی ئەز هاتم من بزنا هێنای دەستی خۆ بکێشە ؟ کابرای جولەکە دەستی خۆ بکێشە ؟ حەسەنی دەستی کابرای بڕی چۆ هەمی سەرا درکێت باژێڕێ شین کرد . هۆسا(5) حاکمی نەزانی دزی وی کییە . ڤیجادی حاکمی گوت ئەم چ بکەین ؟ دزی مە ئەشکرا نەبو گوت زێرا ب ناڤ باژێڕێ وەر کەن هەر کەسێك دەست هاڤێتی ئەو دزی مەیە . حەسەنی گۆتە پیرێ ئەز دچمە ناڤ باژێڕێ هەتا ئەز دچم تو پێلاڤا زێرا لێڤەکە هەتا ئەز دزڤڕێمەڤە . حەسەنی پێلاڤێت خۆ دناڤ قیری هەلاندن چو ناڤ باژێڕێ و هاتەڤە و هەمێ زێڕ تەمام بون دز ئەشکرا نەبو . حاکمی باژێڕێ جیران(6) ب مەحەمەد پاشای پێکەنی کو چەوا نەشێت دزەکی بگریت ؟ ڤیجادێ حاکمی گوت ئەز دێ کیژا خۆ دەمە دزی ئەگەر خۆ ئەشکرا بکەت ؟ بەلێ من شەرتەکێ(7) هەی! حەسەن چو دەڤ

حاكمی گوتی ئەز دزیٚ تەمە ! مەحەمەد پاشای گوتی شەرتیٚ من ئەڤەیە كوٚ تو بوٚ من حاكمی باژێڕیٚ جیران بدزی ؟ حەسەنی گوتی : بلا , حەسەن چو باژێڕیٚ جیران هەستا سندروكەك چیٚ كر دانا مالا جیرانا حاكمی . وەخوٚ وەكی فەقیرەك چو مالا حاكمی , حاكمی گوتی : توٚ كێی ؟ گوٚتیٚ ئەز فەقیرم حەسەن شەڤی ل مالا حاكمی بو . بوٚ ڕوٚژ گوتە حاكمی دیٚ زەحمەتەكی كێشی دگەل من هەتا ناڤیٚ مالا جیران بچین حاكم دگەل حەسەن چو . حەسەن گوتی : حاكمیٚ باژێڕیٚ مەی مردی ئەز نزانم ئەڤ سندروكە بوٚ وی یا باشە یان نە هندی تەیە تو هەرە دناڤ دا داكوٚ بوٚ وی یاباشە یا نە ؟ حاكم چو دناڤ سندروكیٚ دا حەسەنی گوٚتی : خوٚ بزڤرینە ؟ پاشان زوو تەختە ل سەر دانا و بزمار كر وە بەرەو باژێڕیٚ مەحەمەد پاشای و هەمیٚ لیٚ خڕ ڤە بون و دیت كوٚ حەسەنی حاكمیٚ ییٚ دزی پیٚ كەنین ئو مەحەمەد پاشای زوٚر ب ڤی حاكمی كەنی و كیژا خوٚ دا حەسەنی و حەسەن ل جهی خوٚی دانا بوٚ ب حاكمیٚ باژێڕیٚ .

<u>پەراوێزەكان</u> :

(1)خورتەك : گەنجەك

(2)زێرەڤان : حەرەس . پاسەوان

(3)نەها : ئێستا

(4)گاڤا : كاتێك

(5)هوسا : ئەوها

(6)جیران : دراوسیٚ

(7)شەرتەك : مەرجێك

*ئەم حەكایەتە حەكایەتی سەركەوتنی هەژارێكی زیرەكە بە فروفێڵ بەسەر پاشادا، ئەم جۆرە حەكایەتە حەكایەتی تۆلە ساندنەوەی هەژارانە لە پاشا، بەڵام، لەنێو حەكایەت نەك لە واقیعدا .

# پشیله قوته

**کۆکردنەوە : نامق غەفور ئەسوەد**

**گێڕانەوە : ڕابیعــە عومــــەر**

دەگێڕنەوە کاتی خۆی پیرێژنەك هەبوو، کەسی نەمابوو، بە تەنێ ژیانی بەسەر دەبرد، ئەو پیرەژنە بزنەك و پشیلەیەکی هەبوو هەموو، ڕۆژانێ بزنەکەی دەدۆشی و شیرەکەی هێوێن دەکردو دەیکردە ماست. ڕۆژەك شیرەکەی هێوێن کردبوو ، چوو سەری مەنجەرە شیرەکەی هەرداوە ، دیتی شیرەکە کەم بووە . زانی هەندێکی خوراوەتەوە ئەو ڕۆژە قسەی نەکرد ، ڕۆژی پاشتر دیسان شیرەکەی کەمی کردبوو پیرێژنەکە لەبەر خۆیەوە گۆتی (سبەینێ خۆم لە پەنایەك دەشارمەوە بزانم کێ شیرەکەم دەخوا) .

ڕۆژی پاشتر بزنەکەی دۆشی و شیرەکەی لەناو مەنجەر کردو لەجێی خۆی دایناو تەورداسەکی هێناو خۆی لە پەنا دەرکە شاردەوە هەتا بزانێ کێ دێ شیرەکەی دەخوا . پیرێژنەکە لە پەنا دەرکە خۆی شاردبۆوە ، هەناسەی لەخۆ بڕیبوو ، دیتی ئەو پشیلەیەی کە بەخێوی دەکرد وا بە دزی دێتە ژۆرێ . پشیلەکە هاتە ژۆرێ لۆ لای مەنجەرە شیرەکە چوو ، پیرێژنەکەش لە پەنا دەرکە هاتە دەرێ و تەورداسەکەی ڕاوەشاندە پشیلەکە ، تەورداسەکە بە کلکی پشیلەکە کەت و کلکی قوت کرد ، پشیلەکە بە میاوە میاو دەرپەڕی و هەرات ، پشیلەکە بە کلك بڕاوی چووە ناو پشیلان ، پشیلەکان فشەیان پێ دەکردو پێی پێ دەکەنین و دەیان گۆت: (هێ هێ کلکی بڕایە ، هێ هێ کلك قوتە ، هێ هێ پشیلە قوتە) .

لەو ڕۆژی بە دواوە پشیلە کلك بڕایەکە بە پشیلە قوتە ناوی ڕۆیی، ئەویش زگی بەخۆی دەسوتاو شەرمی دەکردو لەناو گوندی بسوڕێتەوە و لەشەرمان نەیدەتانی لەگەر پشیلەکانی گوندی گەمان بکا ، پشیلە قوتە گۆتی (بەخوای ئەوها لۆم ناسوڕێ با بچمە کن داپیرەی بزانم کلکەکەم ناداتەوە) .

پشیله قوته ملی ڕیێ گرت و چووه ماری پیرێژنێ پشیله قوته خۆی فەقیر کردو گێیەکانی بەرداوە و کلکی خۆی شۆڕ کردەوە و بەرامبەر پیرێژنێ لەسەر چینچکان دانیشت و گۆتی : داپیرە ..... داپیرە .

ـ پیرێژن : ها پشیله قوته لۆ چ هاتیەوە و چت دەویێ ؟

ـ پشیله قوته : هاتیمە کلکەکەم بدەیەوە ، هەموو پشیلەکان و خەرکی گوندی فشەم پیێ دەکەن و هەر پێم دەرێن پشیله قوته .

ـ پیرێژن : ئیێ ئاسانە پشیله قوته ، کلکەکەت دەدەمەوە ، بەشەرتەکی ئەو شیرەی کە خواردبووت لۆم بینیەوە .

ـ پشیله قوته : ئەوجا داپیرە ، لە کێندەریێ شیرت لۆ بینم ؟

ـ پیرێژن : هەڕو لەکن بزنەکی لۆم بینە .

ـ پشیله قوته خەنی بوو ، گۆتی داپیرە کلکەکەم دەداتەوە ئەوجا کەس فشەم پێناکاو کەسیش پێم ناریێ پشیله قوته ، بە غاردان ڕۆیی چووه لای بزنەکی ، گۆتی : سەلام و عەلێك پلکە بزن .

ـ بزن : وەی عەلیکە سەلام ، پشیله قوته چت دەویێ لۆ چ هاتی ؟

ـ پشیله قوته : هاتیمە هەندەك شیرم بدەییێ لۆ داپیرەی دەبەم ئەویش کلکەکەم دەداتەوە .

ـ بزن : زۆر ئاسانە ، بڕۆ هەندەك گیام لۆ بینە ئەوجا شیرت دەدەمیێ .

ـ پشیله قوته : ئەوجا گیا لەکێندەریێ هەیە ، پێم بریێ هەتا بچم لۆت بینم .

بزن : بڕۆ کن عەردی ئەو گیات دەداتیێ .

ـ پشیله قوته ڕۆیی ، چوو هەندەك گیا لۆ بزنیێ بینی ، ڕۆیی ڕۆیی هەتا گەیشتە جێیەکی کە گیای لیێ بوو .

ـ پشیله قوته گۆتی : عەردەکە سەلام و عەلێك .

عەرد : وەی عەلیکە سەلام بەخێر هاتی پشیله قوته ماندی دیاری قسان بکە ـ بزانم چت دەویێ .

ـ پشیله قوته : هاتیمە هەندەك گیام بدەییێ لۆ پلکە بزنیێ دەبەم ، ئەویش شیرم دەداتیێ ، شیرەکەش لۆ داپیرەی دەبەم ، داپیرەش کلکەکەم دەداتەوە.

عەرد : گیا هەر قیمەتی نییە پشیله قوته ، بەرام بڕۆ هەندەك ئاوم لۆ بینە.

ـ پشیله قوته : ئاو لەکێندەرێ هەیە ؟
ـ عەرد : برۆ لەكن ڕوبارێ ئاوم لۆ بینە .
ـ پشیله قوته ڕۆیی چووە سەر ڕووبارێ هەتا هەندەك ئاو لۆ لۆ عەردی بینی .
لەسەر ڕۆبارێ ڕاوەستاو گۆتی : سەلام و عەلێك ڕوبار .
ـ ڕوبار : عەلێکە سەلام پشیله قوته ، دانیشە بزانم چت دەوێ ؟
ـ پشیله قوته : هاتیمە هەندەك ئاوم بدەیێ
ـ ڕوبار : ئاوت لۆ چییە و لۆ کێی دەبەی ؟
ـ پشیله قوته : هەندەك ئاو لۆ لۆ عەردی دەبەم عەردیش گیام دەداتێ ، گیایەکەش لۆ پلکە بزنێ دەبەم ، پلکە بزنیش شیرم دەداتێ ، شیرەکەش دەدەمە داپیرەی ، داپیرەش کلکەکەم دەداتەوە .
ـ ڕوبار : هەر ئەتوو ئاو وەی بەسەر چاو بەرام برۆ کیژو کاری گوندی بینە با لەسەرم شایی بکەن ئەوجا ئاوت دەدەمێ .
پشیله قوته چۆوە گوندی لە گوندی گەڕا کیژ و کاری گوندی هەموو خڕ کردەوە و پێیانی گووت : دەبێ بێن لەسەر ڕوبارێ شایی بکەن .ڕوبار ئاوم دەداتێ ، ئاوەکەش لۆ عەردی دەبەم ، عەردیش گیام دەداتێ ، گیایەکەش لۆ بزنێ دەبەم ، بزنیش شیرم دەداتێ ، شیرەکەش لۆ داپیرە دەبەم ، داپیرەش کلکەکەم دەداتەوە .
ـ کیژ و کار : پشیله قوته هەموومان دێین بەرام هیچمان پێراومان نییە شایی پێ بکەین ، برۆ پێراومان لۆ بینە ئەوجا دێین لەسەر ڕوبارێ شایی دەکەین .
ـ پشیله قوته : پێراو لەکێندەرێ هەیە هەتا بچم لۆتان بینم ؟
ـ کیژ و کار : هەڕوە لای پینەدۆزی .
ـ پشیله قوته ملی ڕێی گرت و چووە شاری گەڕا پرسیار بە پرسیار پینەدۆزەکی دیتەوە .
ـ پشیله قوته : سەلام و عەلێك مام پینەدۆز .
ـ پینەدۆز : وەی عەلیکە سەلام پشیله قوته خێرە هاتییە شاری ؟
ـ پشیله قوته : حار و مەسەلەم ئەوهایە .
بەسەر هاتەکەی هەموو لۆ پینەدۆزێ گێراوە .

ـ پینەدۆز : خەمت نەبێ مامی خۆت پێڵاوت دەداتێ بەشەرتەکی پێستەی گۆلکم لۆ بینی .

ـ پشیلە قوتە : مام پینەدۆز پێستەی گۆلکێ لەکێ هەیە هەتا لۆت بینم ؟

ـ پینەدۆز : ئاسانە لەکن قەسابان هەیە .

ـ پشیلە قوتە ڕۆیی چووە کن قەسابەکی گۆتی هاتیمە پێستەم بدەیێ قەسابەکەش گۆتی برۆ گۆلکەکم لۆ بینە کەوری دەکەم و پێستەکەت دەدەمێ .

پشیلە قوتە گەڕا کابرایەکی پیری دیتەوە گۆلکەکی هەبوو .

ـ پشیلە قوتە : سەلام و عەلێك مام باپیرە .

ـ باپیرە : وەی عەلێکە سەلام پشیلە قوتە ، خێرە ڕێت خەرەت کردیە هاتییە ماری من ؟

ـ پشیلە قوتە : باپیرە دەبی چارەکم بکەی بەسەرهاتم ئەوهایە .

(پشیلە قوتە ئەوەی بەسەری هاتبو هەمووی لۆ باپیرەی گێڕاوە) .

ـ باپیرە : ئاسانە کوڕی خۆم ، بەرام چێرەکەم لەمێژ نییە زایە گۆلکەکەی زۆر ساوایە دەبی ڕاوەستی هەتا سارەکی کە ئەلعان بڕۆوە و سارەکی دی ئەو وەختەی وەرەوە هەتا ئەو وەختی گۆلکەکە گەورە دەبی و لۆ خۆت بیبە .

پشیلە قوتە بە هەناسە ساردی گەڕاوە گوندی خۆیان . خەرکی گوندی هەر قسەیان پێ دەگۆت و پێیان دەگۆت پشیلە قوتە . پشیلەکانیش گەمانیان لەگەر نەدەکرد .

سار سوڕاوە گەیشتەوە وەختی خۆی . پشیلە قوتە ملی ڕێی گرت و چۆوە شاری. چۆوە ماری باپیرەی ئیسراحەتەکی کرد و گۆتی : باپیرە هاتیمە گۆلکەکەم بدەیێ پارەکە گۆتت سارەکی دی وەرەوە ئەوا ئەمڕۆ هاتیمەوە .

باپیرە : وەی بەخێر بێیەوە سەرچاوی باپیرەی ، ئەوجا گۆلك لۆتۆ قیمەتی چییە ، ئەمن لەڕاست تو هەر ساحێب مار نیمە . برۆ ناو خانی چێران گۆلکەکە لەوییە ، پەتکەکەی بگرە و ڕاست برۆ . پشیلە قوتە لەخۆشیان جێی پێ جێ نەبوو لەخۆشیان هەردەپەڕی . گۆلکەکەی هێناو لۆ قەسابی برد لەڕێیێ لەبەر خۆی دەیگۆت : ئەو گۆلکە دەدەمە قەسابەکەی ، قەسابەکەش پیستەم دەداتێ پیستەکەش دەدەمە پینەدۆزی ، پینەدۆزەکەش پێڕاوم

دەداتیٚ ، پێراوەکانیش دەدەمە کیژ و کاری گوندی ، کیژ و کاری گوندیش دێن لەسەر ڕوباریٚ شایی دەکەن ، ڕوبارەکەش ئاوم دەداتیٚ ، ئاوەکەش دەدەمە عەردی عەردەکەش گیام دەداتیٚ ، گیایەکەش دەدەمە بزنەکەی ، بزنەکەش شیرم دەداتیٚ ، شیرەکەش دەدەمە داپیرەی ، داپیرەش کلکەکەم دەداتەوە لەبەر خۆی هەر پێکەنی و هەردەپەڕی .

پشیلە قوتە گۆلکەکەی دا بە قەسابەکە ، قەسابەکەش پیستەکەی دایی ٚ پیستەکەشی دایە پینەدۆزەکە ، پینەدۆزەکەش پێراوی دایی ٚ ، پێراوەکانیشی هێناو گەڕاوە گوندی خۆیان و پێراوەکانی دایە کیژ و کاری گوندی کیژ و کاری گوندیش چوون لەسەر ڕوبار شاییان کرد ، ڕوباریش ئاوی دایی ٚ ئاوەکەشی دا عەردی ، عەردیش گیای دایی ٚ ، گیایەکەشی دایە بزنی ٚ ، بزنیش شیری دایی ٚ پشیلەکەش شیرەکەشی لە بزنەکە وەرگرت و بەغار چووە ماری داپیرەی لە دەرکەی دا پیرێژن گۆتی : ئەوە کیٚ لە دەرکە دەدا ؟

ـ پشیلە قوتە : ئەمنم داپیرە شیرم هێنایە کلکەکەم دەوێتەوە .

ـ پیرێژن : دەرکەی لیٚ کردەوە و شیرەکەی لیٚ وەرگرت سارو نیوەك زیاتر بوو پیرێژن کلکی پشیلە قوتەی بڕیبو . کلکی پشیلە قوتەی نەمابوو پیرێژن فڕێی دابوو .

ـ پیرێژن : ڕاوەستە هەر ئەلعان کلکەکەت دەدەمەوە .

پیرێژن ڕۆیی کەونە زەنگوڵەکی هێناو لە کلکی پشیلە قوتەی هێخست و گۆتی دەبڕۆ دەی ئەوە کلکەکەتم دایەوە خەنی لەخۆت هیچ کە پێت نارێن پشیلە قوتە.

پشیلە قوتە خەنی بوو لەخۆشیان پێی نەدەگەیشتە عەردی و هەر شایی دەکرد زەنگوڵەش هەر لەسەر کلکی زڕە زڕی دەکرد .

پشیلە قوتە چووە ناو پشیلەکان لە ناویان دا هاتوو چوو هەر خۆی با دەداو زەنگورەکە زیرە زیری دەهات .

ـ پشیلەکان گۆتیان : پشیلە قوتە ئەوە ئەو کلکە جوانەت لەکێندەر هینایە ؟ پێمان بریٚ ئەمەش لۆخۆمان یەکەو قل دەینین هیچ کەش پێت نارێین پشیلە قوتە .

ـ پشیله قوته : هیچ كه پێم مەرێن پشیله قوته خۆ كوڕه نەبوونه نەتان دیتیه كلكەكی چەند جوانم پێوەیە ؟

ـ پشیلەكان : هیچ كه پێت نارێین پشیله قوته بەس ئەتوو پێمان بریَ ئەو كلكانه لەكێندەریَ هەیە ؟

ـ پشیله قوته : لەناو ڕوباریَ هەیە وەرن با بچین جێیەكەتان پیَ دەرێم . پشیله قوته به پێش پشیلەكان كەت لۆ سەر ڕوباری بردن له دری خۆیدا دەیگۆت (دەردتان له گیانم وەڵاهی دەبی تۆڕەی خۆمتان لیَ بكەمەوە) .

ـ پشیله قوته پشیلەكانی بردە سەر ڕوباریَ لەسەر گۆمەكی گەورە ڕاوەستا ـ گۆتی : ئەو گۆمه گەورەیه پڕی ئەو كلكه جوانانەیه .

پشیلەیەك ڕاست خۆی فڕیَ دا ناو گۆمه ئاوەكه نوقم بوو بەسەر ئاو كەتەوە دیسان نوقم بوو بەسەر ئاو كەوتەوە هەر پەلی دەكوتا .

پشیلەكان گۆتیان : ئەوە دەخنكیَ كا كلك لێره هەیە ؟

پشیله قوته : خنكانی چ ؟ ئەوە دەریَ وەرن بنی گۆمیَ پڕی كلكه .

پشیلەكان هەموویان خۆیان فڕیَ دایه ناو گۆمه ئاوەكەو هەموویان خنكان پشیله قوتەش لەبەر خۆیەوە دەیگۆت (ئەوهاتان لیَ دەكەم گەمەتان بەمن دەكرد) پشیله قوته گەڕاوە گوندی به كەیفی خۆی دەگەڕاو بەتەنیَ مابۆوە . هەر دەڕۆیشت و خۆی با دەدا زەنگورەكەی سەر كلكیشی هەر زڕه زڕی دەهات .

*ئەم حەكایەته چیرۆكی گیاندارانه، ئەوەی تێبینی دەكریَ، ئەم چیرۆكه زۆرتر ڕێوی پاڵەوانی كلك بڕاوە، كەچی لێره پشیلەیە.

# فاتمۆكه

**كۆكردنەوە: نەمام عومەر ئیسماعیل**

**گێڕانەوەی : خاتون عومەر حەمـەد**

هەبوو نەبوو، له گوندێك كۆمەڵه كیژەك هەبوون، ڕۆژەك ئەو كیژانه چوو بوونه داران، كه گەڕانەوە یەكێك له كیژەكان كه ناوی فاتمۆكه بوو گۆلكەكیان هەبوو گۆلكەكه مردبوو ، فاتمۆكه تەشتەك گۆشتی بردە سەر ڕوباری هەتا بشواتەوە قەلەك گۆتی: قوار قوار فاتمۆكه پشكه گۆشتەكم بدیٚ دەتبەمه كن هەر حەفت برایان. فاتمۆكەش هاتەوە ماڵیٚ گۆتی دایه وایه ئەمن حەفت برام هەیه؟ دایكیشی گۆتی: وایه ئەتو حەفت برات هەیه چوینه ڕاو شكاری .

فاتمۆكەش پشكه گۆشتەكی لۆ قەلیٚ برد و قەلیش لەسەر پشتی خۆی داناو بردی له ئەشكەوتەكی داناو كه فاتمۆكه تەماشای كرد دیتی لەناو ئەشكەوتەكه كەندوەك هەیه پڕ ئاردە تەشتەكیش لەوییه قاپ و قاچاغ و شتی دیكەش لەوێیه، فاتمۆكه هەستا یەك تەشته هەویری گرتەوە و نانی كرد. كه براكانی هاتنەوە فاتمۆكه خۆی له پشت كەندوەكی شاردەوە براكانی كه تەماشایان كرد سەریان سوڕما گۆتیان: دەبیٚ چ موسوڵمانێك نانی لۆمه كردبیٚ؟ بەیانی زوو لەگەر تاڵیو تولان دەرچون لۆ ڕاو شكاری .

كه براكانی ڕۆیشتن فاتمۆكه هاته دەریٚ و نوێنی هەرگرت و قاپو قاچاغی شوشت و شیوی لیٚ ناو ئەوێی خاوێن كردەوە كه براكانی هاتنەوە فاتمۆكه دیسان خۆی شاردەوە، براكانی سەریان سوڕمابوو گۆتیان: دەبیٚ كیٚ ئەو ئیشانەی لۆمه كردبیٚ؟ كه بەیانی داهات براكانی چونه دەرەوە خۆیان لەو لای ئەشكەوتەكه شاردەوە هەتا ببینن ئەو كەسه كێیه ئەو ئیشانەیان لۆ دەكا ، كه تەماشایان كرد، خوشكی خۆیانه فاتمۆكه چونه لای گۆتیان: فاتمۆكه ئەتوو كو هاتیه ئێرە؟ فاتمۆكه گوتی: قەل ئەمنی هێنایته ئێرە و ئەمنیش دەبمه بنەوانی ئێوە ئەوانیش چون پشیلۆكەكیان لۆ كڕی و هەتا به تەنیا بێزار نەبی. هەموو ڕۆژیٚ فاتمۆكه ئیشی دەكرد و لەگەر پشیلەكەی گەمەی دەكرد و هەموو ڕۆژەكیش گلۆرەك هارموشی با دەداوە ، ڕۆژەك فاتمۆكه گەنمی لەسەر ئاگری

دانابووو هەر دەی گۆت : پشیلۆکە برۆ سەر لەئاگری بدە ، پشیلۆکەش هەر دەچوو دەهاتەوە دەیگۆت: فاتمۆکە یەك تروسکۆکە. فاتمۆکەش لەبەر گلۆرەکەی ئاگای لیٚ نەبووو هەتا ئاگرەکەی لیٚ کوژاوە فاتمۆکەش هەستا گلۆرەکەی لە باخەری ناو تەماشای کرد لەدوور تروسکایەك دیارە، فاتمۆکە گۆتیە پشیلۆکەی ئەتو لیٚرە بە ئەمن دەچم ئاگری دەینم .

فاتمۆکە هەر ڕۆیی هەر ڕۆیی گەیشتە ئاگرەکە، دیتی دوو ژن نانیان دەکرد و ژنەکیش وەری دەگیٚرا دیٚوەکیش لەبەر ئاگری نوستبوو .

فاتمۆکە داوای ئاگری لیٚ کردن ئەوانیش گۆتیان: ناویٚرین لەبەر دیٚوی ئاگرت بدەینیٚ. فاتمۆکەش گۆتی دەبی هەندەکم هەر بدەنیٚ .

کە دیٚو هەستاوە گۆتی : بۆن دیٚ بۆنی بیٚگانان دیٚ لەو حەوش و بانان دیٚ ئەگەر پیٚم نەلیٚن دەتانخۆم .

فاتمۆکە کە ڕۆیی سەری گلۆرە هارموشی لیٚ بەجیٚ مابوو هەر ڕۆیی گلۆرەش لەدوای بەجیٚ ما، فاتمۆکەش بەخۆشی دەڕۆیی ئاگای لیٚ نەبووو دیٚوەش سەری گلۆرەی هەر کردەوە هەتا گەیشتە ئەشکەوتیٚ فاتمۆکە کە چاوی پیٚ کەت زۆر ترسا. گۆتیە فاتمۆکەی پەنجەی گچکەت بمژم یان هەر حەفت برات بکوژم فاتمۆکەش گۆتی: هەر حەفت برام مەکوژە پەنجەی گچکەم بمژە.

فاتمۆکە هەردەهات لاواز دەبووو براکانی پیٚیان گۆت فاتمۆکە ئەتو نەخۆشی لۆ وات لیٚ هاتیە فاتمۆکەش گۆتی: برام چیتان لیٚ بشارمەوە حار و مەسەلە ئەوهایە .براکانی فاتمۆکەی چارەکی قولٚیان لیٚداو لبادەکیان لەسەر دانا گۆتیان فاتمۆکە پیٚش ئەوەی دیٚوەکە بیٚ ئەتو دەستی خۆت لەناو هەویری بنیٚ و بریٚ ئەتو دانیشە ئەمن وا دەستم دەشۆم و دیٚم . کە دیٚوەکە هات فاتمۆکە گۆتیە دیٚوەکەی: ئەتو لەسەر ئەو لبادە دانیشە ئەمن وا دیٚم کە دیٚوەکە دانیشت کەوتە ناو چاریٚ و براکانی دەوریان داو خۆریان بەسەر داکرد. گۆتیان فاتمۆکە نەکەی قەد ئاوی بەسەر دابکەی .

ڕۆژەك فاتمۆکە خۆی لەبیر کرد دەستاوی هەویری بەسەر داکرد. سیٚ چوار بنە پیاز لە جیٚیەکەی شین بوو. براکانی پیٚیان گوت: نەکەی ئەو پیازانە لەناو

شیویٚ بکەی. ڕۆژەك فاتمۆکە پیاز نەبووو لەشیویٚی بکات هەندەك پیازی لیٚ کردەوە و لەناو شیویٚی کرد. کە براکانی شیوەکەیان خوارد بووونە مەڕ .

فاتمۆکە هەموو ڕۆژیٚ براکانی دەبردە لەوەڕیٚو بەشەویش دەیهیٚنانەوە ئەشکەوتیٚ، ڕۆژەك سوارەکی لیٚ پەیدابووو سوارەکە گۆتی: خوشکە ئەتو لۆ دەگری؟ ئەویش گۆتی: چیت لۆ بگیٚڕمەوە حار و مەسەلە ئەوها بووو ئەویش گۆتی: ئەگەر میٚردم پیٚ بکەی هەر حەفت برات چاك دەکەمەوە بەلاٚم چەند گورزەم لەو برایانەت دا ئەتو نابیٚ بریٚی ئۆف ئەگەر بریٚی ئۆف ئەوە چا نابنەوە . سوارەکە شەش برای چا کردەوە کە گەیشتە حەفتەم کە برای گچکەی فاتمۆکەی بوو زۆری خۆش دەویست فاتمۆکە خۆی پیٚ نەگیراو گۆتی (ئۆف) و برای حەفتەمی چا نەبۆوە .

فاتمۆکە میٚردی بە سوارەکەی کردو ڕۆیی، لەگەر برایە گچکەکەی لەگەر خۆی برد. سۆرەی چاوشین کە هەویٚی فاتمۆکە بوو ڕۆژەك گوتی: فاتمۆکە وەرە بچینە سەر بیریٚو ئاوی بینین فاتمۆکە کە ئاوی بە دەولکی هەردەکیٚشا سۆرەی چاوشین پارەکی بەفاتمۆکەی ناو هاویشتیە ناو بیریٚ، هەموو ڕۆژیٚ بەرخۆکە کەنانیان دەدایێ نیوەی دەخوارد و نیوەی دەدایە فاتمۆکە . هەموو ڕۆژیٚ بەرخۆکە دەیگوت: فاتمۆکە هەموو ڕۆژیٚ سۆرەی چاوشین دەریٚ بەرخۆکەی پخ پخ دەکەم فاتمۆکەش دەیگوت: نا برام نا مەترسیٚ .

فاتمۆکە دوعای کرد گوتی: خوایە ببمە کۆتریٚك و لەناو ئەو بیرە بیٚمە دەریٚ، خودا دوعای فاتمۆکەی قبول کردو کردیە کۆتر، هەموو ڕۆژیٚ کۆترۆکە دەچوە سەر جۆتی و لەناو جواری تێر گەنمی دەخوارد و دەیگوت : هۆ جوتیار ئەحمەدی میران لەمارە؟ دەیگوت: ئەریٚ وەڵلاٚ، دەیگوت: سۆرەی چاوشین لە پارە دەیگوت ئەریٚ وەڵلاٚ دەیگوت یاخوا نەخوا لەو مار و حارە .

کە سۆرەی چاوشین زانی فاتمۆکە بوویتە کۆتر گۆتی: ژانە ژانی کوڕانە، گۆشتی کۆتریٚم دەرمانە. جوتیاریش گوتی: هەموو ڕۆژیٚ کۆترەك دیٚتە ناو جواری ئەو جارە کە هات ئەمن دەیگرم. جوتیار کۆتری لۆ سۆرەی چاوشین هینا سۆرەی چاوشین گوتی ئەو کۆترەی بکوژنەوە بەس نەهیٚڵن یەك پشکە خینی بڕژیٚ ، پشکە خینەك چوو بە چیلکە دارەکی کەت .

پیرێژنەك هەبوو هەموو ڕۆژەك دەچوو داری خڕ دەكردەوە چیلكە دارەكەی لەگەر خۆی برد، پیرێژن تەونەكی پەتەی لە داریّ بووو كە سبەینیّ هەستاوە دیتی پەتەكە نەمابووو هارموشی لەجێی كرابووە مافور كە شەویّ خۆی مات كردو دیتی كیژەكی گەلەك جوان لەژۆریّ هاتە دەریّ و چوە بەر مافوری پیرێژن گۆتی: ئەتوو كێی فاتمۆكەش گۆتی ئەمن دەبم بە كیژت و ئەتوش دایكم بە پیرێژن ڕازی بوو .

پیرێژنەكە قەد نەیدەهێشت فاتمۆكە بچیتە دەریّو خەرك بیبینی . ڕۆژێكی بەقارەك هاتبووە گوندی فاتمۆكەش سەری لە كولانەكەی دەرهێناو گۆتی دایە نەینۆكەكم لۆ بكڕە لەو كاتە ئەحمەدی میران دیتی كیژەكی گەلەك جوان لەماری پیرێژنیە كە ئێوارە داهات ئەحمەدی میران گۆتی دەبیّ هەموو ئەو مارانەی كیژیان هەیە بێن دەستاری لیّ بكەن. پیرێژن هەرچەند گۆتی ئەمن كیژم نیە. میر گۆتی: پیرێژن ئەگەر كیژت نەینی لەسەرت دەدەم پیرێژن ناچار بووو فاتمۆكەی لەگەرە خۆی برد .

ئەحمەدی میران فاتمۆكەی نەدەناسیەوە گۆتی: پیرێژن دەبی كیژی خۆت بدەی بە من. پیرێژنیش ناچار بووو ڕازی بی . فاتمۆكەش گۆتیە ئەحمەدی میران: ئەمن فاتمۆكەمە هەموو بەسەر هاتەكەی خۆی لۆ گێڕاوە . ئەحمەدی میرانیش لەتۆرەی فاتمۆكە سۆرەی چاوشینی كوشت و فاتمۆكەش گەڕاوە مار و حاری خۆی و بەخۆشی ژیا .

*ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆكە: فاتمۆك سواری پشتی قەل دەبی، دێو دەكوژریّ، فاتمۆك ئاوی بەسەردا دەكات و پیاز لەویّ سەوز دەبی، برایان پیازەكە دەخۆن دەبنە مەڕ، كابرایەك بە لێدان شەشیان چاك دەكاتەوە، گچكەكەیان دەلّیّ:(ئۆف) و چاك نابیتەوە، فاتمۆك دەبێتە كۆتر، كۆتر سەردەبڕن پشكە خوێنێك بە چیلكە دارێك دەكەویّ، چیلكەدار دەبێتەوە فاتمۆك . ـ ئەم چیرۆكە زۆر شێوەی هەیە، هەر لە نێو ئەم كتێبەدا خوێندەوار زیاتر لە شێوەیەكی دەبینیّ.

# سەرگوزشتەی ئەو کچەی کە نەیدەزانی خەم چیە

**کۆکردنەوە: نهایەت مەجید فەقێ**

**گێڕانەوەی: گولیزار سادق عەولا**

پاشایەك هەبوو کچێکی زۆر جوانی هەبوو ، ئەم کچە هەرچی لە ژیان کە ویستبوی بۆی هاتبووە دی ... قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان کۆسپێکی نەهاتبووە بەردەمی بۆ ئەوەی خەمی پێ بخوات، واتە ئەم کچە نەیدەزانی خەم چییە! ڕۆژێکیان کچەکە ئاهەنگێك ساز دەکات و چەندین خەڵك ئامادەی ئەم ئاهەنگە دەبن ، تەنها یەکێك لە خزمەتکارانی ئەم کچە ئامادە نابێت بۆ ئەوەی خواردن ئامادە بکات بۆ میوانەکان . کچەکە بەمە دەزانێ و دەچێت بۆ لای و پێی دەڵێت :.

بۆچی نایەیت کار بکەی؟ کچەکەش دەڵێ: من ناتوانم کار بکەم چونکە خەمم هەیە . کچی پادشا سەری سوڕ دەمێنێت و دەڵێت خەم چییە ؟! تا ئاهەنگەکە تەواو دەبێ ، دەبێت بە زووترین کات خەمم بۆ پەیدا بکەی ، بزانم خەم چییە و چۆنە ؟ کچەی خزمەتکار کەوتە پەلە و گوتی ئەی خوایە گیان بەو کاتە خەم چۆن پەیدا بکەم !؟ خۆ ئاخر خەم شتێك نییە بەدوای بگەڕێم و بۆی بهێنم ، بیری کردەوە و هەڵسا بەدوای (مار)ێك گەڕا و دۆزیەوە . مارەکەی خستە ناو گۆزەیەك و سەری داخست ، بردی لە ژوری کچە پادشای داناو چوە لای کچی پادشا و لەناو ئاهەنگەکە پێی ووت : خانم خەمم بۆ پەیدا کردی و لە ژوورەکەت دامناوە . کچە ووتی باشە دوای ئەوەی ئاهەنگەکە تەواو دەبێ سەیری دەکەم . کاتێك ئاهەنگەکە تەواو بوو کچە پادشا چوە ژوورەکەی خۆی و گۆزەیەکی سەرداخراوی کەوتە بەرچاو . یەکسەر سەری گۆزەکەی کردەوە لە ناکاو مارەکەی بینی مارەکە خۆی لە ملی کچە پادشا ئاڵاند و پێی وت: هیچ دەنگێك نەکەیت و بە کەسیش نەڵێیت ئەگەرنا بە ژەهرەکەم دەتکوژم ... ئینجا ئەو مارە بە ملی کچە مایەوە و کچە لەشەرمان و

بۆ ئەوەی کەس مارەکە نەبینێت بە پەڕۆك ملی خۆی داپۆشتبو... ئەستوریەکی تەواو بە ملی دیار بوو . کە بە پەڕۆ مارەکەی شاردبۆوە . هەرچەندە خەڵك پێیان دەووت : ئەمە چییە ؟ کچەکە قەت وەڵامی نەدەدانەوە و دەی وت: ملم دێشێت . هەرچەندە خەڵك پێیان دەوت و خوازبێنی ئەهات هەمووی ڕەت دەکردەوە و شووی نەدەکرد کچە زۆر دڵتەنگ بوو زۆر هەستی بەبێزاری و ناڕەحەتی دەکرد . هیچ هیوایەکی لە دونیا نەمابوو . ڕۆژێك ئامۆزاکەی خۆی هاتە خوازبێنی و داوای لێ کرد شووی پێ بکات . ئەگەر شووی پێ نەکات ئەوا دەیکوژێ ... کچە ناچار بوو شووی پێ بکات بەڵام کچە مەرجی هەبوو ئەویش ئەوە بوو نابێت کوڕە پێی بڵێت ئەم پەڕۆکانە لە ملت بکەرەوە . هەروەها نابێت دەست لە ملی کچکە بدات تا خۆی ئەم قسەیە نەکات . کوڕە بەم مەرجانە ڕازی بوو . ئینجا کچەکە شووی پێ کرد و چەندان ڕۆژ بەسەر چوو کوڕە چاوەڕێی قسەی کچە بوو ، هەرچەندە کوڕەکە پێی دەووت ئەم ملەت بۆ وایە ، بۆچی بەم هەموو پەڕۆکە شاردوتەوە . کچە قەت قسەی بۆ نەدەکرد بەڵام کوڕەکە هەرگیز بۆی نەبوو بڵێ ئەم پەڕۆکانە لە ملت بکەوە . ڕۆژێك لە ڕۆژان کچە زۆر بێزار دەبێ و زۆر دەگری و دەڵی نازانم من خۆشیم دیوە لە ژیان یان نا . لە دوایی دا کچە یەکسەر دەچێتە سەر کانی بۆ ئەوەی خۆی بشوات . بە (مار)ەکە دەڵێ دەمەوێ خۆم بشۆم تەنها بۆ چەند ساتێك لەملم وەرە خوارێ تا خۆم دەشۆم. با تۆزێك ئیسراحەت بکەم . مارەکەش بەزەیی پێی دێتەوە و لە ملی دێتە خوارێ ... کچە لەدوای ئەوەی کە خۆی دەشوات چەندی چاو دەگێڕێ مارەکە نابینێتەوە . بەم جۆرە کچە ڕزگاری دەبێت و دەڵێ ئەوە مانای (خەم). کە من دیتم ئاخ کە خەم چەند گرانە ... دەچێتەوە بۆ لای کچی خزمەتکار و پێی دەڵێ : ئێستا زانیم مانای خەم چییە و ئەوەی خەم نەبینێت نازانێت خەم چییە و چۆنە ... .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: قسەکردنی مارەکەیە.**

# پادشایەکی باش

بەناوچەیەکدا پادشایەکی زۆر باش هەبوو . ئەم پادشایە تا بڵێی هەڵسوو کەوت و ڕەفتاری لەگەڵ خەڵکی گوندەکە باش بوو . بۆیە خەڵکی ناوچەکە زۆر خۆشیان دەویست ... ڕۆژێك لە ڕۆژان پادشا داوای لە کرێکارەکان کرد کە کۆشکێکی بۆ دروست بکەن . هەرچەند کرێکاری ئەم ناوچەیە هەبوو هەمووی کۆ بوونەوە بۆ ئەوەی کۆشکەکە بۆ پادشا دروست بکەن . بەڵام پادشا هەمووی ڕەت کردنەوە ، چونکە لەمەبەستی پادشا تیَ نەدەگەیشتن ، لەناکاو کەسێکی ناوچەکە چوە بەردەم پادشا و پێی گووت : گەورەم من بۆت دروست دەکەم ، پادشاش ڕازی بوو بۆ ئەوەی کۆشکەکەی بۆ دروست بکات . ئینجا کابرا دەستی کرد بە دروست کردنی کۆشکەکە و تەواوی کرد چووە بەردەم پادشا و گووتی: گەورەم کۆشکەکەم بۆ تەواو کردی ، پادشا گووتی : پێم بڵیَ چۆنت دروس کردوە ... کابرا گووتی : گەورەم بە دڵی تۆ . پادشا گووتی : دەمەویَ تێم بگەیەنی کابرا گووتی : ئەو کۆشکەی دروستم کردوە تەنها لەسەر یەك دانە خشت وەستاوە . پادشا گووتی : دیسان دەمەویَ تێم بگەیەنی . کابرا گووتی : گەورەم واتە هەرکاتێك دوژمن بەسەرت زاڵ بوو ئەوا دەتوانی ئەم دانە خشتە لە کۆشکەکە دەربهێنیت و کۆشکەکە بەسەر خۆتدا بڕوخێنی ، بەر لەوەی بکەویتە بەردەستی دوژمن و بتکوژن . پادشا یەکسەر سەری کابرای پەلدا . چونکە پادشا زانی کە ئەم کابرایە نیازی خراپە بەرامبەر بە پادشا . بۆیە پادشا گووتی : ئێستا زانیم کە تۆ نیازت خراپە ، ئەوا لە دوایی دا تۆ دەبیتە کەسێکی خراپ بۆ میلەت ، لێرەدا پادشا دەیویست بزانیَ ئایا چ کەسێك نیازی خراپی هەیە بەرامبەر بە ئەو . ئەوا نیازی خراپتری دەبێت بەرامبەر بە گەلەکەی .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: وەستانی کۆشکێکە لەسەر تەنیا خشتێك.**

# چارەنووس

کوڕە پادشایەکی زۆر جوان و دەوڵەمەند و خاوەن دەسەلآت دەبێت لە شارێکدا . ڕۆژێك لە ڕۆژان کوڕە خەون دەبینێت ، لە خەوەکەیدا پێی دەڵێن کچە گاوانەکەی خۆتان بە نسیبی تۆ دەبێت ... کوڕە بەیانی کە لەخەو هەڵدەستێت زۆر دڵی تەنگ دەبێت و دەچێتە بەردەم کچە و دەبینێت کچە زۆر ناشیرینە . لە هەمان کاتیشدا کچی گاوانە . جا خەڵکی چی دەڵێن ئەگەر بێتو کوڕە پادشا کچە گاوانەکی وا ناشیرین بهێنێت . کوڕەکە داوای لە گاوانەکە کرد کە بەزووترین کاتماڵیان لەم شوێنە بڕوات و ئەو شوێنە بەجێ بهێڵن. ماڵی گاوان ڕۆیشتن ، بەلآم کوڕە هێشتا هەر دەترسا کە کچەکە بۆ ئەو بێت. ڕۆژێك کوڕە دووبارە چووەوە ماڵی کچەکە و پێی وت: جامێك ئاوم بۆ بێنە. کچەش ئاوی بۆ هێنا . کوڕە یەکسەر جامەکەی بە ئەرز داگرت و گووتی ئەم ئاوە پیسە . بڕۆ جامێکی ترم بۆ بهێنە پێش ئەوەی کچەکە بگەڕێتەوە کوڕەکە تاڵە مویەکی لەسەری خۆی هەڵکێشا و کاتێك کچەکە هاتەوە یەکسەر بە دزیەوە خستیە ناو ئاوەکە و بە کچەکەی وت : ئەی ئەم مووە چییە لەناو جامەکەدایە؟ کچە سەری سوڕما لە کوڕە و گووتی نازانم. یەکسەر کوڕە (شیر)ەکەی لە پشتی دەرهێنا و کچەی پارچە بە پارچە کرد و لەناو پارچە پەڕۆکێك لوولی داو لە ماڵەکەی خۆی جێی هێشت . کاتێك دایك و باوکی گەڕانەوە و بینیان کچە بەم شێوەی بەسەر هاتووە دەستیان کرد بە گریان تا شەو داهات ، چاوەڕێی (بەیانی)یان دەکرد تا ڕۆژ هەڵبێت و کچە بنێژن . لەناکاو خەویان لێ کەوت . کاتێك بەیانی هات دایك و باوکی کچە خەبەریان بۆوە بینیان کچە چاك بۆتەوە و سەریان لە جوانی کچە سوڕما و یەکسەر ماڵی خۆیان گواستەوە بۆ شوێنێکی دوور لەترسی کچەکەیان ، چونکە زۆر زۆر جوان ببوو . بۆ ئەوەی خەڵکی گوند نەڵێن ئەم کچە کێیە و بۆچی وای لێ هاتووە ... تا ڕۆژێکیان ئاهەنگێکی گەورە لەو شوێنەی کە ماڵی کچەی چویتێ دەست پێ دەکات و ماڵی کوڕە پادشاش لەو ئاهەنگە دەعوەت کراون ، کوڕە پادشا بە سواری ئەسپ بەبەردەم ماڵی کچە دادەچێ و بۆ ئەوەی بچن بۆ

ئاهەنگەکە . لە ناکاو کوڕە چاوی بە کچە گاوان دەکەوێت و یەکسەر عاشقی دەبێت . هیچ ئارامی لەبەر نامێنێت ، یەکسەر داوا لە دایك و باوکی دەکات کە بچن بۆ خوازبێنی کچە ، دوای ئەوەی لە ئاهەنگ دەگەڕێنەوە ئینجا ئاهەنگ تەواو بوو گەڕانەوە ماڵەوە و کوڕە دایك و باوکی ڕەوانەی ماڵی کچە کرد . کاتێك دایك و باوکی کچە چاویان بە دایك و باوکی کوڕە کەوت کە بۆ خوازبێنی کچەکەیان هاتوون لە خۆشیانا نەیاندەزانی چی بکەن و چۆن پێشوازیان لێ بکەن و چۆن وەڵامیان بدەنەوە ... یەکسەر کچەیان پێشکەشی کوڕە کرد و کچە گاوانیش ڕازی بوو . ئینجا ئاهەنگ دەستی پێ کرد و شایی و زەماوەند بۆ کوڕە پاشا و کچە گاوان سازکرا و تا درەنگی شەو خەڵکی چوونەوە بۆ ماڵ و کوڕە و کچەش بۆ ژووری خۆیان . کاتێك کچەکە جل و بەرگی خۆی داکەند ، کوڕە بە لەشی کچەکەوە چەندین خەتی شیری بینی کە بەلەشیەوە بوو ، ئاسەواری ئەم برینانەش لەسەر جەستەی کچە مابوو کە وەك کراس پارچە پارچە کراوی لێکدراو وابوو ، کوڕەکە بە کچەکەی ووت : باشە بۆچی لاشەت وایە ، کەس دەزانی تۆ لاشەت وایە . کچەش لە وەڵامدا ووتی : دەزانی من کێم !؟ من کچە گاوانم ، لەکاتی خۆی تۆ بە شیر لێت دام و پارچە پارچەت کردم ، بەڵام لەبەر ئەوەی نسیبم بەتۆ بوو دەبوایە هەر بۆ تۆ بم ، ئەگەر چی یەکەمجار ناشیرین بووم بەڵام بە کاری خوا چاك بوومەوە و جوان بووم.

*ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: چاك بوونەوەو جوان بوونی کچە گاوانی پارچە پارچە کراوە.

# ئەو دێوەی ویستی کوڕی ئاشەوان بکوژێ

**کۆکردنەوە : هێمن ئەحمەد تەها**

**گێڕانەوە : حاجی مەحەمەد قادر**

**لە ئەفسانەکاندا هاتووە کە ڕوداو و بەسەرهاتی ئەم داستانە هەمووی بەڕاستی ڕوویان داوە و بەسەرهاتەکانی هەمووی ڕاستن ، بەلاّم تەنانەت یەك و شەشی لەگەلّ ڕاستی دا بەرابەر نایەتەوە .**

**لە سەردەمێکی زوو پێش ئێستا پاشایەك دەبێ و تەنیا کچێکی دەبێ و هیچی دی،پاشا کچەکەی لە قەلاّیەکی زۆر بلّند دا دەخاتە ژێر چاودێری خۆی و هەموو ڕۆژیش جارێکی سەری لێ دەدا و دەیکێشا تا بزانێ قەلّەو بووە یان لاواز. کەمێك لەو لای قەلاّوە جوتیارێك هەبوو ئاشەوانی دەکرد . ئەویش تەنیا کوڕێکی هەبوو ئاشەوان کۆچی دوایی کردو کوڕیژگە بێ باب مایەوە ، زۆری نەبرد داکیشی مردو دونیای بەجێ هێشت . کوڕیژگە هەراش بوو . هەندێك هەن کەم کەمە بە گوتەی هەندێکیان سالّ بەسالّ گەورە دەبن ، بەلاّم ئەو ڕۆژ بەڕۆژ هەلّی دەدا و گەورە دەبوو ، کچی پاشای هەموو ڕۆژێ لە قەلاّوە بەسەر خوارەوەی دەڕوانی و هەموو ڕۆژیش کوڕی جوتیاری دەدەیت ، کچی پاشا شەیدای کوڕی جوتیار دەبێ ، بەلاّم لەبابی زۆر دەترسا ، سەرەنجام ڕۆژێك لە ڕۆژان ترسی خۆی شکاندو نامەیەکی لە قەلاّتێوە بۆ کوڕەی هاویشتە خوارێ . کوڕەکە دوای ماوەیەك بیر کردنەوە گوریسێکی درێژی هێنا و سەرێکی بە بەردێکەوە بەست و سەرەکەی دیکەشی بەرەو یەك لە پەنجەرەکانی قەلاّتێ هەلّدا ، کچی پاشای گوریسەکەی دیتەوە و لە گۆلّەگێکی قایم کرد . کوڕەکەبە گوریسی هەلّگەڕاو لە قەلاّتێ سەرکەوت و پێکەوە دەستیان تێکەلّ کرد ، هەرکاتێ بابی کچەکەی دەهاتەوە مالّێ کوڕەکە خۆی لە جێگایەك مات دەکرد ، تا پاشا پێی نەزانێ . هەروەك چۆن وتمان پاشا هەموو ڕۆژێ دەهات کچەکەی دەکێشا لەمەدا هەستی کرد کە کچەکەی قەلّەو بووە . کچەکەی تێ**

گەیشت بابی گومانی لەو قەڵەویەی هەیە بۆیە بە کوڕەکەی گووت (ئێمە دەبێ هەڵبێین) . هەردووکیان بە گوریسەکە هاتنە خوارێ و کوڕی جوتیاری کچی پاشای بردە نێو خانووە کەلاوەکەی خۆیان و کاتێ هەڵاتنی کچەکەیان بەپاشا ڕاگەیاند ، دەست و پێوەندەکانی پاشا بە هەموو لایەك بلاْو بوونەوە بۆ ئەوەی کچەکە بدۆزنەوە . لە ئەنجام دا دەستو پێوەندی پاشا شوێنی کچەکەیان دۆزیەوە کە کاولە ماڵی کوڕە ئاشەوانێکە . پاشا حەوت پیاوی لە دەربارانی خۆی نارد تا کوڕە ئاشەوان و کچەکەی خۆی بگرن و بیان هێننە دەربارێ . کوڕە ئاشەوان لە دەری کاولە ماڵەکەی خۆی خەریکی خۆ شوشتنی بوو ، نۆکەرەکان کە چاویان پێ کەوت و بەرەولای وەغار کەوتن بۆ ئەوەی دەستگیری بکەن . کوڕە ئاشەوان ڕایکردە ماڵێ و شمشێری ڕاکێشاو یەك نەبێ دەنا ئەوانی دیکەی هەموو کوشتن ، کوڕی ئاشەوان بەو نۆکەرەی گووت : (بڕۆ بە شای بڵێ کەسی دیکەم نەنێریتە سەرێ. تازە ئەو کچە هاوسەری منە و دەبێ هەر لەگەڵ مندا بژی) .

شا کە ئەوەی بیست زۆر توڕە بوو ئەو جارە دوازدە پیاوی دیکەی بۆ گرتنی ناردنە سەریان ، ئەو دوازدەش زۆریان خۆ هێناو برد زەفەرێکی بە کوڕە ئاشەوانی بەرن بەلاْم بۆیان نەکرا . هەر کە شمشێری هەڵکێشا سەری یازدانی لە لەشیان جودا کردنەوە و دوازدەهەمینی ئازاد کردو گووتی : (بڕۆ بە پاشای بڵێ با چی دی کەسم نەنێریتە سەرێ) . ڕۆژێکی کچەکە بە مێردەکەی گووت : (وا چاترە لێرە بڕۆین ، چونکە هەر چی بکەین بابم دەست بەردارمان نابێ و لە کۆڵمان نابێتەوە) . کوڕە قسەی کچەکەی بەدڵ داچوو ، هەر دوای ئەوە هەرچی هەیان بوو کۆیان کردەوە و کەوتنە ڕێ . کوڕەکە تیرێکی لە تیردانێ دەرکێشاو لە ژێی کەوانێی ڕاکێشا تا تیرە لە هەر جێگەیەکی بکەوێ ئەوان بچنەوێ و لەوێ بناغەی ژینی خۆیان هەڵنێن . تیر لە نۆ کێوان ئاوا بوو و چوو لە ماڵێکی کەوت کە ماڵی نۆ برا دێوان بوو . دێوەکان هەموو تەماشای یەکتریان کردو تەماشای ویان کردو سەرسام بوون کە چۆن ئەوان بە نۆ دێوان نەیان توانی ئەو تیرە لە زەوی دەرکێشنە دەرێ کەچی کوڕەکە هەر بەدەستی چەپی خۆی تیرەکەی دەرکێشایەوە . دێوەکان

بڕیاریان دا تاقی کەنەوە داخوا بەڕاستی وا بەهێزە بەهێز و توانایە یان نا ؟ دێوەکان مەنجەڵێکی یەکجار گەورەی زنجیرداریان هەبوو چێشتیان تێڕا لێ دەنا . ئەو مەنجەڵە بە هەر نۆ دێوان نەبوایە نەدەچووە سەر ئاگری . دێوەکان بە کوڕەکەیان گووت : (ئەو مەنجەڵە لەسەر ئاگر داگرە) ئەویش بەرەو مەنجەڵەکە چوو هەر لەچاو تروکانێکدا هەڵیگرت و لەسەر عاردی دانا . دێوەکان هەموو تێگەیشتن کە بەڕاستی بەهێز و توانایە و ئەوان دەرەوەستی وی نابەن . بۆیە بڕیاریان دا دۆستایەتی لەگەڵ بکەن ، بەڵام نەیانتوانی لەوە زیاتر خۆ ڕاگرن و هاتنەوە سەر خۆو وخدەی خۆیان و هەر زوو بە زوو دەستیان دەبەرۆکی یەك ناو بەر بینگی یەکدیان گرت و شەڕ و هەرایان کەوتەوە نێوانیان . کوڕی ئاشەوانی هەشت دانە دێوی لێ کوشتن و یەکێکیان نەبێ کە بەشەلەشەل خۆی دەچاڵێکیدا شاردبۆوە و خۆی پەنا دابوو ڕزگاری بوو . ژن و مێردەش هەرچی خوا بە دێوانی دابوو دەستیان بەسەر داگرت و کردیانە ئی خۆیان . زۆر بەخۆشی و شادی و بەختەوەری و ئاسودەیی ڕۆژانی ژیانیان بەسەر دەبردو دەژیان .

ماوەیەکی زۆر نەبوو کە ڕۆژێکی کوڕە بڕیاری دا بچێتە ڕاوێ . لە دەمی ڕۆیشتن دا بە هاوسەرەکەی گوت : (کە هاتمەوە تا سێ جاران لە دەرکێ نەدەم نەیکەیتەوە نەوەك بێگانەیەك بێتە ژوورێ) دێوە شەلە گوێی لە هەموو قسەکان بوو ، کوڕی ئاشەوان ڕۆیشت بۆ ڕاوێ . بۆیە دێوەکە لە چاڵەکە هاتە دەرێ و بەرەو دەرکێ خزی و وەك چۆن مێردە بە ژنەکەی گوتبوو، سێ جارانی لە دەرکێ دا . ژنە هەر خێرا تێگەیی کە ئەوە مێردەکەی نییەو دەرکەی نەکردەوە . دێوە بە زمانێکی شیرین گوتی : (من شەیدای تۆ بوم ئەگەر دەرکیش ناکەیەوە هەر ئەنگوستە چکۆڵەکەت لە کونی دەرکێ دا بێنە ئەو دیوی ، ماچی دەکەم و لێرەوە وە دوور دەکەوم) . ئەویش ئەنگوستە بچکۆڵەی لە درزی دەرگایدا بۆ ئاودیو کرد . دێوە تا توانی زۆر بە توندی ئەنگوستەی بە ددانی گرت و ژنە لە تاوان هاواری لێ هەڵستا . دێوە گوتی : (دەرکێ بکەوە دەنا ئەنگوستت دەقرتێنم)ژنە بەرگەی ئازاری نەگرت و دەرکەی کردەوە دێوە چوە ژورێ . بەرەبەری ئێوارێ پیاوە هاتەوە ماڵێ سێ جارانی لە دەرکێ دا

هاوسەرەکەی دەرکەی کردەوە ، دەو دەمی دا کە ژنە چووە دەرکیٚ وەکا دێوە بە هەڵی زانی و چوو خۆی لە پەنایەکی شاردەوە . سبەی بەیانی دوو بارە کوڕە چووە ڕاویٚ . ژنەکەو دێوە شەلە بەتەنیٚ مانەوە . دێوە گوتی : (دەبیٚ لەناوی بەرین) .

ژنە پرسی (جا چۆنی لەناو بەرین؟) .

ـ دێوە گوتی: (کە مێردەکەت هاتەوە خۆ نەخۆش کە ئەگەر لێی پرسی چتەو بەچی چاك دەبیەوە ، بڵیٚ جۆرە بەرازێکی کێوی لەنێو دارستانیٚ لەبن دار بەڕویەك دەژی بە جەرگی وی من چاك دەبمەوە . پێی بڵیٚ ئەگەر جەرگی ئەو بەرازەم بۆ پەیدا دەکەی ئەوە باشەو چاك دەبمەوە وەك جارانم لیٚ دێتەوە دەنا دەمرم . ئەو بەدوای بەراز دەچیٚ من و تۆش لە دەستی ڕزگارمان دەبیٚ) مێردە لەڕاویٚ هاتەوە دیتی ژنەکەی دەناڵێنیٚ بەڵام چۆن ها ئێستا بمریٚ هاتاوێکی دی.

ـ پیاوە پرسی : (ئەوە چ بوە) ژنە بە ناڵە ناڵەوە گوتی : (نەخۆشم بیستومە بەرازی کێوی لەدارستانیٚ دا هەیە ئەگەر جەرگی ویم بگاتیٚ ئەوە چاك دەبم دەنا دڵنیا بە دەمرم و ئەو بەرازە کێویەش هەر لەبن دار بەڕویٚ دادەژی) کوڕە ئاشەوان بۆ ڕاوە بەرازی بە دار بەڕوی هەڵگەڕاو خۆی لەبۆسە دا . بەرازی کێوی بۆنی ئادەمی زادی وەبەر لووتی هاتبو بەخێرایی لە داربەڕووی هاتە پێشیٚ و مرۆڤێکی لە نێوان لق و پۆپی دار بەڕویٚ دا بەدی کرد . هێرشی بردە سەر دار بەڕوی و شفرە درێژەکانی لە قەدی دارەی گیر کردن و لە ناوەڕاستی بڕیەوە و کردیە دوو لەت . دوو بارە هێرشی کردەوە سەر دارە بەڕویٚ بەڵام ئەم جارەیان لە تووڕەییان لە جیاتی ئەوەی شفرەکانی لە قەدی داریٚ دا لە ڕەگەکانی گیر بوو. کوڕەکە هاتە خواریٚ و لەسەر لقێکی دیکە دانیشت ، شمشێری دەرکێشاو کەوتە وێزی بەرازە کێوی ، هێندەی بۆیە شمشێر دە لەشیٚ ڕادەکرد دەیگوت داخوا لە تاوان شفرەکانی لە ڕەگەکان دەکاتەوە یان نا . بەراز بەردەوام خۆی دێناو دەبرد شفرەکانی لە ڕەگی دارەکەی کاتەوە بەڵام بیٚ سود بو وە بۆی نەکرا. کوڕەکە خۆی لە داریٚ فڕە دایە خواریٚ و سەری بەرازەی گۆشاو گۆش بڕی ، کەلەشەکەی کردە دوو لەت جەرگەکەی هێنایە

دەرێ و بەرەو ماڵ ڕۆیشت. گەیشتە بەر ماڵێ لە دەرکەی دا . ژنەو دێوەکە پێیان وابو تازە ئیدی ئەو مردووە بۆیە بێ خەم خەریکی شادی و خۆشی و بەزم و ڕەزمی خۆیان بون. ئەوان کە چاوەڕێی هاتنی کەس نەبوون بە لەدەرکێ دانێ شلەژانبوون دێوە خۆی شاردەوە و ژنە دەرکەکەی کردەوە.

کوڕی ئاشەوانی دەست و برد جەرگی بەرازی لێ ناو دایە ژنەکەی تا بیخوا ژنە هیچ چارەی نەما لەوەی زیاتر کە جەرگەکەی بخوا و خۆی وا پیشاندا کە چاك بۆتەوە . بۆ سبەی بەیانی دوو بارە کوڕە بۆ ڕاو و شکارێ لە ماڵێ وەدەر کەوت ، دێوە لە حەشارگەی خۆی هاتە دەرێ و داوای لە ژنەکە کرد کە مێردەکەی هاتەوە سەر لەنوێ خۆی نەخۆش کاتەوە و بڵێ تەنیا دەرمانیشی جەرگی شووری کێویە . دێوە گوتی : (ئەو بۆ ڕاوی نێری دەچێ نێریش بێ یەك و دوو دەیکوژێ ئێمە لە دەستی ڕزگار دەبین) مێردە لە ڕاو هاتەوە دوو بارە ژنە خۆی نەخۆش کردەوە و لێی پرسی : (دیسان ئەوە چییە خۆ بەیانی چاك بوی بۆ سەر لەنوێ ناڵەو نرکەتە ؟) ژنە بە دەنگێکی وا کە زۆر نەساغە گوتی : (جەرگی نێریە شووریێم بۆ بێنە بیخۆم تا چاك ببمەوە دەنا دەمرم) پیاوە چووە ڕاوێ نێریە شووری بەڵام ئەو شوورەی لەکوێ ڕاوکا ؟ دوور یا نزیك گوێی لەوانە بوو ڕێی دەشت و بیابانی گرت و ملی لێنا تا سەرەنجام گەییە داوێنی کێوێکی دامێنی ئەو کێوەی مێرگ و مێرگوزارێك بوو ، دوازدە وەرزێری چاپوك بەبێ ڕاوەستان دروێنەی گیایان لێ دەکرد ، کوڕەکە لە کارو خۆ بادان و خۆ هێنان و بردنیان ڕامابوو هاواری کردنێ (ماندوو نەبن) بەڵام ئەوان وا لەکاری خۆیان ڕاچووبوون و هێندە سەرقاڵی ئیش بوون وەڵامیان نەدایەوە . کوڕی ئاشەوانی دوو بارە قووڵاندیەوە : (ماندوو نەبن !) ئەمجارەیان لە دوازدان یەکێکیان وەڵامی دایەوە : (ئەوە دەڵێی چی ! ماندوو بوونی چی ؟ ئەگەر تا ئێوارێ هەموو ئەو گیایەی نەدوورینەوە نێرە شوور هەمووومان دەکوژێ و لەجێی گیای دەمانخوات) کوڕەکە بانگی کردن : (هەمووتان وەرنە ئێرە لای من) هەموو هاتن کوڕەکە لێی پرسین نێریە شوور لەکام لاوە دێت ئەو هەرچی ویستی پێویستی بوو لێی پرسین داسەکانی لێ وەرگرتن . دەستی بە دروێنێ کرد هەموو گیایەکی دوریەوە و کردنیە سێ

کۆی گەورە . یەکێ لەسەر ڕێی نێری شووری و ئەوی دیکە لەناوەڕاستی و سێهەمیش لەلایەکی دی کردنە جۆخین . بۆ خۆشی چوو لەناو سێهەمیان خۆی نواند لەناوی ئەوێدا خۆی مات کرد . نێریە شوور دەگەڕا لەسەرەتاوە کۆی یەکەمی گیایەکەی هەر بەڕێوە قوتدا . دوایە کۆی دووهەمیش و سەرەنجام بەرەو جۆخینی سێهەم ملی لێنا . کوڕەکە لە پشت جۆخینێ گیایی هاتە دەرێ و تیرێکی هاوێشتە نێریە شووریێ و لەسەریەکی وەئالاند و خستی . هەموو تێکڕا نێریەکەیان کەوڵ کرد . کوڕەکە جەرگەکەی دەرهێناو بەرەو ماڵ چۆوە لەو دەمەی دا ژنەکەی لەگەڵ دێوەکەی خەریکی بەزم و ڕەزمی خۆیان بوون و هەر پێشیان وا نەبوو کە جارێکی دی بە زیندوویی دێتەوە لە پڕ گوێیان لە تەقێ دەرکێ بوو دێوە چوو خۆی شاردەوە ژنە دووبارە دەرکەکەی کردەوە و ئەویش هاتە ژووریێ و جەرگەکەی سەرو بەر کردو دایە ژنەکەی بۆ سبەینێ دوو بارە کوڕەکە چوو بۆ ڕاو شکاریێ و دێوە بە ژنەکەی گۆت : (ئەو جارەش خۆ نەخۆش کەوە ئەگەر لێشی پرسییەوە چتە بڵێ تەنیا ئاوی حەیاتە بتوانێ لە هانات بێ ئەویش بەدوای ئاوی حەیات دا دەڕوات و ئەو چوونەش چوونی هەیە و گەڕانەوە نا ئەو دەمی ئێمە بە دڵنیایەوە سەر پێکەوە دەنێین)

مێردە هەر کە گەییەوە ماڵێ دوو بارە دیتی ژنەکەی نەخۆشە و پرسی (چ بووە؟) ژنە هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی : (ئەگەر ئاوی حەیاتێم بۆ دێنی دەنا دەمرم) بە پێ پیادە وەڕێ کەوت لە ڕێیە گەییە ئەسپێکی ئەو ئەسپە ئەسپێکی ئەفسوناوی بوو بە کوڕەکەی گوت : (بێ من ناگەییە چ جێیان سواری پشتی من بە تا بتگەیەنم) کوڕەکە زۆر دڵخۆش بوو لەسەر پشتی ئەسپەکە ڕۆیشت هەر ڕۆیشت تا گەییە تاوێرە بەردێکی هەر بەدەم تێڕوانینەوە دیتی بەردەکە زاری لێك دەکردەوە و پێکی دادەدایەوە ئەسپەکە گوتی : (سێ ڕکێفم لێدە ڕکێفی وا کە سێ زیواڵە پێستم لێ ببنەوە) کاتێ بەردەکە دەمی لێك کردەوە کوڕە سێ ڕکێفی زۆر کاریگەری لە ئەسپەکەی دا ئەسپە کەوتە فڕین هەروا بە هەواوە خۆی هاویشتە نێو شەویلاکەی بەردەکەوە بەڵام کاتێ کە دەمی پێك دادایەوە کلکی ئەسپەی لێ گیر بوو لە بنڕا هەڵکەندرا

. ئەوان درێژەیان بە ڕۆیشتنی خۆیان دا گەیینە پەڵە ئاگرێکی بەرین کەوا پێ دەچوو نە بەپیادەو نە بەسواری لێی دەرنەچێ . ئەسپەکە گوتی : (سێ ڕکێفانم لەلای دیکەم دە ڕکێفلی وا کەسێ زیواڵە پێستم لێ ببنەوە) کوڕەکە سێ ڕکێفی خێواندە ئەسپەکە ئەسپ وەها کەوت و بەسەر ئاگری دا پەڕیەوە سەرەنجام گەیشتنە ئاوی حەیاتێ کوڕەکە زینی لە ئەسپەکەی کردەوە و لەغاوی لەسەر داماڵی و بەرهەڵدای کرد تا بلەوەڕێ و بحەسێتەوە . چووە سەر کانی دەم و چاوی خۆی شوشت و ئاوی خواردەوە مەلەی کرد جا هات لەسەر کانییەکە لێی ڕاکشاو لە خەوێکی قووڵ ڕاچوو . لەو نزیکانە خانویەکی چوار نهۆمی گەورە هەبوو ژنێکی جادو کەرو حەوت شاگردی پێکەوە لەوێ دەژیان . جادوکەر بۆنی کوڕەکەی وەبەر لووتی کەوت یەك لە شاگردەکانی نارد تا بزانێ چ باسە.

کچەی شاگردە هات و کوڕەکەی دیت کوڕەکە هەندە جوان و لێوەشاوە و خۆش ڕوو بوو کیژۆڵەکە نەیتوانی چاوی لێ بتروکێنێ، لەجێی خۆی وەك جادووی لێ کرابێ ووشك بوو. جادوو کەری دووەمی نارد سێ هەم و چوارەمیشی نارد بەلاّم ئەوەی دەچوو نەدەهاتەوە . هەرحەوت کچە شاگرد هەر کە کوڕەیان دەدەیت و دۆخینیان دەپساو گیرۆدە دەبوون و دڵبەندی ئەو لاوە دەبوون و لەجێی خۆیان دەچەقین . دوایە جادوو کەر بۆ خۆی چوو شاگردەکانی لێ دوور خستنەوە و ئینجا کوڕەکەی لەخەوێ وەئاگا هێنا (چونکە جادوو کەر بە هەموو شتێکی دەزانی) پێی گووت : (ژنەکەت بێ وەفایە ئەو دێوێکی خۆش دەوێ ئەوان خەریکی پیلانێکن بتکوژن کوڕە نەچیەوە) کوڕەکە باوەڕی بە قسەی جادوو کەر نەکرد گۆزەی لەئاوی حەیاتێ پڕ کرد سواری ئەسپەکەی بۆوە و ڕێگەی ماڵەوەی گرتە بەر. کە گەییەوە ماڵەوە لە دەرکەی دا دێوە خۆی شاردەوە و ژنەکە دەرگای کردەوە ژنە ئاوەکەی خواردەوە و وای خۆ پیشاندا کە چاك بۆتەوە . ڕۆژی دوایی لە ماڵێ هاتەوە دەرێ و ملی لە ڕاو و شکارێ نایەوە . دێوە بە ژنەکەی گوت : (ئێمە ئەومان ئاوا پێ لەناو ناچێ مەگەر پەی بە رازی بەهێز و توانای وی بەری تا باری لێ ببینینەوە دەنا هیچمان پێ لەگەڵ ناکرێ) کوڕەکە لە ڕاوێ هاتەوە ژنە

ئامێزی لێداو پرسی :(ئەرێ ڕازی ئەو هەموو هێز و توانایەی تۆ چییە ؟) کوڕەکە زۆر سادە دڵ و خۆش باوەڕ و ساویلکە بوو ژنەکەشی ئەوەی دەیزانی گوتی : (وەرە هەموو قامکەکانم بە پەتێکی توند توند تا بزانم دەتوانی بیانشکێنی یان نا ؟ ) ژنە هەموو قامکەکانی بە چەند لۆیان پێچاو توند توندی لێك گرێدان ئەویش بە تەکانێکی هەمووی لەبار یەك بردن و پساندی و دەست و پەنجەکانی خۆی کردنەوە . ژنە دوو بارە پرسییەوە : (سەرچاوەی هێز و توانای تۆ لەکوییە ؟)

مێردەکە وەڵامی دایەوە : (لەشانەکانم دایە) .

ژنەکە گوتی : (وەرە لەو مەنجەڵە گەورەیەدا دانیشە تا بزانم دەتوانی بە هێزی شانەکانم ئەم مەنجەڵەی بشکێنی و پارچە پارچەی کەی) .

کوڕەکە چوو بۆ ناو مەنجەڵێ ئەو مەنجەڵەی دێوان چێشتیان تێڕا لێدەنا دێوە شەلە لەو دەمەدا هاتە دەرێ و کەوتە یارمەتی ژنەکە تا مۆر و پێچەکانی سەرەکەی لەسەر توند کەن . دوایێ دێوە مەنجەڵەی بە پشتی خۆی داداو بردی لەسەر بەردێکی زل هەڵی دایە خەرەندێکی قووڵی بێ بنی ئەو تۆ بنی دیار نەبێ و بۆ خۆی هاتەوە ماڵێ . لە بنی خەرەندەکە ڕوو بارێك هاژەی دەهات ئەو ڕووبارە بە تەنیشت کانی ئاوی حەیاتێ و ماڵی جادوو کەرەکە دا ڕا دەبرد . جادوو کەر شاگردەکانی بانگ کرد و گوتی : (بچنە سەر ڕووباری شتێکی ڕەش بە ئاوێ دادێ بزانن چییە) شاگردەکان چوون مەنجەڵێکی گەورەیان هێنایەوە و لەبەر دەمی جادوو کەرەکەیان دانا سەری مەنجەڵیان هەڵدایەوە و دیتیان کوڕەکەی لەناو دایە هەناسەی نەدەدا هەموو لەشی تێك شکابوو. جادوو کەر هێنای هەموو لەشی پارچە پارچە کردو بە ئاوی حەیاتی شوشتیەوە. دوایی پارچەکانی لەشی هەموو هێنان بە تەنیشت یەکەوە هەر پارچەی لەجێگای خۆی دانایەوە و کوڕەکە زیندوو بۆوە و چاوەکانی هەڵێنان و هەستایە سەرپێ. جادوو کەر زۆر شاد و دڵخۆش بوو کوڕەکە لەباوەشی وەرێناو ماچی کرد.

کوڕەکە گوتی : (باوەڕم بە قسەکانی تۆ نەکرد بەڵام هەمووشیان ڕاست بوون ئێستاش دەڕۆم تۆڵەی خۆم دەکەمەوە دوایی دێمەوە و دەتخوازم) کوڕەکە

**هاتەوە ماڵێ هەر کە گەییەوە ژوورێ دێوەی دیت ئەوا لەگەڵ ژنەکەی وی بە خۆشی ئەوەی لە دەست ویان ڕزگار بووە ئەوە خەریکی ڕابواردن و کەیف و سەفای خۆیانن . چووە پێشێ و لینگێکی دێوەی گرت و ئەوی دیکەشی لەبن پێی خۆی ناو لێکی هەڵقلێشاند و کردیە دوو لەت ژنەکەی خۆشی کوشت دوایی گەڕایەوە جادوو کەرەکەی خواست ئاهەنگێکی زۆر گەورەیان ساز کرد من بۆ خۆم لەوێ بووم .**

**یەکجار زۆر نۆشابەیان خواردەوە و یەکێك لە شاگردەکانی جادوو کەریان لەمن مارە کرد .**

**(منیش کلاٚشم دڕا هیچم پێ نەبڕا) .**

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: نۆ برا دێو، ئاوی حەیاتێ، ئەسپی ئەفسوناوی، بەرد دەمی لێك دەکاتەوە، پارچە پارچەکردنی کوڕەکە و چاك کردنەوەی بە ئاوی حەیاتی.**

# سۆرەی چاوشین

**کۆکردنەوە: مەلیحە جەرجیس مەحەمەد**

**گێڕانەوە : قـــــــــادر مـەحمـود**

هەبوو نەبوو، کەس لەخودا گەورەتر نەبوو، لە دێری زەمانەوە دەگێڕنەوە دەرێن پیاوەك هەبوو عەرەب بوو کوڕەك و کچەکی هەبوو لەگەر خێزانەکەی دەژیان وە ژنەکە زگی هەبوو لەبەر لەوەڕی حەیوان جێی خۆیان گواستەوە بۆ جێیەکی دوور بەتەنێ ڕەشماریان هەڵدا بوو کە هەمو شتیان ڕێك خست و ژنەکە لەبن ڕەشمار بەجێ ماو بابەو کوڕەکە و کیژەکە چون لە ئاو بگەڕێن ، گەڕان هەتا بیرەکیان دیتەوە ئاوی تێدا بوو چونە پێش بیرەکە بۆ پڕ کردنەوەی کوندە و مەتتارەکانیان دیتیان پیاوەکی بریندار لەوێ کەتیەو دەنارێن لێی چونە پێش دیتیان پیاوەکی سۆرەی چاوشینە بە سەختی بریندار بوووە هێشتا نارەی دێ و نەمردیە .

بابەکە گۆتی: دەیبەینەوە زۆر زگی پێ سوتاو گۆتی: گوناحە کیژەکە گۆتی: نا بابە نەکەی ئەوە ناپەسندە چونکە سۆرەی چاوشینە! بەلأم، بابەکە گۆتی: نا هەر دەیبەمەوە، هەرچەندە کیژەکە ناڕازی بووو بەس بابەکە هەر هینایەوە .هێنایەوە تا ماوەیەك داو و دەرمانیان کردو پاش ماوەیەك تەواو چاك بۆوە و خۆی تەواو گرتەوە شەوەك سۆرەی چاو شین هەر دەستی پیاوەکە و کوڕەکەی سەر دەبڕی و کیژەکە بە دیل دەبا و مێگەلی مەڕ و ڕەوەی حوشتریش بەپێش خۆی دەدا و لێدەدا دەڕوا لۆ لای ڕۆژئاوا کەجێ و مەکانی خۆی بوو. ژنەکەش ناچار دەچێتەوە ئاوەدانی و منداڵی دەبی ئەویش کوڕە ناوی لێ دەنێ ئەحمەد . کە ئەحمەد گەورە دەبی ڕۆژەك لەگەر منداڵی یەك لە جیرانەکانیان بەشەڕ دێ و لە کوڕەکە دەدات و داکی کوڕەکە لێی بە جواب دێ و دەرێ کوڕە لۆ لە کوڕی من دەدەی لۆ ناچی تۆرەی باب و براو خوشکی خۆت بکەیەوە ؟ ئەحمەدیش سەری سوڕ دەمێنێ لەو قسەیە چونکە داکی هیچی لۆ باس نەکردبوو وای دەزانی کە تاقانەیە و بێ بابە چۆوە ماڵێ و دەرێتە داکی مەنجەڵەك ئاوم لۆ گەرم بکە خۆم دەشۆم دایکیشی ئاوی لۆ گەرم

دەكا هەتا بڵق بڵق دەكورێ . ئەحمەد دەچیتە كن ئاوەكە و دەرێتە داكی وەرە ئیشم پێت هەیە كە دایكی دێت دەستی داكی دەگری و دەرێ دایە بەڕاستی باسی باب و براو خوشكم و ئەو مەسەلەیەم لۆ نەكەی سەرت داوێمە ناو ئەو ئاوە كورایە دایكی یەكەمجار دەرێ مەسەلەی چی و كێ گۆتی: و خەڵك درۆ دەكەن، بەس فایدەی نەبوو ئەحمەد دیسان گۆتی: دەبێ ڕاستیم پێ بڕێی . داكی گۆتی: وەرە دانیشە لەیەكەم ڕۆژی هێنانەوەی سۆری چاوشین هەتا كوژرانی مێرد و كوڕی و ئەسیركردنی كیژەكەی لۆ ئەحمەد دەگێڕێتەوە ئەحمەدیش گۆتی: بە دوو خوشكم و بۆرەی باب و برام دا بچم .

ئەحمەد هەردەستی خۆی ئامادە دەكات و نان و ئاوی دوو سێ ڕۆژ حازر دەكات و چەكی ئەو سەردەمەش (شیر)لەگەر خۆی دەبا بەڵام لە داكی دەپرسی وەسفی خۆشكم لۆ بكەوە حوشتری ئێمە چ نیشانەیەكی لەسەرە چونكە هەر ماڵە و نیشانەی جودایی هەبوو لەسەر حوشتر لۆ بزرنەبوونی داكیشی گۆتی: حوشتری مە نیشانەكە بە ئەلقە لەسەر گوێی حوشترەكان داخ كراینەوە لۆ لای ڕۆژئاواش ڕۆیشتن . ئەحمەد ڕۆیی چەند شەو و چەند ڕۆژەك لۆ ڕۆژەی چوارەم دیتی ڕەوە حوشترەك لەدووڕا دیارە نزیك بۆوە و دیتی حوشترەكان نیشانەی ئەلقە لەسەر گوێیان هەیە لە شوانەكە نزیك بۆوە دیتی ژنەكی پێ خواسی پیس لەبەر حوشترە هەی لەو كاملە ژنە بە نیازی ئاو خواردن لێی نزیك بۆوە و داوای ئاوی لێ كرد ئەویش ئاوی دا پێ و كوڕەكە لێی پرسی لۆ ئەتو لەبەر حوشتری وا پیس و پێ خواسی ژنەكەش گۆتی : لێم گەڕێ و بڕۆ بەس كوڕەكە زۆر لێی وورد بۆوە و دیتی تەقریبەن لەگەڵ وەسفەكەی داكی پێی دەچو بەس پیرترە ، ئەحمەد هەر لێی نەگەڕا و هەستا حار و مەسەلەی خۆی لۆ گێڕاوە كە دایكی لۆی گێڕابۆوە و كە پاش ئەو مەسەلەیە ئەحمەد لە داك بووە . بەس خوشكەكەی فكری كردەوە كە ئەوهایان لێ قەوما داكی زگی هەبوو وەلحاسڵ لێك ئاشكرا بووون كە خوشك و برای یەكدینە ئەحمەد دەرێ ئەمن هاتیمە لۆ تۆرە كردنەوەی حەقی خۆمان خوشكەكەشی گۆتی: ئەو سەگبابە (سۆرەی چاوشین)ئەو شەو ژن دەینی و پێمی گۆتییە: ڕەوەی حوشتر زووتر ببەمەوە لە ڕۆژانی دی، بەڵام ئەمن درەنگ تر دەبەمەوە هەتا

تاریکی دا دێ و ئەتو لەناو ڕەوەی حوشتر خۆت بشارەوە چونکە سۆرەی چاوشین بەخۆی دێتە سەر بیر لۆ ئاودانیان ئێوارە داهات چوونەوە هەر لە دوورەوە سۆرەی چاوشین دەستی بە جوندان کرد گۆتی: ئەدی نەمگۆت زووتر وەرەوە کچەکەش خۆی بێ دەنگ کرد سۆرەی چاوشین دڵی زۆر خۆش بوو بەگۆرانی گۆتن ئاوی لەبیر هەڵدەکێشاو کابرا زاوا بوو دڵی خۆش بوو ئاگای لەهیچ نەبوو ئەحمەدیش هەر لێی نزیك دەبۆوە و هەتا گەیشتە کنی کابرا سەری شۆڕ کردبۆوە ناو بیر و ئاگای لە ئەحمەد نەبوو، و ئەحمەد هەتا شیر دەگری لە ملی داو سەری پەڕاندە ناو بیرەکەوە کەلەشی لەدەو بیرەکە کەت لەگەر خوشکەکەی حوشترەکانیان ئاو داو بەبێ ئەوەی کەس هەست بکات لە دوایی خوشکەکەی چوو لەماڵێ نانی هێناو لەوێ بە خوشکی ئەحمەدیان گۆت لێرە نان بخۆ ئەویش گۆتی: نا لەناو حوشترەکان دەبم لەوێ نان دەخۆم و دەنوم ، چوو لەگەر ئەحمەد نانی خوارد و دەوری پاش عیشا بوو بووك لەبن ڕەشمارەك بوو بەتەنێ لەدوری ڕەشمارەکانی دی ئەحمەد گۆتییە: خوشکەکەی دەچمە کن بووك لۆ ئەوەی تۆرەی شەرەفی تو بکەمەوە ئەحمەد چوە کن بووك لەبەر ئەوەی زۆر تاریك بوو بووکەکە نەی زانی ئەوە زاوا نییە ، هەتا درەنگ لەکنی بوو هەتا دوو سێ سەعا پێش بەیانی لەکن بووك هاتەوە چوە کن خوشکەکەی خەڵك هەموو نوستبوون و بێ دەنگ بوون لەگەر خوشکەکەی ڕەوەی حوشتر و مێگەلی مەڕیان بە پێشە خۆیان داو بەبێ دەنگی ڕۆیشتن سبەینە داهات خەڵکەکە هەستان لەخەو حوشترو مەڕیان دیار نەبوو وەکی ڕۆژان دیارە چوینە لەوەڕ تا وەختەکی درەنگ بووك و زاوا دەنگیان نەبوو خەڵکەکە دڵیان قر قرا گۆتیان: دەبی لۆ دەنگیان نەبی کە چونە بن ڕەشماری بووك دیتیان بووك بەتەنێیەو لێیان پرسی کا زاوا بووکەکەش لۆی گێڕانەوە کە لەنیوە شەوێوە زاوا نەهاتیتەوە لای . خەڵکەکەش گەڕان لەدووی زاوا کە چونە سەر بیر دەبینن کەلەشی لەدەو بیرەکە کەتیە بەبێ سەر بووە دەیان گۆت: دەبی کێ کوشتبی و ئەدی کێ چویتە کن بووك و چەند گەڕان بێ فایدە بوون کە گەڕان وسوڕان دیتیان ڕەوەی حوشتر و مەڕیش دیار نێیە نەمایە و وەلحاسڵ نەیاندیتەوە چونکە زۆر دور کەتبوونەوە ، ئەحمەد و

**خوشكەكەی گەیشتنەوە لای دایكیان پێك شاد شوكر بوونەوە ماوەیەكی پێ چو تەقریبەن لە ساڵە وەختەك زیاتر ئەحمەد ڕۆژەك گۆتییە: داكیو خوشكی ئەمن چویمە كن بووك و خۆ بووك چ گوناحی نەبوو وە دەبی ئەمن بچم ڕوی ئەو ژنە سپی بكەمەوە ، ئەحمەد ڕۆیشت چەند ڕۆژەك هەتا گەیشتە ناو قەومەكە خۆی فەقیر كردو گۆتی: ئەمن هاتیمە ئێرە فەقیرم ئەگەر بمكەنە قاو چی خۆتان وە پیاوەكی پیر هەبوو حەفت كوڕی هەبوو ئەو كردییە قاوەچی خۆی، بووكەكە كوڕەكی ببوو لەو كاتەیش لەوەڕ نەمابوو گۆتییان: هەوارمان بگۆزینەوە خۆیان حازر كردو سبەینێ لەگەر گەردی بەیانی بڕۆن ئەحمەدیش وەكی قاوەچی كەرەستەی قاوەی لەسەر پشتی ئەسپ قایم كرد و ڕۆین بووكەكەش لەسەر ئەسپ بوو كوڕەكەی تێپەڕی و كوڕەكەی لەپێشی هەڵگرت و لە پێشە خۆی داناو چوە پشت پیرەمێردەكە (عادەت وا بوو ئەگەر بچیتە پشت پیاوی ڕیش سپی و بە قەدر كەس قسەی لەگەر نەدەكرد) لەناو خەڵكەكە دەیان پرسی لۆ منداڵەكەی لە پێشە خۆی داناوە دەبی نهێنیەكی هەبی پیرەمێردەكە گۆتییە: كوڕەكانی بڕۆن زوو جێیەك ببیننەوە هەتا بار بیەخین و لەو مەسەلەیە تێ بگەین كوڕەكانی چون گەڕان و جێیان دیتەوە ڕەشماڵیان هەڵداو قاوە لێ نراو ئەوجا گۆتییان: ئەحمەد وەرە بزانین لۆ وەت كرد . ئەحمەدیش حیكایەتی خۆی لۆ گێڕانەوە هەر لە هەرگرتنەوەی سۆری چاوشین هەتا ئەو كاتی گۆتی:شی ئەمن هاتیمە ڕووی ژنە سپی بكەمەوە ئەگەر ئێوە ڕازی بن و ژنەكەش ڕازی بێ ئەوە لەخۆمی مارە دەكەم وە دەمەوێ ببێتە خێزانم ، ئەوانیش سەریان سوڕما لەو مەسەلەیە بەلاّم زانیان كە ئەحمەد حەقی خۆیەتی و سۆرەی چاوشین غەدری لێ كردینە ڕازی بوون بە داواكەی ئەحمەد و لە ژنەكەیان پرسی بە ئەحمەد ڕازی یان نا ژنەكەش ڕازی بوو لێیان مارەكرد و ژنە و كوڕەی برد و لێیان دا ڕۆیشتن گەیشتنە كن داك و خوشكی بە شادی و خۆشی ژیانیان بەسەر برد .**

***ئەم حەكایەتە باسی غەدرو تۆڵە كردنەوەو ئازایەتی دەكات.**

# گور و سنۆبەر

**کۆکردنەوە: مەلیحە جەرجیس**
**گێڕانەوەی: قادر ئەسعەد ئیسماعیل**

هەبوو نەبوو، پاشایەك هەبوو، دوو کوڕی هەبوو، یەك ناوی گور بوو ئەوی دی ناوی سنۆبەر بوو. پاشا ئەو دوو کوڕەی زۆر خۆش دەویست، ڕۆژێك لە ڕۆژان لە کۆشکی پاشایەتی دانیشتبوو تەماشای سەرەوەی کۆشکی خۆی کرد، دیتی حاجی لەق لەق هێلانەی کردیە و دوو فەرخەی هەڵێنایە، وای لێ هاتبوو هەموو ڕۆژێك پاشا تەماشای ئەو هێلانەی حاجی لەق لەقی دەکرد، پاش چەند ڕۆژەك حاجی لەق لەق مێیەکە (دایك) مرد، حاجی لەق لەق نێرەکە چوو حاجی لەق لەقێکی مێی هێنا لۆ ڕۆژی دوایی مێیەکە یەك لە فەرخەکانی بەرداوە و کوشتی ، ڕۆژی دواتر فەرخەکەی دی بەرداوە و کوشتی، پاش ئەوەی پاشا ئەو بەسەر هاتەی دی وەعدی دا کە ئەگەر ژنی مرد ژن نەهێنێتەوە، ماوەیەکی پێ چوو وا ڕێك کەت ژنەکەی (شاژن)مرد ، پاش تەعزیە و ماوەکی زۆری پێچوو ڕیش سپی و پیاو ماقولانی پاشا خڕ بوونەوە پێیان گۆت: پاشا دەبێ ژن بینی چونکە پاشای، بەرام پاشا پاساوی دیتنەوە گۆتی: ئەمن مندارەکانم زۆر خۆش دەوێ نامەوێ تووشی زڕ داکیان بکەم ، بەسەرهاتی حاجی لەق لەقی لۆیان گێڕاوە. بەڵام، ئەوانیش گۆتیان: دەبی هەر ژن بێنی دەست ڕۆیشتووی ، ئەوجا گۆتیان: ئەتوو دەورەمەندی و ماری بەتەنێی بۆ دانێ و مارەکی دی لۆ مندارەکانت دانێ و خزمەتکاریان لۆ بگرە، بۆ خزمەتکردنیان وە دوو مندارەکان لەکن مەلا دەیانخیند بەرام هەردوکیان یەك لەیەك جوانتر بوون. ڕۆژ ڕۆیی زەمەن ڕۆیی پاشا ژنی هێناو ژنەکە بە جوداو مندارەکان بە جودا ، بەس بەژنەکەی نەگوتبوو مندارم هەیە ، ڕۆژەك لە ڕۆژان پیرەژنەکی جادوکەر لۆ ئەوەی هەندەك پارە لە شاژن ئیستیفادە بکات چوە ماری پاشاو بە شاژنی گۆت: ئەدی کا کوڕەکانت؟ شاژنیش گۆتی: کوڕی

چ؟ پیرەژنیشی گۆتی: بەدی پاشا دوو کوڕی هەیەو یەکیان ناوی گورە و ئەوی دی ناوی سنۆبەرە لەکن مەلا دەخینن ماریان بە جودایە ، پیرەژن ڕۆیی پاشا هاتەوە ماریٚ شاژن خۆی عادز کرد، پاشا لێی پرسی لۆ عادزی؟ شاژنیش گۆتی: لۆ عادز نەبم پاشا گۆتی: چێیە دە پێم بریٚ ؟ شاژن گۆتی: دیارە ئەمن داك نیمە، لۆ لە منت شاردینەوە؟ پاشاش هەنجەتی دیتەوە گۆتی: کوڕەکان دەخینن و نەمویست نە ئەتوو مەشغولٚ بی نە ئەوانیش مەشغولٚ بن. بەرام شاژن گۆتی: با ڕۆژی جومعان بێنەوە سەرمان لێدەن پاشاش بەمە ڕازی دەبیٚ ، جومعەی یەکەم کوڕی گەورە (سنۆبەر)هاتەوە ماری بابی زڕ داکی تەماشای کرد هەندە جوان بوو تەماحی تیٚ کرد! زڕ داکی گۆتیە: سنۆبەر جومعەی دەبی بێی دەعوەتمانبی. وا ڕێك دەکەویٚ پاشا لەماریٚ نابی ئەو ڕۆژەی کە سنۆبەر دەعوەتە شاژن وەکی ژنەکی باش عەلا ئەساس نانی لۆ دادەنیٚ لەناو ماریٚ و پێی دەریٚ وەرە سنۆبەر نان بخۆ! ئەویش دەچی لۆ نان خواردن دەچیتە ژۆریٚ، زڕ داکی دەرگای لیٚ دەگری و داوای ئیشەکی نابەجێی لەگەلٚ بکات ئەگەرنا هاوار دەکەم ، ئەو (سنۆبەر)ڕازی نابی بەو ئیشە خراپە و ڕجای لیٚ دەکا کە ئەتوو داکی منی و ئەمنیش کوڕی توومە کو شتی وا دەبی؟! زڕ داکی دەریٚ نا من هیچ داکی تۆ نیمە و لەسەر ئیشە خراپەکەی خۆی موسڕ دەبی . سنۆبەر ویستی لە دەرکە دەربچی و بڕوا بەرام زڕ داکی لە پشت ڕا جلکی سنۆبەری گرت و دڕاندی. سنۆبەر جاحێر بوو بە قوەت بوو توانی زڕ داکی بەرداتەوە و زڕ داکی کە دیتی ئیشەکەی سەری نەگرت دەستی بە هات و هاوار کردو دەیگۆت: کوڕی پاشا پڕی دایمیٚ خەرکەکە خڕ بۆوە و پاشا هاتەوە ، ئەوجا پاشا ڕووی لە خەرکەکە کرد و گۆتی: نەمگۆت ژن نایْنم ، پاشا داوای کرد کە سنۆبەر بکوژن. بەرام چەند ئەختیارەکی ڕیش سپی پاشا بە پاشایان گۆت: پاشا ئەوها نابی کیٚ دەریٚ کوڕی تو وەی کردیە با لێی بپرسین و قسەی لەگەر بکەین. ئەوجا حوکم بدە ، گازی سنۆبەریان کرد کە تەماشایان کرد جلکی سنۆبەر لە پشت ڕا دڕایەو چوون تەماشای شاژنیان کرد هیچی لیٚ نەهاتییە ئەوجا ڕیش سپیەکان بە سنۆبەریان گۆت: ئەتوو هیچ زەمبت نیە وە بەپاشاشیان گۆت: کە هیچ زەمبی نیە سنۆبەر چونکە ئەگەر

شتەكی بكردبا ئەوا جلی لە پێشەوە دەدڕا نەك لە دواوە بەرام وا دیارە ژنەكە لە پشت ڕا ڕایكێشایە ، ئەوجا پاشا قەرار دەدا سنۆبەر بچێتەوە جێی خۆی نەیەتەوە كۆشكی بابی ، ئەوجا سنۆبەر قەرار دەدات كە مەملەكەت بەجیٚ بێڵیٚ داوای لە پیاوەكانی خۆی كرد وراخی بۆ ئامادە بكەن لەگەر پارەو پوول و جلكی خۆی ئەوجا هەگبەی پڕ لە خواردن دەكاو سواری وراخ دەبی و لیٚ دەدا دەڕوا. با بێینەوە سەر باسی گور ، پاش عەسر گور دێتەوە ماری خۆیان (هی كوڕەكان)تەماشا دەكا مارەكە شڵەژایە وەكی خۆی نەمایە ئەویش بە خزمەتكارەكان دەریٚ ئەوە چ بووە ؟ ئەوانیش دەرێن: هیچ نەبوو. گور گۆتی: كو هیچ نەبووە كا سنۆبەر؟ ئەوانیش تەماشای یەكیان كرد گۆتیان: نازانین!! ئەویش یەكێكیانی گرت و گۆتی: پێم دەرێی پێم بریٚ ئەگەرنا دەتكوژم. ئەویش لە ترسی خۆی گۆتی: بەرمدە پێت دەرێم ، خزمەتكارەكە گۆتی: چت لیٚ بشارمەوە حار و مەسەلەی سنۆبەری لۆ گێڕایەوە كە ڕۆییە گور گۆتی: لۆچ لایەك ڕۆییە ؟ گۆتی:ان لۆ لای ڕۆژئاوا ڕۆییە. گور گۆتی: ئەسپەكم لۆ بینن خزمەتكارەكانی ئەسپەكەیان لۆ هێناو هەگبەی پڕ پارە كرد و چووە دووی سنۆبەر ، دور و نزیك شەوەك و ڕۆژەك لە دوی ڕۆیی پشت مەغریبەك گەیشتە سنۆبەر ، سنۆبەریش كە چاوی بە گور كەت هاتە خواریٚ و دەستیان لە ملی یەك كرد و بڕەك گریان ، سنۆبەر گۆتیە: گور ئەمن ئەوهام بەسەر هات و ئەتو لۆ هاتی گوریش گۆتی: ئەمە براینە و خۆشی تۆ خۆشی منە و ناخۆشی تو ناخۆشی منە هەتا مردن پێكەوە دەبین ، ئەوجا بڕەك ڕۆیشتن گەیشتنە سەر ئاوەك گۆتیان: با ئەو شەوە لەسەر ئەو ئاوە بمێنینەوە وە لەكن ئاوەكەش سیٚ بنە داری لیٚ بوو . وراخیان بەرەلا كرد لۆ ئەوەی بلەوەڕیٚ بەخۆشیان ماندو بون چونە بن دارەكان، سنۆبەر بە گوری گۆت: ئەتو ماندی لۆخۆت بحەسێوە و بنوە، گوریش گۆتی: نا ئەتو ماندی و دڵت توندە بنو ئەمن دادەنیشم ، ئەوجا سنۆبەر نوست گوریش دانیشت لەكاتەك تەیرەك هاتە سەر دارەك گۆتی: دەزانم ئەنگۆ گور و سنۆبەرن ئێستا تەیرەكی دیٚ لەپاشە من ئەو ڕەنگەیە ئەو شكلەیەو بە حەفت ئاواز دەخینی ئەگەر بیگرن و بیكوژنەوە ئەوەی سەرك و سنگی بخوا ئەوا دەبیتە پاشا ئەوەی ئەوەكانی دی بخوا هەموو شەویٚ كیسە

پارەك دێتە بن سەری ، گوریش گێی لێ بوو، پاش ئەوەی تەیرەکە ڕۆیی تێر و کەوانی حازر کرد کە هەندەی پێ نەچوو تەیرەکە هات کە تەیرەکەی دی کوی باس کردبوو ئەوها بوو کە بەحەفت ئاواز دەیخیند گوریش لێی داو بەری داوە سەری بڕی و ڕووتاندیەوە و خاوێنی کرد و هەندەك داری خڕکردەوە و سۆری کردەوە گۆتی: با سنۆبەری براگەورەم ببتە پاشا سەرك و سنگی بۆ هێشتەوە لەناو پاروە نانەك لەبن سەری سنۆبەری دانا ئەویش ئەوەکانی تری خوارد. ئەو درەنگ داهات مانگە شەو بو ئەسپەکان دوور کەتبوونەوە گۆتی: با بچم ئەسپەکان بینمەوە سنۆبەریش هەروا نوستیە، بەس ئەسپەکان زۆر دور کەتبونەوە کە گەیشتە کن ئەسپەکان دێوەکی سپی پەیدا بو گوری هاویشتە سەرشانی و بردی .

با بێینەوە سەر (سنۆبەر)سنۆبەر کە هەستا لەخەو تەماشای کرد گور لەوێ نەبوو ئەسپەکانیش دیار نینە لە درە خۆی گۆتی: گور چویتە دووی ئەسپەکان بەرام زۆری برسی بوو گەڕا لە خواردن دیتی شتەك لەبن سەری دانرابوو کە لێکی کردنەوە دیتی سەرك و سنگەکە لەناو نان دانرایە گۆتی: دیارە ئەوە لۆ منی دانایەو خواردی و بەینەکی پێ چوو هەستاو گۆتی: با گازی گور بکەمەوە و ئەسپەکان بینمەوە بڕۆین ، کە چوو تەماشای کردو چووە کن ئەسپەکان ئەولا گور و ئەم لا گور گور نەبوو دڵی چەند بە خەم بو هەندەکی دی بەخەم تر بو ، چونکە گوری لێ بزر بو بە درێکی ناخۆش ئەسپەکانی هێناوە شتەکانی هەرگرتبو هەردوو ئەسپی بردو بەڕێکەت ڕۆیی ماوەیەکی دور وەنزیك شارەك بو چوە ناو شارەکە چوە مارەکی پیرەژنەکی لێ بو سەلامی لێ کرد ئەویش سەلامی وەرگرتەوە سنۆبەر گۆتی: داپیرە ئەو شەوە جێم بکەوە لێرە بم چونکە جێگام نیە! ئەویش گۆتی: هەرچەندە جێم نیە بەرام لێرە بە، سنۆبەریش هەندەك پارەی دایە پیرەژنەکە گۆتی: کراسەکم لۆ بینەوە ئەوە کەی تر لۆ خۆت سەرف بکە، پیرەژنەکە کە چاوی بەو هەموو پارەیە کەوت لەخۆشیان بەغاردان چو کراسەکی لۆ کڕی و هاتەوە خواردنەکی باشی لۆ حازر کرد و خواردیان ، ئەوجا پاش نان خواردن سنۆبەر لە پیرەژنەکەی پرسی دەنگوباسی ئەم شارە چییە و کێ پاشای ئەو شارەیە

پیرێژنەکەش گۆتی: پاشای ئەو شارە مردیە و عادەتی ئەو شارەش ئەوهایە کە باز هەڵدەدەن لەسەر کێ نیشت ئەو دەبیتە پاشا سبەینێ باز هەڵدەدەن دەچێتە ماری پیرێژن لەسەر سەری سنۆبەر نیشت خەڵکەکەش لە دووی بازەکە دەڕۆن دیتیان بازەکە لەماری پیرێژنەکە لەسەر سەری کابرایەك نیشتووە خەرکەکە گۆتیان: ئەوە نابی ئەو بازە غەرەتی کردیە و ئەو کابرایە دوور خەنەوە لەشار. لەپاش ئەوەی کە سنۆبەر دور دەخرێتەوە لەشار دیسان باز هەڵدەدەن دوو بارە باز ڕۆیی لە دەرەوەی شار لەسەر سەری سنۆبەر نیشت ئەوانیش گۆتیان: ئەوە غەریبە لەو شارە کو ببیتە پاشا، ئەوجارە لەناو سندوقەکیان دانا لەناو غورفەك دیسان بازیان هەڵدا لۆ جاری سێیەم باز لە کونی غورفەکە چوە غورفەکەو لەسەر سندوقەکە نیشت و خەرکەکە دیتیان باز لەسەری نیشتییە دەریان هێنا کردیانە پاشا ، سنۆبەر بوە پاشای ئەو شارە با بێینەوە سەر باسی گور دێوەکە گوری بردە ئەشکەفتەك گور تەماشای کرد سێ کیژی لێیە و کە زۆر جوانن. پاش ئەوەی کە دێوەکە ڕۆیی و دەرکەی لەسەر قەپات کردن گور بە کیژەکانی گۆت: ئەنگۆ لۆ لێرەنە؟ ئەوانیش حەق و حیسابی خۆیان لۆ گێڕایەوە ، کە دێوی سپی ئەوانی هینایە بەرام هەر سێ کچەکە عاشقی گور بون ، چونکە گور کوڕێکی ناسك و تازە هەڵدەهات و زۆر جوان بو ئەوجا گور داوای لێ کردن ئەنگۆ خوشکی من و ئەمنیش برای ئێوەم لۆ ئەوەی هەوڵ بدەین قوتارمان بی لەدەست ئەو دێوە گور دەڵێ: خۆتان حازر بکەن و داوا لە دێوی سپی بکەن کە ڕوحت لەکێیە ئەوجا دێو هاتەوە، کیژەکانیش خۆیان حازر کردبو دێویش پێی گۆتن: ئەوە لۆ حازرن؟ کیژەکانیش جوابیان دایەوە ئێمە هەر لەگەڵ تویبنە لۆ پێمان نارێی ڕوحت لەکێیە ئەوجا دێویش جوابی دانەوە گۆتی: ڕوحی من لەناو ئەو بیرەی ناو ئەشکەفتەیە کە چل گەز قۆرەو لەناو بیرەکە گۆلکەکی تێدایەو لەناو زگی گۆلکەکە مریشکەکی تێدایە لەناو زگی مریشکەکە هێلکەکە هەیە ڕۆحی من هێلکەکەیە ، پاشان دێوەکە ڕۆیی ئەوانیش حار و مەسەلەیان لۆ گور گێڕاوە ، گوریش گۆتی: دەباشە ، با دەست بە خڕ کردنەوەی خوری و موو بکەین وای لێ هات ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زۆریان خڕ کردەوە و دەستیان کرد بە ڕێستنی ئەو

خوریه ، بەرام کە دێوەکە دەهاتەوە خوری و موەکەیان دەشاردەوە هەتا نەی بینی ، زۆریان ڕێست هەتا بوە گوریسەکی چل مەتری زیاتر ، ئەوجا ڕۆژەك دێوەکە ڕۆیی لە ئەشکەفت نەما ، ئەوجا گور داوای لە کیژەکان کرد شۆڕم کەنەوە ناو بیرەکە ، کیژەکانیش شۆڕیان کردەوە وە گور چەقۆیەکی لەگەڵ خۆی برد ، شۆڕیان کردەوە هەتا گەیشتە بنی بیرو دیتی ڕاستە گۆلکەکە لەوێیەو گور هەستا گۆلکەکەی کوشتەوە و زگی دڕاند و مریشکەکەی دەرهێنا وە مریشکەکەشی کوشتەوە و هێلکەکەی دەرهێنا ، بەرام لەو وەختی دێوەکە قەلبی تێك چو بەرەو ئەشکەفت گەڕاوە ، گوریش هاواری کرد گۆتی: هەڵم کێشن ئەوانیش هەڵیان کێشاو هاتە دەرێ لە بیرەکە ، گور بەرەو دەرکەی ئەشکەفت ڕۆیی و دێویش لە دەرێ ڕاهاتەوە گەیشتە دەرکەی ئەشکەفت و دەرکەکەی هەندەك کردەوە و هاواری کرد: ڕەجاتان لێ دەکەم هێلکەکە بە عاردی دانەدەن بەرتان دەدەم ، بەرام گور بەگوێی نەکرد و هێلکەکەی بە دیواری ئەشکەفتەکە داداو شکاندی و دێو لەجێی خۆی بۆڕاندی مرد و تۆپی ئەوجا گور و کیژەکان هاتنە دەرێ و گۆتییان چ بکەین چ نەکەین؟ یەك لە کیژەکان کیژی پاشای ڕۆژئاوا بوو ، یەکی تریان کچی پاشای ناوەند و ئەوەی تر (سێیەم)کچی پاشای ڕۆژهەلات بوو ، هەتا ماوەك پێکەوە ڕۆیشتن کیژی پاشای ڕۆژئاوا گۆتی: دەبی بچمە ماری بابم و پێیان برێم کە ئەمن بەربومە. بەلام دێمەوە چونکە ئەمن هەر هی تۆمە ، بەرام گور گۆتی: ئەتو لە خوشکی من زیاتری ، ئەویش گۆتی: دەنا ئەمن ئەو ئەنگوستیلە سحراویەت دەدەمێ هەر کاتەك ئەمنت ویست بیسوڕێنە لەکنت حازر دەبم. ئەو ڕۆیی ماوەکی دی ڕۆیشتن و گەیشتنە ڕاست شاری پاشای ناوەندی و کچی پاشای ناوەندی گۆتی: ئەمن دەبی لۆ تو بم. بەرام دیسان گور گۆتی: ئەتو لە خوشکم زیاتری وە بڕۆ کیژەکەش گۆتی: باشە بەرام ها ئەو قۆریە سحراویە بگرە هەر دەمەکی ئەمنت ویست سەری بکەوە ئەمن لەکنت حازر دەبم ، گوریش گۆتی: باشە و ئەو کیژەش ڕۆیی ماوەکی دی ڕۆیشتن ئەوجارە کیژی سێیەم گۆتی: ئەمن لەکنت دەمێنمەوە ، بەرام گور ڕازی نەبوو و گۆتی: ئەمن لەو شارە نزیکە لا دەدەم و ئەتوش بڕۆ بەرام کیژەکە گۆتی: دەنا ئەو داوە پرچە بۆ خۆت بی هەر

کاتەك بیسوتێنی ئەمن لە کنت حازر دەبم . ئەوجا گور لە شارەکە لای داو کیژەکەش ڕۆیشت گور چوە ناو شار چوە کن نەجاڕەك دانیشت ماوەك لە کنی دانیشت و کابرای نەجاڕ لێی پرسی ئەتو دەرێی کەس ناناسی لەو شارە و غەریبەی ؟ گوریش گۆتی: بەریٚ ئەمن غەریبەم. کابرای نەجاڕ گۆتی: باشە ئێواریٚ وەرە کنە مەو شەویٚ لە کنەمە بە. گوریش گۆتی: باشە ، ئێواریٚ داهات گور لەگەر نەجارەکە چونەماڵەوە وە کابرای نەجاڕ تەنها بە خۆو بە ژنەوە بو منداڵیان نەبو وەنانیان خوارد و شەو دانیشتن دوایی لە غورفەك جێیان لۆ ڕاخست و گۆتیان: برۆ پاردەوە و بنوە ، سبەینە بۆوە گور هەستاو نانیان خواردو لەگەر نەجاڕەکە چونە دەریٚ وە ژنی نەجاڕەکە چو جێی گور هەرگری تەماشای کرد کیسەك پارە لەبن سەری گورە ئەویش گۆتی: ئێواریٚ وەکی هاتەوە دەیدەمەوە گوریش وەکو شاگردەك لەکن نەجاڕ ئیشی دەکرد ، ئێوارە داهات و چونەوە وە دیسان نانیان خوارد و دانیشتن و نوستن ، ئەوجا لۆ سبەینیٚ پێش ئەوەی بڕۆن ژنەکە چوو جێی گوری هەڵگرت دیسان دیتی کیسە پارەك لەبن سەری تی ژنەکە چو کیسەکەی دوێنیٚ و ئەو ڕۆی هێنا گۆتی: کوڕوم ئەوە دوو ڕۆژە کە ئەتۆ لەگەڵ نەجاڕی مێردم دەچی لۆ ئیش پارەت لەبیر دەکەی. بەرام گور گۆتی: خودای گەورە ئەوەی پیٚ بەخشیوم کە هەمو شەویٚ کیسە پارەك دێتە بن سەرم با لۆ خۆت بیٚ و هەڵگرە ، ئەوانیش لە خۆشیان هەندەی دی کردیانە کوڕی خۆیان کە کوڕێکی یەکجار جوان و ڕێك بوو ، بەرام پێیان گۆت: ئەتو حەزت لە چییە ئەتو بە کوڕە فەقیر ناچی بە کوڕە پاشا دەچی ؟ گوریش گۆتی: حەزم لەڕاوە نەجاڕەکەش هەستا ماین و تاژی لۆ کری بەرام کابرای نەجاڕ گۆتی: کوڕم گور با نسیحەتت بکەم عادەتی ئەو شارە ئەوەیە دەبیٚ پێش ڕۆژئاوا لەناو شار بی و دەرکەی شورەی دەورەی شار دادەخەن، چونکە عەزیایەك بەشارەکە فێر بووە ڕۆژی یەکەم چوە ڕاوی مامزەك و کەروێشکەکی هێناوە ، ڕۆژی دووەم چوو درەنگی بەسەرهات و هاتە بەردەرگای شورە چەندی هەوڵی داو هاواری کرد دەرکەی لیٚ بکەنەوە بەلاٚم بیٚ ئیستیفادە بوو. کاولە ئاشەك لەو ناوە هەبو ئەویش چوە ناوی و وراخەکەی بەستاو تاژیەکەی نان داو بەخۆشی هەندەك گۆشتی مامزی لیٚ

کردەوە هەتا سوّر بکاتەوە لوّ ئەوەی بیخوا ، بەرام شیرەکی زوّر تیژی پیّ بو ئاگری هەڵکرد هەتا گوّشت سوّر کاتەوە دیتی لەناکاو وا دوو ڕوناکی بەرامبەری دیّ وەکی لایتە یەکسەر هەستی کرد کە ئەوە عەزیایەکەیە عەزیایەکە نزیك کەوتەوە و ئەویش دریّژ بو شیرەکەی لەپیّشە خوّی ئەو سەرو ئەو سەری حەربەکە بەدەستەك گرت و لەپیّشەخوّی ڕای گرت و عەزیایەکەی هەرلوشی و لە توندی خوّی شیرەکە عەزیای لەناوەڕاستەوە کردە دوو پارچەو وە نوّبەد دارەکانیش ئاگادارن گوّتیان: ئەوە ئەو ڕاوچییە عەزیایەکەی کوشت. با شتەکی وا بکەین ئەو کابرایە خەلاّت وەرنەگری لەکن پاشاو با ئیّمە وەربگرین کە نوّبەد دارەکان ژمارەیان چل کەس بوو. هەستان چونە کن گور گوّتیان: ها کوشتت ئیشەکی زوّر باشت کردیە لەو کاتە گور نانی دەخوارد لە ڕیّگادا نوّبەد دارەکان تەکبیریان کردبو کە برا گەورەکەیان بریّ (ئحم)ئەوانی دی یەك و خەنجەری لیّ بدەن یەکسەر برا گەورەکەیان گوّتی: (ئحم)ئەوانیش یەك و خەنجەریان لیّ داو لەناو فەردەکیان ناو بردیان لەسەر ڕیّی حەمام چیان دانا، وە حەمام چی سبەینیّ دەچو لوّ حەمام گەرم کردن دیتی گوشەك لەسەر ڕیّی تی وەی زانی شتەکی تیّدایەو بردیەوە ماریّ و گوّتیە: ژنەکەی دەچم حەمام گەرم دەکەم دەستی لیّ نەدەی ئیّستا دیّمەوە ، حەمام چی ڕوّیی ماوەکی پیّ چو ژنەکە چو گوّتی: با بزانم ئەوە چی تیّدایە؟ لیّی نزیك بوّوە زانی نارە نارەکی تیّدایە تەماشای کردو سەری گوشەکەی کردەوە دیتی کوڕەکی زوّر جوان و وا لەبن خیّن هەراتیە بەخیّرا چوە کن حەمام چی و بە دزی گازی کرد وەرە ئەو گوشە کوڕە جاحیّرەکە لەبن خیّن هەراتیە وە حەمام چی هاتەوە و دیتی لەناو گوشەکەیە و دەری هیّناو گوّتیە: ژنەکەی حەمامی ماریّی لوّ گەرم بکە دەیشوّم، و بوّ خوّی چوو حەمامی بازاڕی داخست و لەبازاڕ دەرمان و شتی تەواوی هیّناو هاتەوە و گوری زوّر جوان شوشت و تەواوی کرد و خزمەتی کرد هەتا چاك بوّوە ، ئەوجا حەمام چی کردیە کوڕی خوّی لەخوّشی کیسە پارەکەش ڕوّژەك لەڕیّی حەمام یەك لەچل نوّبەد دارەکان دیتی و ناسیەوە چو ئەوەکانی دیکەشی تیّگەیاندو گوّتی: ئەو کوڕە مایە ، بەلاّم چل نوّبەد دارەکان زوّر خوّیان هەڵدەکیّشاو چونە کن پاشا خەلاّتیان

وەرگرت عەلا ئەساس ئەوان عەزیایان کوشتیە ، بەرام ئەو چل نۆبەد دارە هەتا گوریان لەیەقە بیتەوە گۆتیانە: پاشا حەمام چی کوڕەکی هەیە لە حەمام تەماشای ژن دەکات ، گوریان گرت و لە سجنیان کرد ئەو شارە عادەتی وا بو سارێ جارەك پاپۆڕ دەهات و بەخینی بەشەر ئیشی دەکرد ، پاپۆڕەکە هات نۆبەد دارەکان گۆتیان: با ئەو سجنە خینی بداتە پاپۆڕەکە ، وە گوریان بردە کن پاپۆڕ چی گور داوای لێ کردن گۆتی: دەکرێ بەبێ ئەوەی سەرم ببڕن پاپۆڕەکە بە ئیش بێخم ئەوانیش گۆتیان: بەرێ لۆ ناتانین گوریش ئەنگوستیلەی دەستی سوڕاند و یەك لە کیژە سحراویەکان حازر بو کە پێشتر لەگەڵ یەکتر بون لە ئەشکەفتەکە گۆتی: گور چت دەوێ؟ گوریش گۆتی: دەمەوێ ئەو پاپۆڕە بەبێ خین ئیش بکا . گۆتی: باشە هەستا دەستی لەناو وەرداو بە ئیشی خست و گۆتی: جارەکی دی خینی ناوێ . پاپۆڕ چی داوای لەگور کرد ببتە کوڕی گوریش ڕازی بو لەگەڵی ڕۆیی و سەفەری کرد . ماوەیەك پێ چو هاتەوە کیژی پاشا پێش سنۆبەر قەرارەکی دەرکردبوو گۆتبوی ئەوەی خانیەکم لۆ دروست دەکا بە پلەکی زێڕ و یەکی زیو هەبی و لەسەر پێچکەش بڕوا مێردی پێ دەکا ، وە ئەگەر کەسێ وەعدی بداتێ و نەتوانێ ئەوە لەسەری دەدات .

گور گۆتی: ئەمن دەکەم و چوە لای کیژی پاشاو وەعدیان لەگەڵ یەکتر کرد کەگور لۆی بکاو ئەویش مێردی پێ دەکا ، بەرام ئەگەر نەیتوانی ئەوە لەسەری گور دەدات ، گور گۆتی: باشە هاتە دەرێ قۆریەکەی کردەوە و کچەکەی پاشای ناوەندی حازر بوو وەکو گور داوای لێ کرد خانیەکی ئەوهالەم لۆ دروست بکە ، کیژەکەش گۆتی: باشە ئەمن خانیەکی ئەوهالەم هەیەو سێ پلپلەی زێڕیشی پێوەیە لەکێ دەرێی لۆت خانیەکە لەوێ دادەنێم وە لە چ وەختی بی ئەتو برێی ئەمن لۆت دادەنێم . گوریش گۆتی: ئەو وەختەی کە خەرك هەموی دەنوی بینە دایبنێ کە خەرك لەخەو هەردەستن دەبینن کیژی پاشاکەش ئەمە دەبینی ئەوجا کچەکە مێردی بە گور کرد ، بەرام پاپۆڕ چی دەرێ ئەو کوڕە بەناوی منەو لۆ ئەوها دەکا لۆ نەیفەوتێنم و بەخۆم بچمە کن بوك ، بەس گور هەستی بەوە دەکرد بۆیە بەخۆی چوە جێگای خزمەتکارەك

**نوست و خزمەت کاری نارده کن بوك و به بوکی گوت: ئەگەر له دەرگایان دا مەکەوه و توند دایبخه ، بەرام پاپۆڕ چییەکه لەگەڵ چەند کەسەك چوه ژۆریٚ و کارەکەرەکەیان گرت و فرێیان دا ناو ئاوەوه وایان زانی گوره ، چونکه جلی گوری لەبەر کردبوو ، وه بوکیش دەرگای داخست هەتا سبەینیٚ . سبەینیٚ گور هەستا چوه کن پاشا شکات بکا که چوه کن پاشا که تەماشای پاشای کرد دیتی سنۆبەری برایتی ، بەلاّم سنۆبەر ئەوی نەناسیەوه و داوای له پاشا (سنۆبەر)کرد گۆتی: شکایەتەکم هەیه بەرام شکاتەکەم زۆر دور و درێژەو شەرت و شروتم هەیەو بەسەر هاتەکی زۆر گەورەشی تێدایه ، پاشاش گۆتی: فەرمو بریٚ گوریش گۆتی: ئەم شەو دەمەویٚ هەر چل نۆبەد دارەکانت لەدەرکەی شار حازر بن لەگەڵ نەجاڕ و حەمام چی و لەگەڵ پاپۆڕ چی ، ئەوجا ئەمن قسەت لۆ دەکەم ئەتوش حوکمی خۆت بده ، ئەوجا پاشا ئەمری کرد ئەوانه هەموویان حازر بن لۆ ئێواریٚ که هەموویان حازر بون گوریش بەخۆی ئاخیر کەس چوه ژۆریٚ له دەرکه گۆتی: پاشا ئەوەی تەنگاوه و ئەوەی ئیشی به دەریٚ هەیه با بچن دوایی دەرکه کلیل دەدەم و نایەلّم کەس بچیته دەریٚ . ئەوەی ئیشی له دەریٚ هەبو کردیان و گەڕانەوه بەس هەر چل نۆبەد دارەکان گوریان ناسیەوه بەرام نەیان توانی چ بکەن چونکه لەپێش پاشا بوو . دەرکەی کلیل داو کلیلەکەی لەناو گیرفانی خۆی ناو چو لەتەنیشت پاشا دانیشت ئەوجا گۆتیه پاشا وا بەسەرهاتی خۆمت لۆ دەگێڕمەوه ئەویش هەر له ڕۆیشتنی سنۆبەر هەتا ئەو وەختەی که دانیشتبون باسی کردو هەتا حەکایەتەکەی تەواو کرد خەرکەکه هەموویان دەستیان کرد به گریان . سنۆبەر دوو سیٚ جار لەخۆ چوو . ئەخیری سنۆبەر بەخۆی هاتەوه و گور به سنۆبەری گۆت ئەتو نامناسی ئەمن گوری براتم و دەستیان له ملی یەکتر کرد یەکتریان ماچ کردو پێك شاد بوونەوه و حەمام چی و نەجاڕیان خەلاّت کرد و پاپۆڕ چی و نۆبەد دارەکانیان ئیعدام کرد . ئەمنیش کراشم دڕاو هیچم پیٚ نەبڕا .**

**ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: تەیری حەوت ئاواز و ئەوەی سەر و سینگی بخوات دەبێته پاشاو ئەوەی ئەوی، ئەوی تر بخوات هەموو شەویٚ کیسەك**

**لیرەی لەسەر جێگادا دەبێ و دێوی سپی ڕوی دێو لەناو بیر و بیر لەناو ئەشکەوت و لەناو بیرەکە گوڵێك و لەناو زگی گوڵك مریشکێك و لەناو سکی مریشك هێڵکەیەك و ئەو هێڵکەیە ڕوحی دێوەکەیە، ئەنگوستیلەی سحراوی و قۆریەی سحراوی و داوە پرچی سیحراوی و عەزیا و پاپۆڕی بە خوێن کارکردوو خانووی یەك لە زێڕ و یەك لە زیوو لەسەر پێچکان دەڕوات .**

# زنجیرە کتێبی ئینستوتی کەلەپوری کوردستان

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | ساڵی |
|---|---|---|---|
| 1. | بەرکوتێکی مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی | سەدرەدین نورەدین ئەبوبەکر | 2005 |
| 2. | دەروازەیەك بۆ بۆتەکانی موزیك | غەمگین فەرەج | 2005 |
| 3. | وەرز و ساڵنامەی میللی لەپەند و شیعری کوریدا | پ . د شوکریە رەسول | 2005 |
| 4. | لەبارەی کۆکوردنەوەی موزیکی میللیدا<br>بە زمانی(کوردی عەرەبی) | مود کار بلیس و ئەرنولد باکیە.<br>و/ تاریق سالح | 2005 |
| 5. | چلاواز 1 | وریا ئحمەد | 2006 |
| 6. | پەندی کوردی: چیرۆکەکەی | عومەر شێخەڵلاّ دەشتەکی | 2006 |
| 7. | هێلکەی نامیٚ<br>کۆمەڵێك ئەفسانە و حیکایەتی جۆرا و جۆری<br>فۆلکلۆریی نێو کوردەوارییە<br>بەرگی یەکەم/ بەشی یەکەم | مەولود ئیبراهیم حەسەن | 2006 |
| 8. | هێلکەی نامیٚ<br>کۆمەڵێك ئەفسانە و حیکایەتی جۆرا و جۆری<br>فۆلکلۆریی نێو کوردەوارییە<br>بەرگی یەکەم/ بەشی دووەم | مەولود ئیبراهیم حەسەن | 2006 |